نـــــاوی کتـێب:  کورتەی ژیانی پێغەمـبەر
ناوی نووســـــەر:  نهـاد جلال حبیب الله
دیزاینی بـــەرگ:  نـــاوەندی ڕێنـوێـن
دیزاینی تێکست:   زەردەشـــت کـاوانــی
نۆبەتـی چـــاپ:  یـــەکـــــــەم ٢٠١٩
چـــــــــاپ:  نـــاوەندی ڕێنـوێـن
تـیـــــــــراژ:  ١٠٠٠ دانـــــــــە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٨٩٨ ) ی ساڵی ٢٠١٨ پێدراوە





07501269689  07701932749


renwen2009@yahoo.com
hakem1423@yahoo.com


سلێمانـی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانـی ژمارە  (٦٦)



## پێشەکی



سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە، صەلات و سەلامی خوا لە پێغەمبەر و ئەهلوبەیتی و ڕەزامەندی خواش دابارێتە سەر هاوەڵانی پێغەمبەر و شوێنکەوتوانی.

ئەم نووسینەی بەردەستتان بەشێکە لە پڕۆژەیەکی تایبەت بە مێژووی ئیسلامی لەژێر ناونیشانی (کورتەی مێژووی ئیسلامی ) کە تیایدا بە شێوەیەکی کورت و پوخت و شێوە مەنهەجیی، چەند سەرەداوێ لەسەر مێژووی ئیسلامی دەخاتەڕوو، هەر لە سەردەمی پێغەمبەری خواوە (صلی الله علیه وسلم) هەتا کۆتاییەکانی سەدەی چواردەی کۆچی، بەو ئامانجەی وەك مەنهەجێك بۆ ناوەند و پەیمانگە و حوجرەکان و توێژی بانگخوازانی گەنج ئامادە بکرێت بەو هیوایەی رۆشنبیریەکی سەرەتاییان لەلا بێت سەبارەت بە مێژووی ئیسلامی و ئەم نووسینە سەرەداوێ بێت بۆ زیاتر شارەزابوونیان لەو بوارەدا.

**هەوڵ دراوە لەم نووسینەدا ئەم هەنگاوانە بنرێن:**

**یەکەم:** نووسینەکە کورت و پوخت بێت و مۆرکێکی مەنهەجی پێ بدرێت.

**دووەم:** نووسینەکە تەنها مەیدانی سیاسی و سەربازی نەگرێتەوەو بوارەکانی تریش لەخۆبگرێت.

**سێیەم:** بۆ وەرگرتنی زانیاریەکان پشت بە سەرچاوە رەسەنەکان ببەسترێت و بۆ شرۆڤە و شیکاریەکان سوود لە مەرجەعەکان ببینرێت.

**چوارەم:** هەتا بکرێت صەحیح و لاوازی گێڕانەوەکان جیابکرێنەوەو گێڕانەوە صەحیحەکان بخرێنەڕوو.

ئەم پەرتووکە تەنها سەرەداوێکە بۆ رۆچوون لە ژیانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)، ئەگەرنا دڵنیام خوا دەرفەتی کەسانێ بدات و تەوفیقیان پێ ببەخشێت بۆ نووسینەوەی وردی ژیانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، پێویست دەکات بە لایەنی کەمەوە لە سەروو دە بەرگی گەورەدا بینووسنەوە، چ وەك رێکخستن و هێنانی زانیاریەکان، چ وەك شرۆڤە و لێکدانەوەیان.

دواجار وەك هەر نووسەرێکی دی دەبێت دان بنێم بە لاوازی هەوڵەکەمدا و تکاش لە دڵسۆزان بکەم هاوکارم بن لە کەمکردنەوەی هەڵەکانمدا.

﴿إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُۚ وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ٨٨﴾ (هود)

نهاد جلال حبيب الله

سلێمانی / ١٤٣٩ کۆچی

# چۆنێتی خوێندنەوەی ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)

سەردەمانی پێشوو کە مێژوونووسانی موسڵمان هەستاون بە نووسینەوەی ژیانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، تەنها هەستاون بە گێڕانەوەی دەقەکان و زیاتر گێڕانەوەی دیارترین رووداوەکانیان هێناوە، لەو سەردەمەدا زیاتر گرنگی دراوە بە گێڕانەوەی جەنگ و غەزاکان، بۆیە کە دەڕوانینە سەرچاوە دێرینەکان لەسەر ژیانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، هێندەی مێژووی غەزاکانمان بەرچاو دەکەوێت، بوارەکانی تری ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەدی ناکەین، چونکە ئەوان لایەنەکانی تری ژیانی پێغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم) لە نووسینەکانی تردا باسکردووە، بۆ نموونە لە کتێبەکانی فەرموودە یان فیقە و ئاداب و بوارەکانی تر، بۆیە کەسانێکی ناحەز بە مێژووی ئیسلامی و خەڵکێکی بێلایەنیش رەخنەی ئەوەیان هەیە کە مێژووی ئیسلامی زیاتر مێژوویەکی سیاسی و سەربازیە، کێشەکە لەوەدایە ئەو جۆرە کەسانە نەگەڕاونەتەوە سەر ئەو سەرچاوانەی تر کە باس لە لایەنەکانی دیکەی ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەکەن.

ئەم نووسینەش بە شێوەیەکی گشتی باس لە ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەکات و تایبەت نەکراوە بە بوارێکی دیاریکراوەوە، چونکە ئامانج لێی ئەوەیە وەك مەنهەجێك بخرێتەبەردەست بەو هیوایەی هێڵە گشتیەکانی ناو ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆ خوێنەران دیاری بکات و لەوێوە هەرکەسەو بە پێی توانا و حەز و تایبەتمەندی خۆی، دەست ببات بۆ بوارێکی دیاریکراوی ناو ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم).

بە شێوەیەکی گشتی پێشنیارمان بۆ خوێندنەوەی ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەم چەشنەیە:

**یەکەم:** سەرەتا گرنگی ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و شارەزابوون لێی بخرێتەڕوو، پاشان تایبەتمەندیەکانی ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بزانرێت.

**دووەم:** ئاگادار بوون بە سەرچاوەکانی وەرگرتنی ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و بەرچاوروونیەکی تەواو بەم مەسەلەیە هەبێت، چونکە هەرکەس لەم هەنگاوەدا ورد نەبێت، هەڵەی زۆر دەکات.

**سێیەم:** شارەزا بوون بە سەردەم و جیهانی ئەو کات لە بوارو لایەنە جۆربەجۆرەکانەوە، بۆ نموونە باری سیاسی و سەربازی و ئایینی و کۆمەڵایەتی ناوچەو دەسەڵاتەکانی ئەو سەردەمە.

**چوارەم:** قۆناغبەندی بۆ ماوەی ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، بۆ نموونە (قۆناغی پێش پێغەمبەرایەتی، قۆناغی مەککە، قۆناغی مەدینە تا فەتحی مەککە، قۆناغی پاش فەتحی مەککە) یان هەر جۆرە دابەشکاریەکی تر، چونکە ئەو قۆناغانە حوکم و جۆری هەڵسوکەوتی جیاوازیان هەبووە.

**پێنجەم:** بۆ هەریەك لەو قۆناغانە ڕێڕەوە گشتیەکانی بوارەکانی ژیان بخرێتە بەرچاو هەر لە بواری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئایینی و ئابووری و ..هتد، پاشان لە هەریەك لەو قۆناغانەدا گرنگی بدرێت بە هەموو بوارەکانی ژیان، نەوەك تەنها لایەنە سەربازی یان سیاسیەکە بخرێتە بەرچاو، بەڵکو لە هەر قۆناغێکدا باس لەوە بکرێت بواری بانگەواز چۆن بووە، باری کۆمەڵایەتی و هەڵوێستی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سەبارەت بەو بوارە چی بووە، باری ئابووری و پەیام و هەڵوێستی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەو بوارەوە چی بووە، بەو چەشنە هەموو بوارەکان بخرێنە بەرباس، چونکە ئێمە باسی ژیانی کەسێك دەکەین کە بە پێشەنگ باس کراوە، نەوەك تەنها کەسێکی سەربازی یان سیاسی یان چاکسازێکی کۆمەڵایەتی بێت،

ئەمە هەوڵی زۆرێك لە ڕۆژهەڵاتناسانە کە تەنانەت هەوڵ دەدەن بە شان و باڵی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) هەڵدەن تەنها بۆ ئەوەی کەسێتیەکەی بەرتەسك بکەنەوە لە کەسێتیەکی سیاسی یان تەنها کەسێتیەکی سەربازی یان لاهووتی یان چاکسازێکی کۆمەڵایەتیدا و لە بوارەکانی تری دامالن، دەی چۆن دەکرێت خۆمان ئامانجەکەی ئەوان بهێنینەدی.

**شەشەم:** پێویستە ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەو جۆرە بخوێنینەوەو بنووسین کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تیایدا ژیاوە، نەوەك ئەوەی ئێمە حەزی پێ دەکەین، واتە ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە ئاقاری ڕەوتی فیکری خۆماندا نەبەین، بەڵکو دەبێت ڕەوتی فیکری خۆمان بکەینە شوێنکەوتەی ڕێڕەوی ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، هەڵەیەکی زۆربەی ڕەوتە جیاوازەکانی ناو موسڵمانان ئەوەیە بەپێی بیرکردنەوەی خۆیان زانیاریەکان ریز دەکەن.

**حەوتەم:** دەبێت لە خوێندنەوەو نووسینی ژیانی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) تەمەن و ئاستی عەقڵی و شارەزایی و هۆشیاری کەسی گوێگر یان خوێنەر ڕەچاو بکەین و قۆناغ دابنێین بۆ پێدانی زانیاریەکان، بۆ نموونە دەکرێت بۆ منداڵان سەرەتا بە کورتی باس بکرێت، دواتر بۆ تازە پێگەیشتوان بڕێك زانیاری زیاتر و بۆ قۆناغی دواتر دەوڵەمەندتر بکرێ بە زانیاری.

**هەشتەم:** مەرج نیە بۆ خوێندنەوەی ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە یەك جار هەموو بوارەکانی ژیانی بخوێنینەوە، دەکرێت سەرەباسەکان دیاری بکەین و هەرجارەو بەپێی سەرەباسەکان ژیانی بخوێنینەوە، بۆ نموونە: (ژیانی سیاسی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، پەرستش لە ژیاننامەی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)، بارودۆخی کۆمەڵایەتی سەردەمی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)،. هتد).

**نۆیەم:** زۆر پێویستە کاتێك ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەخوێنینەوە، بچینە بارودۆخی ئەو سەردەمەوەو بە چاوی ئەو سەردەمەوە لە

رووداوەکان بڕوانین، نەوەك لە واقیعی ئەمڕۆوە حوکم بدەین لەسەر مەسەلەکان، بۆ نموونە کە لە کۆمەڵگەی ئەوکاتدا زۆربەی خەڵك نەخوێندەوار بوون، ئەمە نەکەینە عەیبە بەسەریانەوە، بەڵکو دەبێت بزانین ئەو سەردەمە خوێندەواری بەگشتی لە جیهاندا و بە تایبەتی لەو ناوچەیەدا چۆن بووەو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵان چۆن مامەڵەیان لەگەڵ ئەو واقیعەدا کردووە.

**دەیەم:** خوێندنەوەی ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کتێبێك نیە و یەك جار بخوێنرێتەوەو تەواو، بەڵکو دەبێت موسڵمان بەردەوام ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بخوێنێتەوەو سوود لە نووسینە جیاجیاکان وەربگرێت لەو بارەیەوە، چونکە ئەوە ژیانی کەسێکە خوا فەرمانی کردووە پێشەنگی پێوە بکەین.




## گرنگی و تایبەتمەندی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)

ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گرنگیەکی تایبەتی خۆی هەیە کە بۆ موسڵمان ئەو گرنگیە لە هیچ ژیاننامەیەکی تردا نموونەی نیە، تەنانەت ژیانی پێغەمبەرانی تریش گرنگیەکەیان ناگاتە ئەو ئاستە، چونکە ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەرجەستەکردنی شەرعی خوا و دوایەمین پەیامی ئاسمانە بۆ ئوممەتی موسڵمان هەتا وەك پێشەنگێك تەماشای بکەن، ژیانی کۆتا پێغەمبەرە، پێغەمبەرێ کە سنووری جوگرافی و نەتەوەیی و ڕێڕەوی کات سنووورداری نەکردووە، پێغەمبەرێ بۆ هەموو جیهانیان هەتا ڕۆژی دوایی، تەواوکەری پەیامی هەموو پێغەمبەران و کۆتا پەیامی خوایە هەتا ڕۆژی دوایی.

**گرنگی خوێندنەوەی ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە چەند خاڵێکدا دەخەینەڕوو:**

**یەکەم:** لە ژیانی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) هەنگاوی کۆتایی هەوڵی هەموو پێغەمبەران دەبینین و ئەنجامی کاریان بەدیدەکەین، چونکە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت (إن مثلي ومثل الأنبياء من قبلي كمثل رجل بنى بيتا فأحسنه وأجمله، إلا موضع لبنة من زاوية، فجعل الناس يطوفون به ويعجبون له، ويقولون هلا وضعت هذه اللبنة؟ فأنا اللبنة وأنا خاتم النبيين)[١] (نموونەی من و نموونەی پێغەمبەرانی پێش من وەك نموونەی پیاوێ وایە کە خانوویەکی دروست کردبێت و زۆر بە چاکی و تەواو بە جوانی بنیادی

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٣٣٦٣، صحيح مسلم، الرقم ٤٣٣٨.

نابێت، تەنها لە سووچێکەوە شوێن خشتێ مابێت، خەڵکی کە دێن بە دەوریدا دەسووڕێنەوەو تەماشای دەکەن، پێی سەرسام دەبن و دەڵێن خۆزگە ئەو خشتەش دائەنرا، دەی من ئەو خشتەم و من کۆتای پێغەمبەرانم).

**دووەم:** ڕێڕەوی بەجێگەیاندنی فەرمانی خوای گەورە شارەزا دەبین کە ڕێنموونی کردوین تا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بکەینە پێشەنگ، وەك دەفەرموێت (لقد كان لكم في رسول الله أسوة حسنة).[١]

**سێیەم:** لووتکەی ڕەوشتبەرزی و ئاکاری جوان فێر دەبین، چونکە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) مامۆستای ڕەوشتبەرزی بووەو خۆیشی ئامانجی هاتنەکەی بەوە دەخاتەڕوو (إنما بعثت لأتمم صالح الأخلاق)،[٢] (من نێردراوم هەتا چاکترینی ڕەوشتەکان بگەیەنمە کۆتا).

**چوارەم:** بە جوانی لە دەقەکانی شەریعەت و تەفسیری ئایەتەکانی قورئان تێدەگەین، چونکە وردەکاری هۆکاری دابەزینی ئایەتەکان و هۆکاری دانان و شێوازی پەیڕەوی حوکمە شەرعیەکان لە بوارە جیاجیاکاندا بە شێوەی کردەیی لە ژیانی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) بەدیدەکەین.

**پێنجەم:** خوێندنەوەی ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فێرمان دەکات واقیعیانە بیربکەینەوەو خەیاڵ پڵاو نەبین، هەر لە ژیانی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) تێدەگەین مرۆڤبوون شانازیەکە پێغەمبەران شانازییان پێوە کردووەو نەیانویستووە لە بازنەی مرۆڤبوون بکرێنە دەرەوە، وەك مرۆڤ ژیاون و هەرشتێك پەیوەندی بە مرۆڤەکانەوە هەبووە پەیوەندی بەوانیشەوە هەبووەو فێریان کردوین چۆن لەگەڵیان بجووڵێینەوە، فێریان کردوین مرۆڤەکان هەڵە دەکەن، تاوان دەکەن، شکست دەخۆن، سەردەکەون، نەخۆش دەکەون.. جا ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چۆنێتی مامەڵەی لەگەڵ ئەم حاڵەتانەمان فێر دەکات.

---

(١) الأحزاب: ٢١.

(٢) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٨٧٤٩، صححه الألباني و شعيب الأرناؤوط، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤١٦٢، صححه الحاكم على شرط مسلم و وافقه الذهبي.




## تایبەتمەندیەکانی ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)

هەروەها ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) برێ تایبەتمەندی هەبووە جیا لە ژیانی کەسایەتیەکانی تری ناو مێژووی مرۆڤایەتی، تەنانەت جیا لە ژیانی پێغەمبەرانی تریش، جا لێرەدا چەند تایبەتمەندیەکی دەخەینەڕوو:

**یەکەم:** ژیانی هیچ پێغەمبەرێکی خوا یان کەسێتیەکی مێژوویی نیە وێنەی ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە وردی نووسرابێتەوەو سات بە ساتی هەستان و دانیشتنی تۆمار کرابێت، چ لە ئاستی تێکەڵیی ناو کۆمەڵگە، چ لە ژیانی تایبەتی لەگەڵ خێزانەکانی، چ لە مەیدانی سیاسی و سەربازی، چ لە بواری پەرستشی تایبەت و ژیانی شەخصی خۆی، لە هەموو بوارەکاندا سات بە ساتی ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە وردی تۆمار کراوە.

**دووەم:** وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سەرمۆری رێڕەوی پێغەمبەرانە، واتە هەرچی جوانیەکانی پەیامی خوا هەیە هەر لە ئادەمەوە تا هاتنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، چۆڕاوەی هەموو جوانی و گەورەییەکان لەم کۆتا پەیامەدایە، هەموو رێڕەوە گشتیەکان و زۆربەی وردەکاریەکانی ئەو جوانیانەش لە ژیانی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) بەرجەستە بون.

**سێیەم:** ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەرتەسك نەبووەتەوە لە گێڕانەوەی برێ رووداو و بەسەرهاتدا و تەنها لە کۆڕ و دانیشتنەکاندا باس بکرێت، یان ژیانی کەسێتیەکی مێژوویی بێت کە وەك بەسەرهات یان ئەکتەرێکی

ناو ڕووداوێکی مێژوویی باس بکرێت، بەڵکو جموجووڵەکانی پێکهێنەری حوکمە شەرعیەکانی شەریعەتی ئیسلام بون و حەق و باتڵ و ڕەش و سپییان لە یەك جیا کردۆتەوەو بون بە بەشێك لە فەرمانی خوا، چونکە هەم کرداری هی پێشەنگیە، هەم گوفتاری وەحیەکی خوایی بووە، هەر ئەمە وایکردووە سنووری کات و شوێن ببڕێت و نە سنووری جوگرافی و نە تێپەڕبوونی زەمان دوچاری کوژانەوەی نەکردووە.

**چوارەم:** ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تەنها وەك بەسەرهاتێکی مێژوویی باس ناکرێت، بەڵکو بۆ ئەوەیە پێشەنگی پێوە بکرێت و تەفسیری قورئانی لێوە وەربگیرێت، واتە جووڵەو ڕەفتار و فەرمایشتی بەیان و ڕوونکردنەوەیەك بووە بۆ ئەو پەیامەی لای خواوە بۆی نێردراوە.

بۆیە خوێندنەوەی ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەم گرنگی تایبەتی خۆی هەیە، هەم تایبەتمەندی خۆی هەیە جیا لە ژیان پێغەمبەرانی تر و کەسێتیەکانی دیکەی ناو مێژووی مرۆڤایەتی.




## سەرچاوەکانی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)

لایەنێکی گرنگی پەیوەست بە ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) شارەزابوونە لە سەرچاوەکانی وەرگرتنی زانیاری تایبەت بە ژیانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و چۆنێتی مامەڵە کردن لەگەڵ ئەو سەرچاوانەدا، چونکە زۆرجار خوێنەری مێژووی ئیسلامی بەهۆی شارەزا نەبوونی لە سەرچاوەکان و تێکەڵکردنی ریزبەندی لە سەرچاوەکان و جۆری مامەڵەی لەگەڵ زانیاری هەر سەرچاوەیەکدا تووشی هەڵە دەبێت، گرنگترین سەرچاوەکان بەپێی ریزبەندی بریتین لە:

**یەکەم: قورئانی پیرۆز:** قورئان کە پەیامی دابەزێنراوی خوای گەورەیە بۆ پێغەمبەری خوا، سەرچاوەی یەکەم و بێگومانی وەرگرتنی زانیاریە سەبارەت بە ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئەگەر وەك موسڵمان تەماشا بکەین، ئەوە لەوە دڵنیاین کە پەیامی خوایەو فەرمایشتی خوایش هیچ گومانێکی تێدا نیە، بۆیە زانیاریەکانی لەپێش هەر زانیاریەکی دیکەوەن، هەروەها هۆکاری دابەزینی ئایەتەکان روونکەرەوەی رووداوەکانی ژیانی پێغەمبەرن (صلی الله علیه وسلم)، ئەگەریش کەسێکی ناموسڵمان بیخوێنێتەوە (ئیتر ئەهلی کیتاب[1] بێت یان کەسێکی بێدین) ئەوە هەر دەبێت بە پێوەری عەقڵی قورئان بە سەرچاوەی یەکەم بزانێت بۆ ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، چونکە سەرچاوەی ئەو ئایینەیە کە پێغەمبەری خوا بانگەوازی بۆ کردووە.

---

(١) مەبەست بە ئەهلی کیتاب شوێنکەوتوانی ئایینە ئاسمانیەکانن کە بڕوایان بە پێغەمبەرێك و کتێبەکەی هەیە، بەتایبەتی تر مەبەست پێی مەسیحی و جولەکەکانە.

لە قورئانی پیرۆزدا زۆر مەسەلەی وردی ناو ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) روون دەبنەوە، هەندێ بابەتی ناو ژیانی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) هەن کە بۆمان روون نین و زانیاری تەواو و بێخەممان لەبەردەست نیە لەبارەیانەوە، ئەوە قورئان چارەسەری ئەو گرفتەمان بۆ دەکات، چونکە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) جموجوولٚی رۆژانەی بەپێی قورئان بووە، واتە قورئان چۆن دواوە، ئاوا جوولاٚوەتەوە، وەك عائیشەی هاوسەری لە بارەیەوە دەگێڕێتەوە (إن خلق نبي الله صلی الله علیه وسلم کان القرآن)[1] (ئاکار و رەوشتی وەك ئەوە بوو کە قورئان داوای کردووە)، بۆیە قورئان دەبێتە روونکەرەوەو راستکەرەوەی ئەو زانیاریانەی کە لە سەرچاوەکانی تردا هاتون.

**دووەم: فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم):** سەرچاوەیەکی تری وەرگرتنی زانیاری تایبەت بە ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بریتیە لە فەرموودەکانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، ئەم کۆگا دەوڵەمەندە زۆرترینی زانیاری دروستی تایبەت بە ژیانی پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) لەخۆگرتووە، مادەم ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەك پێشەنگی تەماشا دەکەین و کردار و گوفتار و بیرکردنەوەی لەسەر بنیاد دەنێین، پێویستە وریای فەرمووده لاواز و وەرنەگیراوەکان بین، ناکرێت ئەمانە بکەینە بەڵگە بۆ تۆماری ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، چونکە ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆ موسڵمان بریتیە لە پێشەنگی، بۆ ناموسڵمانیش بریتیە لە ئاگاداربوون لە راستی کەسایەتیەك کە لە هاتنیەوە تا ئەمڕۆ بە تەواوەتی ڕێڕەوی ژیان و مرۆڤایەتی گۆڕیوە.

هەروەها هەندێ کتێب نووسراون تایبەت بە ژیان و ئاکاری پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئەمانەش دووبارەلە بازنەی فەرموودەدان، بەلاٚم بە شێوەیەکی تایبەت لەسەر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نووسراون و لە مەسەلەکانی تر جیاکراونەتەوە.

---

(١) صحیح مسلم، الرقم ١٢٧٠، صحیح ابن حبان، الرقم ٢٥٩١.

**سێیەم: سەرچاوەکانی مێژووی ئیسلامی:** ئەمانە هەموو ئەو نووسینانە دەگرنەوە کە تایبەت بە ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و مێژووی ئیسلامی نووسراون، زانایانی موسڵمان تەنانەت ئەوانەشیان کە فەرمووودەناس بون، بۆ نووسینەوەی ئەم کتێبانە، هەمان هەنگاوەکانی فەرمووودەیان نەگرتۆتەبەر و نەرمیەکیان نواندووە لە وەرگرتن و تۆمارکردنی زانیاریەکاندا، بەمەش ئەرکێکیان بۆ کەسانی پاش خۆیان جێهێشتووە تا لێکۆڵینەوەی ورد بکەن لەسەر راستی و دروستی زانیاریەکان.

ئەم بابەتە تا ئەمڕۆش گرفتی زۆری بۆ موسڵمانان ناوەتەوەو دەیان و سەدان زانیاری ناپەسەند و نادروست خزێنراونەتە ناو ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و مێژووی ئیسلامیەوەو وەك راستیەکی حاشاهەڵنەگر باسکراون، ئەو نەرمی نواندنەش لە کاتی خۆیدا لەبەرئەوە بووە پێشینان بۆ بەپێشەنگ کردنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) زیاتر گرنگییان داوە بە قورئان و فەرموودەکان، ئەمەی تریان وەك تۆمارێکی مێژوویی تەماشا کردووە، بەڵام لە راستیدا ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێویستی بەوە هەیە هەمان ئەو هەنگاوانەی بۆ بگیرێتەبەر کە بۆ وەرگرتن و قەبووڵکردنی فەرمووده گیراونەتەبەر، چونکە مەسەلەی ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) حوکمی لەسەر دەدرێ و پێشەنگی پێوە دەکرێ، ئەگەر نەرمی نواندن بۆ زانیاریە مێژووییەکانی دوای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵان بە جۆرێ لە جۆرەکان دروست بێت، بە هیچ شێوەیەك بۆ ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵانی دروست نیە، چونکە ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆ پێشەنگیە و ژیانی هاوەڵانیش پەیوەستە بە ئەنجامی پەروەردەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و ماوەی تۆمار و پاراستنی زانیاریەکانی ئیسلام، هەر بۆیە نەیارانی ئیسلام زۆرتر رووی دەمیان لەو ماوەیە کردووە.

هەر لەو سەرچاوانەدا شیعر و دیوان و بەرهەمی سەردەمی جاهیلی و سەردەمەکانی دواتر تۆمار کراون کە برێ مەسەلەی پەیوەست بە ژیانی

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) روون دەکەنەوە، یان ئەو کتێبانەی تایبەت بە ژیانی هاوەڵان نووسراون، یان ئەو سەرچاوە جوگرافیانەی دواتر نووسراون و باسی نیمچەدوورگەی عەرەبییان کردووە، بەڵام هەموو ئەمانەش پێویستییان بە لێکۆڵینەوە هەیە و ناکرێت بێ لێکۆڵینەوەیەکی ورد بکرێنە بەڵگە.

سوپاس بۆ خوا ئەمڕۆ هەوڵێکی جددی لە ئارادایە هەتا لە نووسینەوەی ژیانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) گونجاندنێ هەبێت لە مەنهەجی فەرموودەناسان و مەنهەجی مێژوونووسانی موسڵماندا بەو مەبەستەی هەرچیەك لە پێوەرە زانستیەکانی تایبەت بە وەرگرتنی زانیاری دروست لای موسڵمان دەرنەچێت، نەکرێت بە ماڵ بەسەر ئیسلام و موسڵمانانەوە.



## ڕۆژهەڵاتناسان و ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)



ڕۆژهەڵاتناسان هەموو ئەو ڕۆژئاواییانەن کە بە گشتی لەسەر ڕۆژهەڵات و بە تایبەتی لەسەر جیهانی ئیسلامی نووسین و پەیامی خۆیان هەیە، ئەمانە بە پاڵنەری جیاواز و هەریەکەو لە قوتابخانەیەکی فیکری، یان ناوچەیی جیاوازەوە لە سەردەمە جیاجیاکاندا، یان ڕوویانکردۆتە جیهانی ڕۆژهەڵات، یان کات و توانای خۆیان تەرخان کردووە بۆ نووسین لە بارەی ڕۆژهەڵات و جیهانی ئیسلامی.

**ئەگەر ڕۆژهەڵاتناسان بەپێی پاڵنەرەکانیان دابەش بکەین دەتوانین بڵێین هەرکامەو بە یەکێك یان زیاتر لەم پاڵنەرانە هاتون:**

**یەکەم: پاڵنەری ئایینی:** ئەم پاڵنەرە لە زۆربەی هەرە زۆری ڕۆژهەڵاتناسەکاندا هەیەو لە ڕابردوودا زۆرینەیان سەر بە مەسیحیەت بوون و بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی مەسیحیەت یان هیچ نا شکاندنی ئیسلام و مێژووی موسڵمانان خوویان داوەتە لێکۆڵینەوە لە جیهانی ئیسلامی.

**دووەم: پاڵنەری ئابووری:** بەشێك لە ڕۆژهەڵاتناسان پڕکردنی گیرفانی خۆیان و وڵاتەکەیان هانی داون تا ڕووبکەنە جیهانی ئیسلامی و لەوێوە و بەو دیدو ڕوانینەوە کار بکەن لەسەر ئیسلام و مێژووی ئیسلامی، بەرهەمی کاری ئەمانە بە گشتی دژ بە موسڵمانان بووەو بۆ پڕکردنی گیرفانی دەوڵەتە مەسیحی یان عەلمانیەکان بووە.

**سێیەم: پاڵنەری سیاسی:** بەشێکی دیاری ڕۆژهەڵاتناسەکان کەسانی سیاسی بوون و بە ئامانجی سیاسی دەهاتنە ناو جیهانی ئیسلامی و پەیام و نووسین و ڕوانینیشیان هەر لەو ڕوانگەیەوە بوو، ئەمانە بە گشتی دژ بە موسڵمانان و ئایین و مێژووەکەیان کاریان کردووە.

**چوارەم: پاڵنەری سەربازی:** ئەم بەشەی ڕۆژهەڵاتناسان کەسانی سەربازی بوون، یان وەك هەواڵگر و جاسووس هاتوونەتە جیهانی ئیسلامی و لەو ڕوانگەوە کاری خۆیان کردووە، یان وەك شاڵاوهێن ڕوویانکردۆتە جیهانی ئیسلامی و خاك و وڵاتی موسڵمانانیان کردووەتە ئامانج، ئەم جۆرەش بە گشتی ناحەز بە خاك و ئایین و مێژووی موسڵمانان لێنەویون.

**پێنجەم: پاڵنەری زانستی:** بەشێکی ڕۆژهەڵاتناسان لە هاتن و نووسین و لێکۆڵینەوەکانیاندا لەسەر موسڵمانان و مێژووی ئیسلامی، پاڵنەر و ئامانجەکەیان زانستی بووەو وەك هەوڵێکی زانستی هەنگاویان ناوە، جا لەمەشدا هەندێکیان بێلایەن بوون و هەندێکیشیان نەیانتوانیوە بێلایەنی و زانستی بوونی خۆیان بپارێزن، هەندێکیشان هەرچەندە دڵسۆزییان نیشانداوە، بەڵام لەسەر بنەمای سۆزداری هەنگاویان ناوە.

هەروەها دابەشکاریەکی تر بۆ ڕۆژهەڵاتناسان بەپێی قوتابخانە ناوچەییەکانیانە، بۆ نموونە قوتابخانەی (فەڕەنسی، ئینگلیزی، هۆڵەندی، ئەمریکی، ئیسپانی...)، هەریەك لەمانە هەمان ئەو دابەشکاریەی پێشوو دەیانگرێتەوە، بەڵام تۆخبوونەوەی ئەم قوتابخانانە لە بوارێکدا زیاتر دەردەکەوێت، هەیانە زیاتر گرنگی بە مێژووی ئیسلامی داوە، هەیانە زیاتر جەختی لە بواری فیقهی ئیسلامی کردوەتەوە، هەیانە زیاتر ئیشی لەسەر جوگرافیای جیهانی ئیسلامی کردووە.

جا ڕۆژهەڵاتناسان کە هاتون لەسەر ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) قسەیان کردووە، ئەندامی یەکێك لەم قوتابخانانە بون و هەمان پاڵنەر یان چەند پاڵنەرێك لەوانەی سەرەوە هاندەریان بون، بۆیە زۆر پێویستە کە نووسینی ڕۆژهەڵاتناسێك لەسەر ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه

وسلم) دەخوێنینەوە، بزانین سەر بە چ قوتابخانەیەك بووە و تایبەتمەندیەکانی ئەو قوتابخانە رۆژهەڵاتناسیە بزانین، پاشان بزانین پاڵنەرە سەرەکیەکەی چی بووە.

لەبەرئەوەی جیهانی رۆژئاوا درەنگ راچڵەکین تا خوو بدەنە لێکۆڵینەوە لە جیهانی رۆژهەڵات بە گشتی و جیهانی ئیسلامی بە تایبەتی، بۆیە نابینین لە سەرەتاکانی هاتنی ئیسلام و چەند سەدەیەکیش دوای ئەوە رۆژئاواییەکان نووسین و لێکۆڵینەوەیەکیان لەو بارەوە هەبێت، بۆیە سەرچاوەی هەموو نووسینەکانیان لەبارەی ژیانی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) لە سەرچاوەکانی جیهانی ئیسلامیەوەیە، هەروەها لەبەرئەوەی شارەزاییەکی ئەوتۆیان نەبووە بە زانستەکانی ناو جیهانی ئیسلامی، بۆیە فلتەرێکی ئەوتۆیان بەکارنەهێناوە بۆ وەرگرتنی زانیاریەکانی ناو ئەو سەرچاوانەو بە دڵی خۆیان چ زانیاریەکیان پێ باش بووە بەپێی ئامانج و بیرکردنەوەی خۆیان کاریان لەسەر کردووە، ئیتر لای ئەوان گرنگ نەبووە ئەم سەرچاوەیە نووسەرەکەی کێیەو ئاستی زانستی بوونی سەرچاوەکە لە چ ئاستێکدایەو ئاستی بەهێزی سەنەدو وەرگرتنی زانیاریەکە لە چ ئاستێکدایە.

جا لەبەرئەوەی زۆرینەیان نەیاری موسڵمانان و مێژووی ئیسلام بون، بۆیە زیاتر جەختیان لە گێڕانەوەکانی نەیارانی ئەهلی سوننەت کردۆتەوە، لەناو سەرچاوەکانی ئەهلی سوننەشدا ئەو زانیاریانەیان وەرگرتون کە دەبنە رەخنە بۆ سەر ئیسلام و مێژووی ئیسلامی، ئەمەش لادانێکی زانستیە و چۆتە هەگبەی مێژووییانەوە، چونکە زۆرینەی مێژوونووسانی ئەهلی سوننە وەك ئەمانەتی زانستی هەرچی گێڕانەوەیەکیان دەستکەوتووە بە سەنەدەوە تۆماریان کردووە، پاشان هاتون پێوەری زانستییان داناوە بۆ هەڵسەنگاندنی گێڕانەوەکان و جیاکردنەوەی دروست و لاوازەکان، ئەمەش لەسەر بنەمایەکی وردی زانستی، نەوەك لەسەر بنەمای سۆزداری و هەواداری، جاری واش هەبووە گێڕانەوەکە لەگەڵ حەزی ئەواندا نەگونجاوە، بەڵام مادەم پێوەرە زانستیەکانی تێدا بووە، بۆیە دانیان پێدا ناوەو بە صەحیحیان داناوە.

ئەگەرچی کات و شوێن و بیرکردنەوەی ڕۆژهەڵاتناسان لە کارکردنیان لەسەر ژیانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) جیاواز بوو بێت، بەڵام بە گشتی هەموویان وەك کۆمەڵە سوپایەك وابون کە لە کات و بەرەی جیاواز و بە ئامانجی جیاوازەوە هێرشیان بردۆتە سەر شارێك و هەرجارەو شاڵاوی یەکێکیان گورزێکی لە شارەکە وەشاندووە، جا زۆرجار کەسی وا هەیە دەرك بەوە ناکات، بەڵام ئەگەر لە دوورەوە بڕوانێت، دەبینێت چۆن لێشاوی تیری هەموو قوتابخانەکان بە یەك ئاڕاستەن.

بە گشتی زۆربەی ڕۆژهەڵاتناسانێك کە ناحەزن بە ئیسلام یان مێژووی ئیسلامی، لە نووسینەکانیانیدا سەبارەت بە ژیانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەوڵ دەدەن لە چەندین بواردا گومان دروست بکەن، بەڵام ئێمە لێرەدا تەنها هێڵە گشتیەکان باس دەکەین:

**یەکەم:** هەندێك هەموو هەوڵیان بۆ ئەوەیە بدەن لە سەردەمی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و سەردەمەکەی بە سەردەمی ئەفسانەو نەفامی نیشان بدەن، لەم روانگەشەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و پەیامەکەی بە بەرهەمی ئەو سەردەمە ئەفسانەییە بخەنەڕوو، هەروەها هەوڵیان داوە شوێنی جوگرافی و ئەو ژینگەی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) تێدا ژیاوە بخەنە بەرباس و لەوێوە هێرشی خۆیان بکەن.

**دووەم:** هەندێك دەیانەوێت بدەن لە کەسێتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و بیشکێنن، ئیتر یان تانە لە ڕەچەڵەکی بدەن، یان گومان لەسەر کاتی لەدایکبوونی و پاکی نەژادی دروست بکەن، یان تانە بدەن لە کەسێتی و ژیری و مەردایەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، واتە بە گشتی هەوڵی شکاندنی کەسێتی و عەقڵی و نەژادیی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەدەن.

**سێیەم:** هەندێکی دی هەموو هەوڵیان ئەوەیە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە پەیامی خوایی دابڕن و وەك کەسێتیەکی پاڵەوان یان چاکسازێکی

کۆمەڵایەتی نیشانی بدەن، بۆیە ئامادەن هەر جوانی و گەورەییەکی پێ ببەخشن تەنها بەو مەرجەی لە وەحی خوایی دایماڵن.

**چوارەم:** هەندێك هەوڵ دەدەن گومان بخەنە سەر راستی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و تازەیی پەیامەکەی، بەڵکو وای نیشان دەدەن ئیسلام لە ئایینەکانی پێشووەوە وەرگیراوەو پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) لە کەسانی ترەوە رێنماییەکانی ئیسلامی وەرگرتووە.

**پێنجەم:** هەندێکی دی هەوڵ دەدەن پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە ساختەکارێکی شارەزا نیشان بدەن کە خۆی رێنماییەکانی داناوەو هیچی لە خواوە وەرنەگرتووەو بە ناوی خواوە قسەی کردووە، ئیتر قورئان بە وتەی خۆی دەزانن نەوەك پەیامی خوا.

**شەشەم:** هەندێکی دی هاتون گومانیان لەسەر راستی تۆماری قورئان و فەرمووده دروست کردووە تا لەوێوە بدەن لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و گومان لەسەر هەموو ژیانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دروست بکەن.

**حەوتەم:** هەندێك هەوڵیان داوە ئیش بکەن لەسەر چواردەوری پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و لێدانی هاوەڵان و تۆمەتی جۆراوجۆریان بەسەردا ببەخشنەوە، هەتا لەو هەنگاوەوە گومان بخەنە سەر بەرهەمی کاری پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم).

لە ئەنجامی ئەم هەوڵانەیان توانیویانە رەنجێکی زۆر بدەن و بەرهەمێکی چاکیش بچننەوە، چونکە سەدان مەڵۆی گومانیان دروستکردووەو بەشێکی زۆری موسڵمانانیان پێوە سەرقاڵ کردون، حاڵەتێکیان دروستکردووە موسڵمانانی ئەمڕۆ بکەونە بەرەی بەرگری کردن و تەنها سەرقاڵی وەڵامدانەوەی گومانەکانیان بن، لە سەد بۆمبی چێنراویش دە بۆمب بتەقێتەوە، بەسە هەتا کاولکاری و کوشتاری لێ بکەوێتەوە.

خوێنەری ئازیز بۆ بەرچاوڕوونی زیاتر لەم بارەیەوە دەتوانیت بگەڕێیتەوە سەر ئەو سەرچاوانەی تایبەت بە ڕۆژهەڵاتناسی نووسراون، بەتایبەت هەندێك لەو سەرچاوانە بە وردی لەسەر ڕۆژهەڵاتناسان و مامەڵەیان لەگەڵ ژیانی پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) دواون، بۆ نموونە:

ادوارد سعيد: الإستشراق.

د. محمد فاروق النبهان: الإستشراق، تعريفه، مدارسه، آثاره.

د. إسماعيل علي محمد: الإستشراق بين الحقيقة والتضليل.

عبدالله محمد الأمين النعيم: الإستشراق في السيرة النبوية.

أ.د. فاروق عمر فوزي: الاستشراق و التاريخ الاسلامي.

الدكتور ساسي سالم الحاج: نقد الخطاب الإستشراقي.

# باسی یەکەم

## بارودۆخی ناوچە و سەردەمەکە

نیمچە دوورگەی عەرەبی کەوتۆتە بەشی خوارووی رۆژئاوای کیشوەری ئاسیا، رووبەرەکەی سێ ملیۆن کیلۆمەترە و لە سێ لاوە بە ئاو دەورە دراوە، لە رۆژهەڵاتەوە کەنداوی عەرەبی و لە باشوورەوە زەریای هیندی و لە رۆژئاواشەوە دەریای سوور، ناوچەکە زیاتر کەشێکی بیابانی هەیەو لە هەندێ شوێن لماویەو هەندێ شوێنی شاخاویشی هەیە.

**عەرەبەکان لە پێش هاتنی ئیسلامدا سێ دەستە بوون:**

**عەرەبی بائیدە:** ئەمانە لە پێش هاتنی ئیسلام لەناوچوون و نەمان، هۆکاری لەناوچوونەکەشیان سزای خوایی بوو کە بە هۆکاری سروشتی و گۆڕانی جوگرافی ناوچەکە لەناوبران، وەك عاد و ثەموود کە لە قورئانی پیرۆزدا باسیان کراوە.

**عەرەبی عاریبە:** ئەمانە عەرەبەکانی پێش ئیسماعیل پێغەمبەر بوون، وەك قەحطانیەکان.

**عەرەبی موستەعرەبە:** ئەمانە نەوەکانی ئیسماعیل پێغەمبەر بوون، یەکەم مانەوەیان لە نیمچەدوورگەی عەرەبی لە پێغەمبەر ئیسماعیلەوە دەستی پێکرد.[1]

---

(١) ابن كثير: البداية والنهاية، ج١، ص ١٣٨ و ج٢، ص ١٨٧.

لە دیارترین شارستانیەتەکانی عەرەب لە پێش هاتنی ئیسلامدا بریتی بوون لە:

شارستانیەتی سەبەء لە یەمەن،[١] شارستانیەتی عاد لە ئەحقاف کە خوای گەورە پێغەمبەر هوودی نارد بۆیان،[٢] شارستانیەتی ثەموود لە حیجاز کە خوای گەورە پێغەمبەر صالحی نارد بۆیان،[٣] ئەم شارستانیەتانە لەبەر لادانیان لە فەرمانی خوا بەر خەشمی خوا کەوتن و لەناوچوون.

## بـــارودۆخی ئابووری:

**کشـتوکاڵ:** لەبەرئەوەی بەپێی جیاوازی شوێنەکان ڕێژەی باران بارینیش جیاوازی هەیە، ئەمە کاری کردۆتە سەر لایەنی کشتوکاڵ و هەندێ شوێن گرنگییان داوە بە بواری کشتوکاڵی و هەندێ شوێنیش بەرهەمێکی کشتوکاڵی وایان نەبووە جێی باس بێت، ئەمە لە بواری ئاژەڵداریشدا ڕەنگی داوەتەوەو کەم و زیادی لەوەڕگەکان کەم و زۆری ئاژەڵداریشی لێکەوتۆتەوە، جۆری ئاژەڵیش لە ناوچەکەدا بریتی بوو لە وشتر و ڕەشەوڵاخ و مەڕ و بزن و ئەسپ و.. هتد، هەندێ لە لەوەڕگا و سەرچاوە ئاویەکان گشتی بوون و هەندێکیشیان تایبەت بوون بۆ هۆزێ یان خێڵێکەوە.

**بـــازرگانی:** کار و ڕێگەی بازرگانیش سەرچاوەیەکی تری داهات بوو، لە مەککە زیاتر خەڵکی سەرقاڵی کاری بازرگانی دەبوون،[٤] هەندێکیش ئەگەرچی کاری بازرگانییان نەئەکرد، بەڵام لەبەر پاراستنی ڕێگە بازرگانیەکان باج و سامانیان لە کاروانە بازرگانیەکان وەردەگرت و داهاتیان لەسەر ئەوە بوو.

---

(١) ابن کثیر: البدایة والنهایة، ج٢، ص ١٩١-١٩٣.

(٢) ابن کثیر: البدایة والنهایة، ج١، ص ١٣٧.

(٣) الطبري: تاریخ الأمم و الملوك، ج١، ص ٢٠٤.

(٤) وەك لە قورئاندا ئاماژە دراوە بە گەشتی بازرگانیی هاوینە و زستانە ﴿لِإِيلَافِ قُرَيْشٍ (١) إِيلَافِهِمْ رِحْلَةَ الشِّتَاءِ وَالصَّيْفِ (٢)﴾.

قورەیشیەکان ساڵانە دوو گەشتی بازرگانییان هەبوو، گەشتی هاوینە بۆ شام و گەشتی زستانە بۆ یەمەن، خوای گەورەش لە قورئانی پیرۆزدا باسی کردووە:

﴿ لِإِيلَـٰفِ قُرَيْشٍ ﴿١﴾ إِۦلَـٰفِهِمْ رِحْلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيْفِ ﴿٢﴾ فَلْيَعْبُدُوا۟ رَبَّ هَـٰذَا ٱلْبَيْتِ ﴿٣﴾ ٱلَّذِىٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍۭ ﴿٤﴾ ﴾ (قريش)

(لەبەر هۆگریی و یەکگرتنی قورەیش بە هاتووچۆی زستانەو هاوینەوە، جا لەبەر ئەو بەهرە گەورەیەی خوایە بەسەریانەوە، دەبا هەر خاوەنی ئەم خانەیە (کعبە اللە) بپەرستن و هەموو هەر بۆ ئەو سەر دانوێنن، ئەو خوایەی بەو هۆیەوە قوتاری کردن لە برسێتیی و هێوریشی کردنەوە لە ترس).

**پیشەسازی:** سەبارەت بە بواری پیشەسازی، عەرەبەکان شارەزاییەکی ئەوتۆیان نەبوو لەو بوارەدا و زیاتر پشتیان دەبەست بە لێهاتوویی و شارەزایی کەسانی غەیرە عەرەب یان ئەو کۆیلانەی لەبەردەستیاندا بوون.[١]

## بارودۆخی کۆمەڵایەتی:

خوێندەواری لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا زۆر لاواز بوو، ئەو کەسانەی خوێندەوارییان هەبوو کەسانی دیار و بەرچاو بوون لە کۆمەڵگەدا.[٢]

ئافرەت لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر جیاواز بوو، بۆ نموونە ئافرەتانی مەککە زیاتر وەك کۆیلە بوون لە بەردەستی پیاواندا، بەڵام ئافرەتانی مەدینە خاوەنداریێتی و قسەڕۆیشتوییان هەبوو،[٣] هەروەها بەپێی

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٢١٧٧، صحيح مسلم، الرقم ٥١٠٩.

(٢) باشترین بەڵگەش بۆ ئەوە مەرجەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو کە پاش غەزای بەدر مەرجی دانا بۆ بەندکراوە بێباوەڕەکان، بۆ خۆئازادکردنیان منداڵە موسڵمانەکان فێری خوێندەواریی بکەن.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ٢٣٥٦، صحيح مسلم، الرقم ٢٧٨٥.

ئاییندارییەکە جیاوازی هەبوو، جوولەکەکان هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بتپەرستەکاندا جیاواز بوو.

بە گشتی ئافرەت لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا پلە دوو بوو، لە زۆربەی بوارەکانی ژیاندا مافی دەخورا، ئافرەت کرابووە کاڵا و پێناوی تێربوونی ئارەزووەکانی پیاو، زۆرێك لەو سنوورانەی ئیسلام داینان پێشتر نەبوون، داوێن پیسی دیاردەیەکی باوی ناو کۆمەڵگە بوو،[١] چەندەها جۆری هاوسەرگیری هەبوو،[٢] ئافرەت هێمای عەیبە بوو و زۆرجار هەر بە منداڵی زیندەبەچاڵ دەکرا،[٣] هەندێ لە ئافرەتانیش جۆرێك لە گەورەیی و تایبەتمەندییان هەبوو و دەیانتوانی خاوەندارێتی دارایییان هەبێت وەك خەدیجەی کچی خوەیلید.[٤]

سیفەتی خێڵەکی و جۆرێك لە وشکی و زبریی، زاڵ بوو بەسەر نیمچەدوورگەی عەرەبیدا، زۆرجار لەسەر مەسەلەیەکی بچووك جەنگیان هەڵئەگیرساند و کوشتاری یەکدییان ئەکرد.[٥]

دابەشبوونی چینایەتی لە کۆمەڵگەدا هەبوو، چ لە رووی ئابوورییەوە، چ لە رووی کۆمەڵایەتییەوە، چ لە رووی رەگەزیشەوە، هەروەها جیاکاریی ئایینی لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا هەبوو.

---

(١) ابن الأثير: الكامل في التأريخ، ج٣، ص ٢٧٦.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٤٨٣٥.

(٣) وەك قوئان ئاماژەی پێداوە (وَإِذَا الْمَوْءُودَةُ سُئِلَتْ (٨) بِأَيِّ ذَنْبٍ قُتِلَتْ) (سورة التكوير: ٨ - ١٠).

(٤) الطبري: تأريخ الأمم و الملوك، ج٢، ص ٢٨٠.

(٥) ابن الأثير: الكامل في التأريخ، ج١، ص ٤٧٣.

## بارودۆخی ئایینی:

عەرەبەکان سەرەتا سەر بە ئایینی حەنەفیەتی ئیبراهیمی بوون، ئەو ئایینە لە سەردەمی پێغەمبەر ئیبراهیمەوە لەناویاندا بڵاو بووبوویەوە، بەڵام بەرەبەرە وەك هەر ئایینێکی تر دەستکاری بنەڕەتەکانی ئایینەکە کرا و دواجار ماوەیەك بەر لە هاتنی پێغەمبەری خوا زۆرینەی عەرەبەکان دەستبەرداری حەنەفیەت بوون،[١] کەمینەیەکی زۆر کەم لەسەر ئەو ئایینە مابوونەوە کە بە پەنجەی دەست دەژمێردران، وێنەی ئەوانەش وەرەقەی کوڕی نەوفەل[٢] و قوسسی کوڕی ساعیدەی ئیادی بوو.

پاشان بتپەرستی لەناو عەرەبەکاندا بڵاو بوویەوەو هەر جارەو جۆرێ بتیان دەپەرست، ئەو کەعبەی کە ئیبراهیم پێغەمبەر بنیادی نابوو و پەرستش تیایدا لەسەر بنەمای یەکخواپەرستی بوو، چواردەوری پڕ کرا لە بتی جۆراوجۆر،[٣] جگە لەوەش پەرستشی خۆر و مانگ و ئەستێرەکان و بڕوابوون بە هێز و توانایان لە ناوچەی جیا جیا و بە ڕێژەی جیاواز شوێنکەوتەی خۆی هەبوو.[٤]

هەروەها ئایینی جوولەکە لە چەند ناوچەیەکی نیمچەدوورگەی عەرەبیدا هەبوو، بەتایبەت لە شاری یەثریبدا ڕێژەیەکی بەرچاوی جوولەکە هەبوون،[٥]

---

(١) ابن هشام: السيرة النبوية، ج١، ص ٧٦.

(٢) وەرەقەی کوڕی نەوفەل: ئامۆزای خەدیجەی خێزانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو، پیرێکی بەتەمەن بوو کە بەهۆی شارەزابوونی لە زمانی عیبرانی، شارەزاییەکی باشی هەبوو لە ئینجیلدا، لە دوارۆژەکانی تەمەنیدا بینایی لەدەستدا و ماوەیەکی کەم پاش پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەفاتی کرد. (صحيح البخاري، الرقم ٣).

(٣) ابن إسحاق: السيرة النبوية، ج١، ص ٣٢.

(٤) لەناو شارستانیەتی سەبەئیەکان لە یەمەندا خۆرپەرستی هەبوو وەك لە قورئاندا ئاماژەی پێدراوە (إِوَجَدْتُهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِنْ دُونِ اللَّهِ)، شوێنەواری ئەو جۆرە پەرستشانە لەناو عەرەبەکاندا بە کزیی مابوویەوە.

(٥) ابن إسحاق: السيرة النبوية، ج١، ص ٩٠، لە بەسەرهاتی موسڵمانبوونی سەلمانی فارسیدا باسی جوولەکەکانی مەدینە دەکات.

ئەمانە ئایینەکەیان نەژادیی بوو و دەرفەتیان نەدەدا بە عەرەبەکان بچنە ناو ئایینەکەیانەوە، زۆرجاریش تانەی ئایینییان دەدا لە عەرەبەکان.[١]

مەسیحیەتیش گەیشتبوویە چەند ناوچەیەکی نیمچەدوورگەی عەرەبی، بەتایبەت بەهۆی گەشتی بازرگانی لەگەڵ شام و پەیوەندی دەریایی لەگەڵ حەبەشیەکاندا، هەروەها لەبەر تایبەتمەندی موژدەبەریی ئایینی مەسیحیەت، ئەو ئایینە لە نیمچەدوورگەشدا هەبوو.

## بارودۆخی سیاسی:

دیارترین دەسەڵاتەکانی دەوروبەری نیمچەدوورگەی عەرەبی لە سەردەمی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) بریتی بوون لە: ئیمپراتۆریەتی رۆمانی کە سیستمی دەسەڵاتیان پاشایەتی بوو و ئایینی رەسمی وڵاتیش مەسیحیەت بوو، ئیمپراتۆریەتی فارسی کە لێرەش سیستمی دەسەڵات پاشایەتی بوو و هەریەك لە ئایینەکانی زەردەشتی و مانی و مەزدەکی تیایدا باو بوون، ئاگرپەرستی خەسڵەتی دیاری ناو ئەو دەوڵەتە بوو،[٢] فارس و رۆمەکان بەردەوام لە بەریەککەوتندا بوون و تا سەردەمی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) ئەو بەریەککەوتنەی نێوان ئەو دوو زلهێزە بەردەوام بوو و لە قورئانی پیرۆزدا باسی کراوە.[٣]

---

(١) ابن إسحاق: السيرة النبوية، ج١، ص ٨٤.

(٢) بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی دەوڵەتی ساسانی و دەوڵەتی بیزەنتی، پێویستە بگەڕێنەوە سەر ئەو کتێبە مێژووییانەی تایبەت بە مێژووی ئەو دوو دەوڵەتە نووسراون.

(٣) خوای گەورە دەفەرموێت (غُلِبَتِ الرُّومُ (٢) فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُمْ مِنْ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ (٣) فِي بِضْعِ سِنِينَ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِنْ قَبْلُ وَمِنْ بَعْدُ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ (٤) (سورة الروم: ٢ - ٤) )

### شاری مەککە:

شاری مەککە دەکەوێتە ناو شیوێکەوە کە لە هەموو لایەکەوە بە شاخ دەورە دراوە، شاری مەککە لە زۆر رووەوەوە جۆرێك لە سەربەخۆیی هەبوو، دانیشتوانەکەی زیاتر سەرقاڵی کاری بازرگانی بوون، هەروەها بەخێوکردنی ئاژەڵ و بەشێکی کەمی ئیشی پیشەسازی لە ناو مەککەدا هەبوو.

لەو کاتەدا مەککە مەڵبەندێکی گەورەی بازرگانی بوو، هەروەها لەبەرئەوەی کەعبەی تێدابوو، مەڵبەندێکی گرنگی ئایینیش بوو، هێزێکی ماددی و وزەیەکی رۆحی، هێز و توانایەکی زۆریان دابوو بە مەککە.

هاتنی قوصەی کوڕی کیلاب و کەنارخستنی خوزاعە لە دەسەڵاتدا، خاڵی وەرچەرخان بوو لە باری سیاسی مەککەدا، ئیتر لەوێوە بوو بە قسەڕۆیشتووی ناو مەککەو هەردوو دەسەڵاتی دینی و دنیایی گرتە دەست و کەوتە دابەشکردنی پۆستەکانی ناو مەککە[١] کە بریتی بوون لە (حیجابە و سیقایە و ریفادەو نەدوەو لیوا).[٢]

لە مەککەدا قوڕەیشیەکان بەسەر دوو بەشدا دابەش بووبوون: قوڕەیشی بەطڵاح کە بەنوهاشم و بەنو ئومەییە و بەنومەخزووم و بەنوتیم و بەنی عەددی و چەندێکی تری دەگرتەوە، ئەمانە لە جەرگەی مەککەدا نیشتەجێ بوون و کاروباری مەککە بەدەست ئەمانەوە بوو، قوڕەیشی ضەواهیریش ئەوانە بوون کە

---

(١) ابن هشام: السيرة النبوية، ج١، ص ١١٨.

(٢) حیجابە: سەرپەرشتی کردنی کەعبەی لەخۆدەگرت.

سیقایە: بەرپرسیارێتی ئاودان بە حاجییان.

ریفادە: بەرپرسیارێتی میواندارایکردنی حاجیان.

نەدوە: کۆبوونەوەی قوڕەیشیەکان و راوێژ و بڕیاردان لەسەر پرسە هەستیارەکان.

لیوا: مەبەست پێی هەڵگرتنی ئاڵای سوپا بوو.

لە دەرەوەی مەککە نیشتەجێ بوون و هاوپەیمان و کۆیلەکانیش لەوێ نیشتەجێ بوون و زیاتر ژیانێکی دەشتەکییان دەگوزەراند.[١]

دیارترین دیاردە ناشیرینەکانی ناو کۆمەڵگەی عەرەبی بریتی بوون لە: بتپەرستی، داوێن پیسی، مەی خواردنەوە، سووخواردن، جەنگ و یەکتر کوشتن، زیندەبەچاڵکردنی کچ، کۆرپەکوشتن لە ترسی هەژاری، ستەمکردن، لە جوانترین خەسڵەتەکانیشیان بریتی بوون لە: بەخشندەیی و میوانداری، دلێری و نەبەردی، حەز بە ئازادی و خۆزەلیل نەکردن، پەنادان.

---

(١) ابن الأثير: الكامل في التأريخ، ج١، ص ٦٢٢.

# باسی دووەم

## بەر لە لەدایکبوون

**رەچەڵەکی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم):** رەچەڵەکی پاکی پێغەمبەری خوا کە بە صەحیحی هاتووە بەم چەشنەیە: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵای کوڕی عەبدولموطەلیبی کوڕی هاشیمی کوڕی عەبدمەنافی کوڕی قوصەی کوڕی کیلابی کوڕی موڕڕەی کوڕی کەعبی کوڕی لوئەی کوڕی غالیبی کوڕی فەهری کوڕی مالیکی کوڕی نەضری کوڕی کینانەی کوڕی خوزەیمەی کوڕی مدرکەی کوڕی ئیلیاسی کوڕی موضەری کوڕی نزاری کوڕی مەعدی کوڕی عەدنان.[١]

رەچەڵەکی پاکی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەچێتەوە سەر ئیبراهیم پێغەمبەر، بەڵگەش بۆ ئەوە فەرموودەی پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم) کە دەفەرموێت: (إن الله اصطفى كنانة من ولد إسماعيل ، واصطفى قريشا من كنانة ، واصطفى من قريش بني هاشم، واصطفاني من بني هاشم)[٢] (خوا لەناو نەوەکانی ئیسماعیلدا کینانەی هەڵبژارد، لە کینانەش قوڕیشی هەڵبژارد، لە قورەیشیشدا بەنوهاشیمی هەڵبژارد، لە بەنوهاشیمیشدا منی هەڵبژارد).

---

(١) صحيح البخاري.

(٢) صحيح مسلم، الرقم ٤٣١٨.

هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە چاکترین سەردەمدا نێردراوە، وەك خۆی دەفەرموێت (بعثت من خير قرون بني آدم)،[1] (لە چاکترین سەردەمی ئادەمیزاددا نێردراوم).

دواتر عەبدولموطەلیبی باپیرەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، پۆستی سیقایە و ریفادەی گرتەدەست، لەناو قەومەکەیدا ریز و گەورەییەکی زۆری پەیدا کرد.[2]

پێش لەدایك بوونی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و لە سەردەمی عەبدولموطەلیبدا لە مەککەدا چوار رووداوی گرنگ روویاندا: هەڵکەندنی بیری زەمزەم کە تا ئەمڕۆش ئەو بیرە هەر ماوەو لای موسڵمانان گرنگی تایبەتی هەیە، نەزرەکەی عەبدولموطەلیب، هاوسەرگیری عەبدوڵا و ئامینە، هێرش هێنان بۆ سەر کەعبە.

**یەکەم: بیری زەمزەم:**

وردەکاری ئەم رووداوە لای هەریەك لە فاکیهی و بەیهەقی و ئەبوونوعەیم هاتووەو پوختەکەی ئەوەیە کە عەلی کوڕی ئەبووطالیب باسی دەکات و دەڵێت: عەبدولموطەلیب لە خەویدا پێی وترا بەررە هەڵکەنە، ئەویش پرسیاری کرد بەڕرە چیە؟ خەبەری بوویەوە، جاری دواتر هەمان خەوی دی و ئەمجار وترا مەچنونە هەڵکەنە، ئەویش وتی مەچنوونە چیە؟ خەبەری بوویەوە، جاری دواتر پێی وترا طەیبە هەڵکەنە، بۆ جاری چوارەم پێی وترا زەمزەم هەڵکەنە، ئەویش وتی زەمزەم چیە؟ ئینجا وەسفی بۆ کرا و شوێنەکەی بۆ دیاری کرا، قوڕەیشیەکانی تریش ویستیان پشکیان هەبێت تیایدا و عەبدولموطەلیب رازی نەبوو، داوەری کرا لەنێوانیاندا، دواجار گەورەییەکە بەر عەبدولموطەلیب کەوت، ئیتر خەڵکی بۆ بەرەکەت لەو ئاوەیان دەخواردەوە.[3]

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٣٣٨٥.

(٢) الطبري: تأريخ الأمم و الملوك، ج٢، ص ٢٥٤.

(٣) دلائل النبوة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ٥٢، دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ٢٠.

**دووەم: نەزرەکەی عەبدولموطەلیب:**

عەبدولموطەلیب دە کوڕی هەبوو بە ناوەکانی (حارث، زوبەیر، ئەبوولەهەب، موقەووەم، ضیرار، ئەبووطالیب، جەحل، عەبدولّا، حەمزە، عەبباس)، شەش کچیشی هەبوو بە ناوەکانی (صەفییە، ئوممومحەکیم، عاتیکە، ئومەیمە، ئەروا، بەڕڕە).[١]

عەبدولموطەلیب ئەو کاتەی بیری زەمزەمی هەڵئەکەند و تەنها کوڕێکی هەبوو، نەزری کردبوو ئەگەر خوا دە کوڕی پێ ببەخشێ، یەکێکیان بکاتە قوربانی، جا کە خوا دە کوڕەکەی پێ بەخشی، بڕیاری دا نەزرەکەی جێبەجێ بکات ناوی هەموویانی خستە تیروپشك و ناوی عەبدولّا دەرچوو تا بیکاتە قوربانی، بەڵام ئەو عەبدولّای لە هەموویان لا خۆشەویستتر بوو، ویستی عەبدولّا بکاتە قوربانی، قوڕەیش ڕێیان نەدا، وتیان بڕۆ پرسیار لە شارەزایەك بکە، ئەویش پرسیاری لە عەرافێ کرد، عەرافەکە وتی خوێن بابییەکی ناوچەکەی خۆتان چەندە ئەوە لەگەڵ عەبدولّا بخەرە تیروپشك، خوێن بابییەکەش دە وشتر بوو، کەچی هەمدی عەبدولّا دەرچوو، وتی دەی بیکە بە بیست وشتر، کەچی هەر ناوی عەبدولّا دەرچوو هەتا گەیشتە سەد وشتر، ئەوکات سەد وشترەکە دەرچوو، عەبدولموطەلیب دڵی ئاوی نەئەخواردەوە، سێ جار ئەو تیروپشکەی دووبارە کردەوەو هەموو جارەکان سەد وشترەکە دەرچوو، ئینجا سەد وشترەکە سەربڕان.[٢]

**سێیەم: هاوسەرگیری عەبدولّا و ئامینە:**

عەبدولّای کوڕی عەبدولموطەلیب لەگەڵ ئامینەی کچی وەهبی کوڕی عەبدمەنافدا هاوسەرگیری کرد،[٣] دوای هاوسەرگیریەکە، کاتێك ئامینە سکی هەبوو بە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم)، عەبدولّا بۆ کاری بازرگانی چوو بۆ شام و لەوبەرەوە کە گەڕایەوە لە یەثریب لایدا، لەبەرئەوەی نەخۆش بوو

---

(١) ابن هشام: السيرة النبوية، ص ٤٣.

(٢) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج١، ص ٨٨-٨٩.

(٣) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج١، ص ٩٥.

وتی لێرە لای ماڵە خاڵوانم لائەدەم، لەویێ مایەوەو ماوەی مانگێك نەخۆش کەوت، هەر لەویێ بەهۆی نەخۆشیەکەیەوە وەفاتی کرد و هەر لەوێش ئەسپەردە کرا، بۆیە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە هەتیوی لەدایك بوو.[1]

## چوارەم: ڕووداوی فیل:

ئەبرەهەی ئەشرەم کە کاربەدەستی نەججاشی بوو لە یەمەن، لە شاری صەنعائدا کڵێسایەکی گەورەی دروست کرد و ناوی نا قوللەیس، پاشان هەواڵی دا بە نەججاشی و رایگەیاند دەبێت وا بکات کەعبە لەبەرچاوی خەڵك بخات و هەموان بەرەو قوللەیس بێن،[2] کابرایەکی عەرەبیش کە لەویێ بوو و هەواڵەکەس بیست، زۆر دڵگران بوو و وەك پەرچەکردارێك چوو لە تاریکایی شەودا پیسایی دا لە قیبلەی کڵێساکەو ناو کڵێساکەشی پیس کرد، ئەبرەهەش بەوە تووڕە بوو و سوێندی خوارد دەبێت بچێت کەعبە بڕووخێنێت، سوپایەکی گەورە و نزیکەی نۆ یان سیانزە فیلی لەگەڵ خۆی برد، خەڵکێکی زۆر لە عەرەبەکانی یەمەن و شوێنانی تر بەرەنگاری بوونەوە، بەڵام هەموویانی دەکوشت و سەرکردەکانی بەدیل دەگرت، کە نزیکی مەککە بوونەوە، ئەبرەهە فەرمانی کرد هەڵکوتنە سەر ماڵ و سامانی خەڵکی و لەو نێوەندەدا دووسەد وشتری عەبدولموطەلیب دەستیان بەسەردا گیرا، خەڵکی مەککە ویستیان بەرەنگاری ئەبرەهە ببنەوە، بەڵام زانییان دەرەقەتی نایەن، ئەبرەهە هەواڵی نارد بۆ عەبدولموطەلیب کە ئەو بۆ جەنگی مەککە نەهاتووە، تەنها هاتووە کەعبە بڕووخێنێت، ئەگەر بەرەنگاری نەبنەوە وازیان لێ دێنێ، عەبدولموطەلیبیش وتی ئێمە توانای بەرەنگاربوونەوەی ئەومان نیەو ئەوەش ماڵی خوایە و خوا بیەوێت بیپارێزێت ڕێی پێ نادات و ڕێیش بدات ئەبرەهە بیڕووخێنێت ئێمە هیچ توانایەکمان نیە، عەبدولموطەلیب چوو بۆ لای ئەبرەهەو داوای دووسەد وشترەکەی خۆی کرد، ئەبرەهە سەری سوڕما لەو داواکاریەی و وتی بۆ وشترەکانت باکت نیە بە ڕووخاندنی ماڵێ کە ئایینی خۆت و باوباپیرانتە؟ ئەویش وتی من خاوەنی ئەو

---

(١) ابن سعد: الطبقات الکبری، ج١، ص ٩٩.

(٢) ابن کثیر: البدایة والنهایة، ج٢، ص ١٧٠.

وشترانەم، بەیتیش خاوەنێکی هەیە کە بەرگری لێ دەکات، عەبدولموطەلیب کە وشترەکانی وەرگرتەوە هەموویانی کرد بە قوربانی و فەرمانی کرد دوای ئەوە خەڵکەکە لە مەککە بچنە دەرەوە، ئەبرەهەش کەوتەڕێ بەرەو ناو مەککە، لە دۆڵی موحەسسیر لەنێوان مینا و موزدەلیفەدا فیلەکەی وەستا و نەئەڕۆیشت، هەرچەند لێیاندا کەچی نەئەڕۆیشت، لەو کاتەدا خوای گەورە چەند پۆلە باڵندەیەکی نارد کە هەرکامیان سێ بەردی پێ بوو، بەردێ بە دەنووك و دوو بەرد بە هەر دوو قاچی، بەردەکانیش هێندەی زیخێ یان نیسکێ ئەبوون، بەر هەرکەس بکەوتنیایە لەناویان ئەبرد، سوپاکە دەستیان کرد بە پاشەکشە و راکردن و ژمارەیەکی زۆریان لەناوچوون،[١] خوای گەورە ئەبرەهەشی تووشی دەردێ کرد کە سەری پەنجەکانی هەڵئەوەری و بە خراپترین شێوە مرد.[٢]

خوای گەورە لە قورئاندا بەم شێوازە ئەو رووداوەی باسکردووە:

﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَٰبِ ٱلْفِيلِ ﴿١﴾ أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِى تَضْلِيلٍ ﴿٢﴾ وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ﴿٣﴾ تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍۭ ﴿٥﴾﴾ (الفيل)

(ئایا ئەو دەنگ و باسەت پێ نەگەیی و نەتدی کە خوای پەروەردگاری تۆ بە خاوەن فیلەکان چی کرد؟ ئەرێ مەگەر سەری لێ نەشێواندن و فرت و فێڵەکەیانی پوچەڵ نەکردەوە..؟! کۆمەڵێکی زۆرو پۆل پۆل باڵندەی نەناردە سەریان؟ تا بە بەردی گڵمتی ڕەق بەردە بارانیان بکەن، دەرەنجام وەك کای خوراوی لێکردن و ڕێزە بەڕێزە بوون).

هەرچەندە ئەبرەهە و شوێنکەوتەکانی سەر بە ئایینی مەسیحیەت بوون و ئایینەکەشیان باشتر بوو لە ئایینداری بتپەرستانی مەککە، بەڵام لەبەرئەوەی هێرشەکە بۆ سەر کەعبە بوو، خوای گەورە بەو شێوەیە سزای دان.[٣]

---

(١) ابن إسحاق: السيرة النبوية، ص ٦١-٦٤.

(٢) کۆی بەسەرهاتەکە لە البداية والنهاية ج٢، ص ١٧٠-١٧٣ دا هاتووە.

(٣) ابن قيم الجوزية: زاد المعاد في هدي خير العباد، ج١، ص٧٦.

# باسی سێیەم

## لە لەدایکبوونەوە تا دابەزینی وەحی

**لەدایکبوونی:** پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە رۆژی دووشەممە[١] دوانزەی مانگی رەبیعولئەووەل[٢] و لە ساڵی فیل[٣] لە مەککە[٤] و بە هەتیوی لەدایك بوو،[٥] کاتێك دایکی لە سکیدا هەڵیگرتبوو خەوی بینی کە رووناکیەکی لێوە دەرچوو بوصرای بۆ رووناك کردەوە.[٦]

**دایەنیی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم):** جگە لە دایکی، هەریەك لە ثوەیبە[٧] و حەلیمەتوسەعدیەش دایەنییان کردووە، عەبدولموطەلیبی باپیرەی بڕیاری دا لە دەرەوەی شاری مەککە دایەن بۆ موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) پەیدا بکات، چونکە ئەوکات لەناو عەرەبدا ئەو نەریتە هەبوو، ئەگەرچی چوونی پێغەمبەری

---

(١) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢١٩٤٩، صحيح مسلم، الرقم ٢٠٥٢.

(٢) السيرة النبوية لابن كثير، ج١، ص ١٩٩.

(٣) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٧٥٦١، سنن الترمذي، الرقم ٣٦٣٩، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤١٢٠ و وافقه الذهبي.

(٤) ابن قيم الجوزية: زاد المعاد في هدي خير العباد، ج١، ص ٧٦.

(٥) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج١، ص ٩٩.

(٦) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤١١٤، صححه الذهبي في التلخيص.

(٧) صحيح البخاري، الرقم ٤٨١٣، صحيح مسلم، الرقم ٢٧٠٤.

خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆ دەرەوەی مەککە بۆ لای حەلیمەتوسەعدیە سەلمێنراوە، بەڵام شێوازی چوونەکەی و بەسەرهاتەکەی کە هاتووە سەنەدەکەی مونقەطیعە[١] و ئیبن حیببان لە صەحیحەکەیدا هێناویەتی.[٢]

**لەتکردنی سنگی:** لەو کاتەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لای حەلیمەتوسەعدیە بوو، جیبریل هات بۆ لای موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) و لەو کاتەدا موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ منداڵاندا یاری دەکرد، جیبریل موحەممەدی خست و سەرسنگی هەڵدری و دڵی دەرهێنا و پارچە خوێنێکی مەییوی لێ دەرکرد و فەرمووی ئەوە پشکی شەیتانە لە تۆدا، ئینجا لە تەشتێکی زێڕدا بە ئاوی زەمزەم شۆردی و دواتر گوشی و ئینجا خستیەوە شوێنی خۆی، منداڵەکان رایانکرد بۆ لای دایکیان وتیان موحەممەدیان کوشت، کە هەموان هاتن دەبینن موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) رەنگی گۆڕاوە،[٣] ئەنەس کە نزیکەی دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) دەکرد[٤] دەیوت شوێنەواری دوورینەوەکەم لەسەر سنگیدا دەبینی.[٥]

موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە بۆ دایەنەکەی و ئەویش ترسا موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) عەقڵی تێك چووبێت، بۆیە بردیەوە بۆ لای دایکی، بەسەرهاتەکەشی بۆ گێڕایەوە، بەڵام ئامینەی دایکی هیچ لەو بەسەرهاتە نەترسا.[٦]

---

(١) سەنەدی مونقەتیع ئەوەیە کە پچڕانێ لە سەنەدەکەدا هەبێ، بۆ نموونە کەسێك لەنێو ریزبەندی سەنەدەکەدا دیار نەبێت.

(٢) صحيح ابن حبان، الرقم ٦٤٢٦، دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ٤٤، قال شعيب الأرناؤوط في سنده إنقطاع.

(٣) صحيح مسلم، الرقم ٢٦٢، صحيح ابن حبان، الرقم ٦٤٢٥.

(٤) صحيح البخاري، الرقم ٤٨٦٩.

(٥) صحيح مسلم، الرقم ٢٦٢، صحيح ابن حبان، الرقم ٦٤٢٥.

(٦) مسند احمد بن حنبل، الرقم ١٧٣١٤، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤١٧١ وقال على شرط مسلم و وافقه الذهبي.

باسی لەتکردنی سنگی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سێ جاری تر لە سیرەدا هاتووە، دوانیان سەنەدیان لاوازە[١] و سێیەمیان بە صەحیحی هاتووە کە ئەویش شەوی ئیسراو میعراج بوو.[٢]

هەروەها مۆری پێغەمبەرایەتی کە لە پشتەوە لەنێوان دوو شانی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) بوو،[٣] لە کاتی لەدایکبوونیەوە پێوەی نەبوو، بەڵکو لە یەکەم لەتکردنی سنگیەوە بوو.[٤]

**مـردنی دایکـی:** کاتێك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تەمەنی گەیشتە شەش ساڵان لەگەڵ ئامینەی دایکیدا چوون بۆ یەثریب بۆ سەردانی ماڵەخاڵۆانی لە بەنی عەدی، لەکاتی گەڕانەوەیان بەرەو مەککە، ئامینەی دایکی لە ناوچەی ئەبوائدا وەفاتی کرد، ئیتر دوای ئەوە موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ عەبدولموطەلیبی باپیرەی دەژیا.[٥]

زۆری نەخایاند دوای دوو ساڵ واتە لە تەمەنی هەشت ساڵی موحەممەددا (صلی الله علیه وسلم) باپیرەشی وەفاتی کرد، ئینجا ئەبووطالیبی مامی بەرپرسیارێتی بەخێوکردن و سەرپەرشتی موحەممەدی (صلی الله علیه وسلم) گرتەئەستۆ.[٦]

**گەشت بەرەو شام:** ئەبووطالیب هاودەم بە ژمارەیەك لە پیاوماقوڵان و گەورەکانی قورەیش سەفەرێکی کرد بەرەو شام و پێغەمبەریشی (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ خۆی برد، لە نیوەی رێدا رێیان کەوتە لای راهیبێك، لەوێ لایاندا و

---

(١) یەکەمیان لە مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٠٧١٦، هاتووەو باس لەوە دەکات لە تەمەنی دە ساڵیدا بووە، شوعەیب ئەرنائووگ سەنەدەکەی بە لاواز داناوە، سێیەمیان لە کاتی دابەزینی وەحیدا هاتووەو لە مسند إسحاق بن راهوية، الرقم ١٥٠٥ دا هاتووە.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ١٥٦٥، صحيح مسلم، الرقم ٢٦٣.

(٣) صحيح مسلم، الرقم ٤٤٣١.

(٤) ابن حجر: فتح الباري شرح صحيح البخاري، ج٦، ص ٥٦١.

(٥) ابن هشام: السيرة النبوية، ج١، ص ٣٠٥-٣٠٦.

(٦) ابن هشام: السيرة النبوية، ج١، ص ٣٠٦ و ٣١٨.

ڕاهیبەکەش پێچەوانەی هەموو جارێکی تر هات سەردانی ئەم کاروانەی کرد و دەستی پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) گرت و وتی ئەمە گەورەی جیهانیانە و خوا وەك ڕەحمەت بۆ جیهانیان دەینێرێت، هەندێ لە قوڕەیشیەکان پێیان وت تۆ چووزانیت؟ ئەویش وتی کاتێ دەرکەوتن چی دار و بەرد هەبوو سوجدەیان دەبرد، داروبەردیش تەنها سوجدە بۆ پێغەمبەر دەبەن، هەروەها بە مۆری پێغەمبەرایەتیەکەشیدا دەیناسمەوە کە لە پشتە شانیەوە جێگەکەی هێندەی سێوێ دەبێت، ئینجا خوانێکی ئامادە کرد بۆیان، هەموان چوون و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لای وشترەکان مایەوە، ڕاهیبەکە وتی بنێرن بە شوێنیدا، ئەویش کە هات هەورێ سێبەری بۆ دەکرد، کە نزیك بویەوە سەیری کرد خەڵکەکە سێبەری دارەکەیان گرتەوە، کە دانیشت سێبەری دارەکە کەوت بە لای پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم)، ڕاهیبەکە وتی بڕاونن بۆ سێبەرەکە چۆن بەرەو لای ئەو کەج بوو، پاشان داوای لێکردن پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەبەن بۆ ناو ڕۆم، چونکە ئەگەر بیبەن دەیناسنەوەو دەیکوژن، لەو کاتەدا حەوت کەس لە ڕۆمەوە هاتن، ڕاهیبەکە چوو بۆ لایان و وتی بۆچی هاتون؟ وتیان هاتوین دەزانین ئەو پێغەمبەرە لەم مانگەدا دەرچووە، بۆ هەرچی شوێن هەیە خەڵکێ نێردراوەو ئێمەش نێردراوین بۆ ئێرە، وتی کەسی تر لە ئێوە باشتر ماوە بێت؟ وتیان ئێمە بیستوومانە لەم ڕێگەی تۆوە دێت بۆیە هاتوین، ئەویش وتی باشە شتێ خوا بیەوێت بیکات کەس دەتوانێت ڕێی لێ بگرێت؟ وتیان نا، ئەوانیش بەیعەتیان پێ دا و لەلای مانەوە، ڕاهیبەکە بە قوڕەیشیەکانی وت کامتان سەرپەرشتیاریەتی؟ وتیان ئەبووطالیب، ئەویش زۆر تکای لێکرد، ئەبووطالیبیش ناردیەوە بۆ مەککە.[1]

ئەم بەسەرهاتەش نەسەلمێنراوەو خیلافی لەسەرە و ئیمامی ژەهەبی پێی وایە ڕووداوی وا ڕووینەداوەو ڕەخنە لە ڕووداوەکانی ناو بەسەرهاتەکە دەگرێت و بە

---

(١) سنن الترمذي، الرقم ٣٦٤٠ و قال حسن غريب، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤١٧٠ و قال على شرط الشيخين، قال الذهبي أظنه موضوعا فبعضه باطل، قال ابن حجر في الإصابة ج١، ص ٣٥٣ رجاله ثقات، صححه الألباني بلا ذكر بلال فيه.

هەڵبەستراوی دەبینێت، بەڵام هەریەك لە حاكم و ئیبن حەجەر و ئیبن كەپیر و ئەلبانیش بە صەحیحیان داناوە بەبێ باسكردنی بیلال لە بەسەرهاتەكەدا.

**جەنگی فیجار:** سەبارەت بە بەشداری پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە جەنگی فیجاردا هیچ بەڵگەیەكی صەحیح نیە لەسەر بەشداریكردنی، بەسەرهاتەكەش ئەوەیە كە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە تەمەنی چواردە یان پانزەساڵیدا بەشداری كرد لە جەنگێ كە لەنێوان قورەیش و هاوپەیمانانی بەرامبەر قەیس عەیلان رویدا و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هاودەم بە مامەكانی بەشداری كرد و تیری بۆ مامەكانی كۆدەكردەوەو دەیدایە دەستیان.[١]

**شـــوانێتـی:** ئەبووطالیب كەسێكی نەدار بوو،[٢] بۆیە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بڕیاری دا كاری شوانێتی بكات، شوانێتی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) بە بەڵگەی صەحیح سەلمێنراوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت (خوای گەورە هەر پێغەمبەرێكی ناردووە، - ئەو پێغەمبەرە - شوانێتی مەڕو ماڵاتی كردووە) هاوەڵان وتیان تۆیش؟ فەرمووی (بەڵێ، من لە بەرامبەر چەند قیراتێ مەڕو ماڵاتم دەلەوەڕاند بۆ خەڵكی مەككە).[٣]

**پـاراسـتنی لە تـاوان:** خوای گەورە پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) پاراستووە لە لادان و ئارەزووبازی گەنجێتی كە زۆر كەس دووچاری دەبێت، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەسەرهاتی كاتی شوانێتی خۆیمان بۆ دەگێڕێتەوە كە چۆن دوو جار خوا پاراستوویەتی لە گەمەو رابواردن و دەفەرموێت: (ئەو نیەت و حەزەی خەڵكی سەردەمی نەفامی هەیانبوو من هەرگیز نیەتیم نەبووە تەنها دوو جار نەبێ كە هەردوو جارەكە خوا پاراستمی،

---

(١) ابن هشام: السيرة النبوية، ج١، ص ٣٢٤-٣٢٦.

(٢) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج١، ص ١١٩.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ٢١٦٥، سنن ابن ماجة، الرقم ٢١٤٦.

شەوێك گەنجێكی قورەیشیم لەگەڵ بوو لە سەرووی مەككەوە لای بڕێ مەڕو ماڵاتی خۆمان بووین، پێم وت ئاگات لەم مەڕانەم بێت تا ئەمشەو وەك گەنجانی مەككە دەمەتەقێی شەو بەسەر بەرم، وتی باشە، منیش ڕۆیشتم، كە نزیك بوومەوە لە یەكەم ماڵی دەوروبەری مەككە گوێم لە گۆرانی و دەنگی دەف و مۆسیقا بوو، وتم ئەمە چیە؟ وتیان فلانە كەس فلانە ئافرەتی بەهاوسەر گرتووە، حەزم لە گۆرانیەكە و ئەو دەنگە بوو، كەچی چاوم بۆ خەو قورس بوو و خەوم لێكەوت و بە تیشكی خۆر بەخەبەر هاتم، گەڕامەوە بۆ لای هاوەڵەكەم، وتی چیت كرد؟ منیش بەسەرهاتەكەم بۆ باس كرد، شەوێكی تر هەمان شتم كرد و هەمان دەنگ و ئاوازم بیست و هەمان شتم پێ وتراو ئەو جارەش خەوم لێكەوت هەتا تیشكی خۆر بەخەبەری كردمەوە .. سوێند بەخوا دوای ئەو دوو جارە هیچ حەز و نیەتی ئەو بەزمانەم نەبوو كە خەڵكی سەردەمی جاهیلی هەیانبوو هەتا خوا بە پێغەمبەرایەتی خۆی ڕێزداری كردم).[١]

**حیلفی موطەییەبین:** پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) باس لە بەشداریكردنی خۆی دەكات لە هاوپەیمانێتیەك كە بە موگهییەبین ناوی دەبات، هەمان ئەو پەیمانەیە كە بە (فضول) ناسراوە، دەفەرموێت (بەشداری هاوپەیمانی موطەییەبینم كرد لەگەڵ مامەكانم و ئەوكات هێشتا مێردمنداڵ بووم، پێم خۆش نیە چی سوورە وشتر[٢] هەیە بیدەن بە من بەرامبەر بەوەی ئەو پەیمانە بشكێنم).[٣]

بازرگانی بۆ خەدیجە و هاوسەرگیریەكەیان: لەناو مەككەدا ئافرەتێك هەبوو بە ناوی خەدیجەی كچی خوەیلیدی ئەسەدی،[٤] خەدیجە لەناو هۆزەكەیدا زۆر

---

(١) صحيح ابن حبان، الرقم ٦٣٦٣، حسنه شعيب الأرناؤوط، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٧٦٨٧ و صححه و وافقه الذهبي.

(٢) سوورە وشتر یان وشتری سوور بە بەهاترین جۆری وشتری ئەوكات بووەو بۆ گرانی و گرنگیەكەی بە نموونە هێنراوەتەوە.

(٣) مسند احمد بن حنبل، الرقم ١٥٩٢، صححه الألباني و شعيب الأرناؤوط، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٢٨٠٤ و صححه ووافقه الذهبي.

(٤) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٠.

ناسراو بوو، چونکە هەم لە خێزانێکی ناسراو بوو، هەم سامانێکی زۆر زۆری هەبوو و هەموان حەزیان دەکرد ئەو ئافرەتە بخوازن،[١] خەدیجە هێندە بە پاکداوێن ناسرابوو کە لەناو هۆزەکەیدا بە ئافرەتە پاکەکە ناوی دەرچووبوو.[٢]

خەدیجە سامانێکی زۆری هەبوو، بۆیە داوای لە پیاوانێکی شارەزا دەکرد تا کاری بازرگانی بۆ بکەن، بەرامبەر بەوە بڕێك قازانجی دەدا پێیان، جا کاتێك راستگۆیی و دەستپاکی پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) بیست، بڕیاریدا لەگەڵ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) مامەڵە بکات،[٣] بۆیە داوای کرد لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تا کاری بازرگانی بۆ بکات، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) رازی بوو، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ مەیسەرەی مەولای خەدیجەدا چوو بۆ شام تا کاری بازرگانی بکات بۆ خەدیجە، کە گەیشتنە شام پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە ژێر سێبەری دارێکدا دانیشت، کابرایەکی راهیب ئەوی بینی، بە مەیسەرەی وت ئەم کابرایە کێیە؟ ئەویش وتی کەسێکی قوڕەیشیە، راهیبەکە وتی تەنها پێغەمبەران لەژێر سێبەری ئەم دارەدا دانیشتون، ئینجا وتی ئایا سوورایییەك لەنێوچاوانیدا هەیە؟ مەیسەرە وتی بەڵێ، راهیبەکە وتی دەی هەرگیز لێی جیا مەبەرەوە، ئەە کۆتای پێغەمبەرانە و خۆزگە منیش دەگەیشتمە کاتی پێغەمبەرایەتیەکەی، ئینجا کە هاتنەوە خەدیجە قازانجی زۆر زۆری دەکرد لەو کارەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، هەروەها مەیسەرە ئەو قسەی راهیبەکەشی بۆ خەدیجە گێڕایەوە،[٤] ئەوەبوو دڵی چوویە سەر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و پێشنیازی خۆی کرد بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تا ببێتە هاوسەری.[٥]

---

(١) ابن سعد: الطبقات الکبری، ج١، ص ١٣١.

(٢) ابن سعد: الطبقات الکبری، ج٨، ص ١٥.

(٣) ابن الأثیر: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٧، ص ٩٠.

(٤) دلائل النبوة لأبي نعیم الأصبهاني، الرقم ١٠٦.

(٥) الذهبي: سیر أعلام النبلاء، ج٢، ص ١١٤.

سەبارەت بە جۆری پێ وتنەکە بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چەند گێڕانەوەیەك هاتووە، لەوانە گێڕانەوەکەی عەمماری کوڕی یاسر[١] و گێڕانەوەکەی نەفیسە.[٢]

دەقێکی روونی صەحیح نیە سەبارەت بە تەمەنی خەدیجەی کچی خوەیلید لە کاتی هاوسەرگیری لەگەڵ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، بەڵام:

**یەکەم:** تەمەنی خەدیجە چل ساڵان نەبووە، چونکە ئافرەت لە تەمەنی چل ساڵ بە دواوە ئەگەری منداڵ بوونی زۆر کەم دەکات، چ جای ئەوەی چەند منداڵێکی ببێت، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) پاش پانزە ساڵ لەو هاوسەرگیریە ئینجا بوو بە پێغەمبەر تا بڵێین موعجیزەیەکی خودایی بوو بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و هیچ دەقێکیش لەو بارەوە نیە.

**دووەم:** دیارە خەدیجە زۆر گەنجیش نەبووەو تەمەنی هەبووە، ئەمەش بەپێی ئەو دەقەی کە عائیشە دەڵێت: کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) زۆر باسی خەدیجەی دەکرد دەموت چیە هێندە باسی ئەو پیرەژنە قورەیشیە دەکەیت،[٣] هەروەها لەبەرئەوەی پێشتر دوو جار شووی کردووەو دوو منداڵیشی هەبووە.

**سێیەم:** ئەگەر تەماشا بکەین لە سەرچاوەکاندا چوار تەمەن هاتووە(**٢٥**،[٤] **٢٨**،[٥] **٣٥**،[٦] **٤٠**،[٧])، کەچی ئەوەی چل ساڵەکە زەق کراوەتەوە.

---

(١) السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٢٨٤٠، ابن كثير: البداية والنهاية، ج٢، ص ٢٩٥-٢٩٦.

(٢) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٢.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ٣٦٣٣.

(٤) البداية والنهاية لابن كثير، ج٢، ص ٢٩٥.

(٥) سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١١١.

(٦) البداية والنهاية لابن كثير، ج٢، ص ٢٩٥.

(٧) سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١١١.

کاتێك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ خەدیجەدا هاوسەرگیری کرد لە ماڵی خەدیجەدا نیشتەجێ بوو و خەدیجەش هەموو منداڵەکانی لەو ماڵەدا لەدایکبوون و خۆیشی هەر لەو ماڵەدا وەفاتی کرد و پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) تا کاتێ کۆچی کرد بۆ مەدینە هەر لەوێ مایەوە.[١]

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە خەدیجە چەند منداڵێکی هەبوو بە ناوەکانی (قاسم، عەبدوڵا، روقییە، زەینەب، ئومموکلثوم، فاطیمە)،[٢] قاسم بە منداڵی مرد، عەبدوڵا دوای هاتنی وەحی لەدایك بوو و بە منداڵیش مرد، بۆیە بێباوەڕەکان دەیانوت موحەممەد وەجاخ کوێرە، خوای گەورە وەڵامی دانەوە (إن شانئك هو الأبتر) (نەیارانی تۆ وەجاخ کوێرن)، چوار کچەکەشی موسڵمان بوون و بە موسڵمانی وەفاتیان کرد، جگە لە فاطیمە ئەوانی تر پێش باوکیان وەفاتیان کرد.

**بنیادنانەوەی کەعبە:** خوای گەورە کەعبەی بە یەکەم ماڵی پەرستشی سەر زەوی باسکردووە:

﴿ إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ ﴿٩٦﴾ ﴾[٣]

(بەراستیی یەکەمین (ماڵ) بۆ مەردم سازکرا لەرووی زەوییدا تا لەخواپەرستییدا رووی تێبکەن، ئەوماڵەیە لەمەککەدایە، جێگایەکی زۆر پیرۆزو پڕ لەخێروو سەرچاوەی ژیانە، نیشانگەی خواناسینە بۆهەموو خەڵکی جیهان).

جا کاتێك کەعبە نۆژەن کرایەوە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) هاودەم بە عەبباسی مامی بەشداری تێدا کرد و بەردیان دەگواستەوە،[٤] پێغەمبەری

---

(١) الفاكهي: أخبار مكة، ج٤، ص ٧.

(٢) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٢، ص ٢٩٤.

(٣) آل عمران: ٩٦.

(٤) صحيح البخاري، الرقم ١٥١٥، صحيح ابن حبان، الرقم ١٦٢٢،

خوا (صلی الله علیه وسلم) لەو کاتەدا تەمەنی (٣٥) ساڵان بوو، هەر تیرەیەکی قورەیش بەشێکی بنیادنانەوەکەیان لە ئەستۆ بوو،[١] مایەوە سەر دانانەوەی بەردەڕەشەکە کە لەسەر ئەوە ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوە و نەوینە چەك بۆ یەکتری، دواجار وتیان یەکەم کەس کێ هاتە ژوورەوە با ئەوە داوەری بکات، ئەوەبوو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هاتەژوورەوەو هەموان وتیان ئەمە ئەمین و دەستپاکە ئەمە موحەممەدە، مەسەلەکەیان بۆ باسکرد و ئەویش پارچە قوماشێکی راخست و بەردەکە خرایە ناوی و هەر تیرەیەك و چمکێکی قوماشەکەیان هەڵگرت و بەرزیان کردەوەو پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) بەردەکەی خستەوە شوێنی خۆی.[٢]

---

(١) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ١٣.

(٢) المستدرك على الصحيحين، الرقم ١٦٢٢ و قال على شرط مسلم، ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ١٨-١٩.

# باسی یەکەم

## پێغەمبەرایەتی و وەحی

ئەرکی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چی بوو؟ خوای گەورە پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) نارد هەتا چەند ئەرکێ بەجێ بگەیەنێ، لەوانە:

**یەکەم:** وەك سەرجەم پێغەمبەرانی پێشوو پەیامی یەکخواپەرستی بە خەڵکی بگەیەنێ و مرۆڤایەتی هۆشیار بکاتەوە لە مەسەلەی شیرك و فرەخودایی.

**دووەم:** ببێتە رەحمەت بۆ جیهانیان ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧﴾،[١] (ئێمە هەر بۆیە تۆمان نارد کە ڕەحمەت و بەزەیی و میهرەبانییەك بیت بۆ هەموو جیهانیان).

**سێیەم:** هەتا چاکترین و جوانترینی رەوشتەکان بە لووتکە بگەیەنێت، وەك خۆی دەفەرموێت (إنما بعثت لأتمم صالح الاخلاق)،[٢] (من نێردراوم هەتا چاکترینی رەوشتەکان بە لووتکە بگەیەنم).

**چوارەم:** هەتا ئەرکی پێغەمبەرانی پێشوو بە کۆتا قۆناغ بگەیەنێ و ئەوەی ماوە بەجێی بگەیەنێ، وەك خۆی دەفەرموێت (نموونەی من و پێغەمبەرانی

---

(١) الأنبياء: ١٠٧.

(٢) مسند احمد بن حنبل، الرقم ٨٧٤٩، صححه الألباني و شعيب الأرناؤوط، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤١٦٢ وصححه و وافقه الذهبي.

پێش خۆم وەك پیاوێ وایە خانوویەکی بە چاکترین و جوانترین شێوە بنیاد نابێت، تەنها شوێن خشتێ لە سووچێکەوە مابێت، خەڵکی بە دەوریدا بسووڕێنەوەو پێی سەرسام بن و بڵێن خۆزگە ئەو خشتەشی دابنایە، جا من ئەو خشتەم و من سەرمۆر و کۆتای پێغەمبەرانم)،[1] ئیتر لەم خاڵەدا هەموو خاڵەکانی تری رێنموونی و روونکردنەوەی مەسەلەکان و بەرپاکردنی دادپەروەری و چەندین مەسەلەی تر کۆدەبنەوە.

**ئامادەکاریەکانی پێش وەحی:** پێش ئەوەی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) ببێت بە پێغەمبەر، خوای گەورە ئەوی لە پەرستشی بتەکان و تاوانەکانی ناو قوڕەیش پاراستبوو، وەك پێشتر باسمان کرد دوو جار نیەتی گەمەو گاڵتەی گەنجانی هەبوو هەردوو جارەکە خوا پاراستی، هەروەها بۆ پەرستشی بتەکانیش پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو (ئەی خەدیجە، بەخوا من لات ناپەرستم، بەخوا هەرگیز عوززا ناپەرستم)،[2] هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) شیعری لەبەرچاو بێزرابوو بۆ ئەوەی شیعر نەڵێت، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَمَا عَلَّمْنَٰهُ ٱلشِّعْرَ وَمَا يَنۢبَغِى لَهُۥٓ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْءَانٌ مُّبِينٌ ﴿٦٩﴾﴾[3]

(ئێمە هەرگیز شیعرو هۆنراوەمان فێری موحەممەد نەکردووەو، هۆنراوە وتنیش شیاوی ئەو نیە، ئەوەیش کە ئەو دەیڵێ هەر پەندو ئامۆژگاریی و، قورئانێکی ڕوون و ئاشکرایە)، جا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە پێش پێغەمبەرایەتیدا پارێزراو بوو لە زینا و ناپاکی و درۆ و سەرخۆشی و بتپەرستی و زمان پیسی و داوێن بەدیارخستن و هەر ئاکارێکی تری ناشیرین،[4] هەروەها

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٣٣٦٣، صحيح مسلم، الرقم ٤٣٣٨.

(٢) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٧٦١٧، صححه شعيب الأرناؤوط.

(٣) يس: ٦٩.

(٤) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج١، ص ١٣١.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەناو قورەیشدا ناسرابوو بە دەستپاك[١] و راستگۆ، قورەیشیەکان دەیانوت درۆمان لە تۆ ئەزموون نەکردووە،[٢] هاوکات پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گرنگیەکی زۆری دەدا بە خزمایەتی و پاڵپشتی بێنەوا و هەژاران و نەداران بوو، رێزی زۆری میوانی دەگرت،[٣] جا هەموو ئەم پاراستن و پاك راگرتنانە ئامادەکاری پێشوەختە بوون لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەتا وەحی بۆ دابەزێنێت.

هاوکات پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خۆی ئاگادار نەبوو بەم ئامادەسازییانەو رۆژێ لە رۆژان چاوەڕێی پێغەمبەربوونی نەدەکرد، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ وَلَٰكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِ مَن نَّشَاءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾﴾[٤]

(هەر وەك بۆ پەیامبەرانی پێشین وەحیمان کرد، ئاوایش ئەم قورئانەمان بۆ تۆ وەحی کرد، بە بڕیارو فەرمانی خۆمان و، رۆح و گیان و ئەقڵ دەژێنێتەوە تۆ لە پێش وەحی نەتئەزانی کتێب و بڕوا چیە؟ بەڵام ئێمە ئەو قورئانەمان کردە نوورو رووناکییەك، تا بە هۆی ئەوەوە هەرکەسێکمان بوێت لە بەندەکانمان رێنوومایی بکەین، کەوابوو چ قورئان، چ بڕوا هەردوو بەهرەی خوان بێگومان تۆ ئەی موحەممەد! بۆ رێگەیەکی راست خەڵکی رێنوێنی دەکەیت)، هەروەها دەفەرموێت:

﴿وَمَا كُنتَ تَرْجُو أَن يُلْقَىٰ إِلَيْكَ الْكِتَابُ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرًا لِّلْكَافِرِينَ ﴿٨٦﴾﴾[٥]

---

(١) المستدرك على الصحيحين، الرقم ١٦٢٢ و قال على شرط مسلم.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٤٦٩١، صحيح مسلم، الرقم ٣٣٣.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ٣، صحيح مسلم، الرقم ٢٥٧.

(٤) الشورى: ٥٢.

(٥) القصص: ٨٦.

(تۆیش ئەی موحەممەد هەرگیز بەتەمای ئەم قورئانە نەبوویت بۆت بنێردرێ، بەڵام ڕەحمەتی پەروەردگاری تۆ وای خواست، سا تۆش هەرگیز پشتیوانی لە کافرو بێ بڕوایان مەکە).

هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) خوێندنەوەی نەبوو بۆ کتێبە ئاسمانیەکانی تر، بەڵکو نەخوێندەوار بوو، ئەوەش وەڵامی گومانی ئەوانە دەداتەوە کە دەڵێن پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئیسلامی لە خوێندنەوەی ئایینەکانی پێشووەوە داتاشیوە، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَمَا كُنتَ تَتْلُوا۟ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَـٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾[1]

(هەرگیز لە پێش ناردنی ئەم قورئانەدا تۆ هیچ کتێبێکت نە خوێندۆتەوە و بەدەستی خۆیشت هیچ نامەو کتێبێکت نەنووسیوە، ئەگەر خوێندەوار بوویتایە ئەو دەمە ناهەق بێژەکان دەکەوتنە گومانەوە لە خۆت و لە قورئان)، هەروەها دەفەرموێت:

﴿ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِىِّ ٱلْأُمِّىِّ ٱلَّذِى يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَـٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٨﴾ ﴾[2]

(دەسا ئێوەش بە خواو بەو پەیامبەرە هەواڵدەرە نەخوێندەوارەی خوا بڕوا بکەن کە ئەوەی بۆ خۆی بڕوای کاملی بە خواو بە هەموو وشەکانی ئەو هەیە دەبێ ئێوەش شوێنی بکەون، سا بەڵکو بەختیارو شارەزای ڕێگەی هەقبن).

---

(١) العنكبوت: ٤٨.

(٢) الأعراف: ١٥٨.

## قۆناغـەکانی وەحـی:

قۆناغی یەکەمی دابەزینی وەحی بە بینینی خەوی راست دەستی پێکرد، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەر خەوێکی دەدی، وەك خۆی دەهاتەدی، پاشان لە قۆناغی دووەمدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) حەزی ئەکرد بە تەنها بێت و کەنار بگرێت، بۆیە دەچوو بۆ ئەشکەوتی حیراء و لەوێ پەرستشی دەکرد، شەو و رۆژ لەوێ دەمایەوە، بەشی ئەو ماوەیەش توێشووی لەگەڵ خۆی دەبرد، دواتر دەهاتەوە بۆ لای خەدیجەو هەمدی شمەك و پێویستی ئەبرد و دەگەڕایەوە ناو ئەشکەوت.[١]

قۆناغی سێیەم سەلامکردنی دارو بەرد بوو لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەیفەرموو (بەردێ شارەزام لە مەککە پێش ئەوەی وەك پێغەمبەر بنێردرێم سەلامی لێدەکردم، ئێستاش بە چاکی ئەو بەردە دەناسمەوە).[٢]

قۆناغی چوارەمیش دابەزینی وەحی بوو، تەمەنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە چل ساڵیدا بوو کە لە ئەشکەوتی حیرائدا بۆ یەکەمجار وەحی بۆ دابەزی،[٣] مانگەکەش مانگی رەمەزان بوو، خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ هُدٗى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٖ مِّنَ ٱلۡهُدَىٰ وَٱلۡفُرۡقَانِۚ ﴿١٨٥﴾ ﴾[٤]

---

(١) صحیح البخاري، الرقم ٦٥٩٩، صحیح مسلم، الرقم ٢٥٧.

(٢) مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٠٣١٠، صحیح مسلم، الرقم ٤٣١٩، صحیح ابن حبان، الرقم ٦٥٧٥.

(٣) مسند احمد بن حنبل، الرقم ٣٣٨٩، صحیح البخاري، الرقم ٣٧١١.

(٤) البقرة: ١٨٥.

(مانگی رەمەزان، ئەو مانگەیە کە قورئانی تێدا نێردراوەتە خوارێ، رێنمایی مەردم دەکا بۆ گشت کارێکی چاك و چەندین بەڵگەو نیشانەی زۆر روونی تێدایە بۆ شارەزای رێی هەق و جیاکردنەوەی راست و ناڕاست)، کاتەکەشی دوو شەممە بوو، چونکە پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆچی رۆژانی دووشەممە بەرۆژوو دەبیت؟ فەرمووی (چونکە تیایدا لەدایك بووم و تیایدا - قورئان - دابەزێنرایە سەرم).[1]

وەرزی دابەزینی قورئانیش وەرزی پاییز بوو.

## دابەزینی وەحی:

لە ئەشکەوتی حیرائدا جیبریل کە هات، بە پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) فەرموو بخوێنە، ئەویش فەرمووی من خوێندەوار نیم، جیبریل پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) گرت و توند گوشی هەتا ئازاری پێگەیاند و دواتر بەریدا و هەمان شتی لێ دووبارە کردەوە، سێ جار ئەمە روویدا، ئینجا جیبریل فەرمووی:

﴿ ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ١ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ٢ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ٣ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ٤ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ٥ ﴾ (العلق).

پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) بە دڵەخورپێوە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە بۆ لای خەدیجەو فەرمووی (دامپۆشن، دامپۆشن)، دایانپۆشی تا شڵەژانەکەی نەما، ئینجا بەسەرهاتەکەی بۆ خەدیجە گێڕایەوەو فەرمووی (ترسم لە خۆم نیشتووە) خەدیجەش دڵنەوایی کردو وتی نەبەخوا هەرگیز خوا سەرشۆڕت ناکات، پاشان بەڵگەی بۆ پاڵپشتی ئەو قسەی هێنایەوەو باسی چاکەکانی پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) کرد و پێی وت تۆ پەیوەندی

---

(١) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢١٩٤٩، صحيح مسلم، الرقم ٢٠٥٢.

خزمایەتی دەگەیەنیت و باری سەرشانی خەڵك سووك دەكەیت و دەستگرۆی نەداریت و ڕێزی میوان دەگریت و ئاگات لە بارشێواوانە، دوای ئەوە خەدیجە پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) برد بۆ لای وەرەقەی کوڕی نەوفەل کە کابرایەکی نەصرانی بوو و نووسینی عیبرانیشی دەزانی، کابرایەکی پیری نابینا بوو، خەدیجە پێی وت ئامۆزاکەم گوێ لە برازاکەت بگرە، وەرەقە بە وردی گوێی گرت لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئینجا پێی وت ئەمە هەمان ئەو ناموسەیە[1] کە خوا دایبەزاند بۆ لای مووسا، خۆزگە لە سەردەمی تۆدا گەنج بوومایە، خۆزگە زیندوو بوومایە کاتێ هۆزەکەت دەرت ئەکەن، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی (یانی ئەوان دەرم ئەکەن؟) وەرەقە وتی بەڵێ، هەرکەسێ ئەوەی هێنابێ کە تۆ هێناوتە دوژمنایەتی کراوە، ئەگەر بگەم بە ڕۆژگاری تۆ زۆر مەردانە پاڵپشتت ئەبم و سەرت ئەخەم، بەڵام هێندەی نەبرد وەرەقە مرد و ماوەیەکیش وەحی وەستا.[2]

جاری دووەم جیبریل هاتەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەنگێکی لە ئاسمانەوە بیست و سەری بەرزکردەوەو جیبریلی لەو شێوەدا بینی کە خوا خەلقی کردبوو، ترس دایگرت، ئینجا گەڕایەوە بۆ لای خەدیجەو فەرمووی دامپۆشن، دامپۆشن، ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە بۆی

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ۝١ قُمْ فَأَنذِرْ ۝٢ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ۝٣ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ۝٤ وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ ۝٥ ﴾[3]

(ئەی ئەوەی جلکی خەوت بەخۆوە پێچاندووە! هەستە، لە ناو نوێنەکەت خەڵکی بێباوەڕ بێدار بکەرەوەو بترسێنە لە سزای خوا، وە پەروەردگاری خۆت بە گەورە بگرە، وە بەرگ و کاڵات، خاوێن بکەرەوە، لە هەموو گوناه و جۆرە

---

(١) مەبەست پێی جیبریلە کە فریشتەی هێنانی وەحیە.

(٢) صحیح البخاري، الرقم ٣، صحیح مسلم، الرقم ٢٥٧.

(٣) المدثر: ١-٥.

کارێکی ناپوخت و نا پەسەند گەڕێ)، بەوەش پچڕانی وەحی کۆتایی هات،[١] ئیتر دوای ئەوە هەستانەوەیە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) تا ئەو ڕۆژەی وەفاتی کرد وچانی نەدا و بەردەوام بوو لە گەیاندنی پەیامی خوا.

## چۆنێتی دابەزینی وەحی :

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە وەحی بۆ دەهات، بە چەند شێوازێك بۆی دەهات، جار هەبوو جیبریل دەهات بۆ لای بێ ئەوەی خۆی نیشان بدات،[٢] جار هەبوو جیبریل لە شێوەی پیاودا دەهات بۆ لای،[٣] لەم حاڵەتەدا هەندێ جار هاوەڵان دەیانبینی، وەك بینینەکەی عومەری کوڕی خەططاب و هاوەڵانی دەوری،[٤] یان ئیبن عەبباس،[٥] جاریش هەبوو وەك دەنگی زەنگۆڵە وەحی بۆ دەهات و لە هەموو جۆرەکانی تر سەختتر بوو بۆ پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم)،[٦] جاریش هەبوو جیبریل لەسەر هەمان شێوە دەهات بۆ لای کە لەسەری خەلق کراوە،[٧] جاریش هەبوو خوا لە ئاسمانەوە وەحی پێ دەدا وەك شەوی میعراج و فەرزکردنی نوێژ.[٨]

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە وەحی بۆ دەهات لەشی زۆر قورس دەبوو، وەك عائیشە دەفەرموێت جارێك وەحی هاتە خوار بۆ پێغەمبەری

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٣٠٨٢، صحيح مسلم، الرقم ٢٥٨.

(٢) شعب الإيمان للبيهقي، الرقم ٩٩٥٦، صححه الألباني في صحيح و ضعيف الجامع الصغير وزيادته، الرقم ٢٠٨٥.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ٢، صحيح مسلم، الرقم ٤٤٠٦.

(٤) صحيح البخاري، الرقم ٤٥٠٣، صحيح مسلم، الرقم ٣٤.

(٥) مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٥٨٢، صححه أحمد شاكر، كما صححه شعيب الأرناؤوط.

(٦) صحيح البخاري، الرقم ٢، صحيح مسلم، الرقم ٤٤٠٦.

(٧) صحيح البخاري، الرقم ٣٠٨٢، صحيح مسلم، الرقم ٢٥٨.

(٨) صحيح البخاري، الرقم ٣٤٥، صحيح مسلم، الرقم ٢٦٠.

خوا (صلى الله عليه وسلم) و سەری لەسەر رانم بوو، هێندە قورس بوو وتم ئێستا رانم دووکەرت بووە،[١] هەروەها عەرەقێکی زۆری ئەکرد تەنانەت ئەگەر زستانیش بوایە.[٢]

## وەحی تەنها قورئان نەبووە:

مەسەلەیەکی تری گرنگ لە وەحیدا ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) تەنها قورئانی بە وەحی بۆ نەهاتووە، بەڵکو جگە لە قورئانیش وەحی تری بۆ هاتووە، بەڵگە بۆ ئەوەش لە قورئان و فەرموودەدا زۆرە، لەوانە:

مەسەلەی رووکردنە بەیتولمەقدیس کە پێش کەعبە موسڵمانان روویانکردۆتە ئەوێ، قورئان باسی کردووە کە هەبووەو گۆڕینی رووەو کەعبە باسکردووە، بەڵام هیچ دەقێکی تێدا نیە بۆ فەرزبوونی یەکەمجاری.

هەروەها تەیەممومم کردن کە لە قورئاندا باسکراوە (فتيمموا صعيدا طيبا)، بەڵام شێوازەکەی باس نەکراوەو عەممار کە ئەو ئایەتەشی دەزانی نەیزانی چۆن بیکات هەتا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) روونکردنەوەی پێدا لەسەر شێوازی تەیەممومم کردن.[٣]

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٢٦٩٧، سنن الترمذي، الرقم ٣٠٤٢، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٤١٧٦.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٢، صحيح مسلم، الرقم ٤٤٠٦.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ٣٤٣، صحيح مسلم، الرقم ٥٧٨.

## پاریزرانی قورئان له دڵدا:

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) كە وەحی بۆ دەهات، نارەحەتیەكی زۆری تووش ئەبوو و زۆر خۆی ماندوو ئەكرد هەتا ئایەتەكانی بیرنەچێتەوەو لێوەكانی دەجووڵاند، خوای گەورەش ئایەتی دابەزاندە خوارەوە (لا تحرك به لسانك لتعجل به إن علينا جمعه و قرآنه)، بەوە خوای گەورە بەڵێنی پاراستنی پێ دا، ئیتر كە جیبریل دەهات پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گوێی لێ دەگرت، دواتر كە جیبریل دەچوو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وەك خوێندنەوەكەی جیبریل دووبارەی ئەكردەوە.[١]

## گومانی خۆكوشتن:

بوخاری گێڕانەوەیەكی هێناوە كە پاش ئەوەی ماوەیەك وەحی وەستا، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هێندە بێتاقەت بوو، وای لێهات چەند جارێ دەچوویە سەر لووتكەی شاخەكان و دەیویست خۆی بخاتە خوارەوە، بەڵام جبریل خۆی نیشان دەدا و دەیوت ئەی موحەممەد تۆ بە حەق پێغەمبەری خوایت، ئەویش دڵی دادەمركایەوەو دەگەڕایەوە، هەركات وەحی دوابكەوتایە تووشی هەمان حاڵەت دەبوویەوەو جیبریلیش خۆی نیشان دەدا.[٢]

**بەڵام ئەم گێڕانەوەیە رەخنەی لەسەرە لە چەند روویەكەوە:**

**یەكەم:** بوخاری بەسەرهاتی هاتنی وەحی لە چەند شوێنی تر هێناوەو هەمان ئەم فەرموودەی عائیشەی هێناوە، بەڵام لە هیچ كامیاندا باسی هەوڵی خۆكوشتنی نەهێناوە، تەنها لە كتاب التعبير دا كە تایبەتە بە خەو هێناویەتی.

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٥، صحيح مسلم، الرقم ٧٠٩.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٦٥٩٩.

**دووەم:** ئەوەی بوخاری لەوێشدا هێناویەتی وەك بەشێك لە فەرموودەکە نەهاتووە، بەڵکو وتەی زوهریە و بە دەستەواژەی (فیما بلغنا) جیای کردۆتەوە لە فەرموودەکە، ئیبن حەجەریش رەخنە لەم گێڕانەوەیە دەگرێت.[١]

**سێیەم:** مەسەلەی پچڕانی وەحی ماوەکەی دیاری نەکراوەو ئەو گێڕانەوانەی هاتون صەحیح نین، بەڵام بە جووڵەی بانگەوازیی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) دەردەکەوێت ماوەکەی کەم بووە.

## فەڕزبوونی شەونوێژ:

دوای ئەوە سوورەتی (المزمل) دابەزی ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ ﴿١﴾ قُمِ ٱلَّيۡلَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٢﴾ نِّصۡفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصۡ مِنۡهُ قَلِيلًا ﴿٣﴾ أَوۡ زِدۡ عَلَيۡهِ وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا ﴿٤﴾﴾[٢]

(ئەی کاڵا لە باڵا پێچاو! ئەی ئەو کەسەی لەرزت لێ هاتووەو خۆتت داپۆشیوە! شەو هەستە واز لە خۆپێچانەوە بێنەو گوڕ بە خۆت بدەو نوێژ بکە، مەگەر کەمەکێکی شەو نەبێ بۆ خەوو حەوانەوەت، نیوەی (شەو) یا هەندێکی لێ کەم بکەوە. (ئەگەر شەوگار درێژ بوو). واتە: شەو نوێژەکەت هەموو کاتەکانی شەوگاری پێ مەگرەوە، چونکە ماندوو دەبیت، بەڵکو سێیەك باشە، یان زیاتری بکە، زۆریش بە ئاهستەو لەسەر خۆیی و ڕێك و پێك ئەم قورئانە بخوێنەو)، لێرەوە خوای گەورە شەونوێژی لەسەر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەڕز کرد هەتا ببێتە قۆناغی خۆپێگەیاندن و هەنگاوێکی بانگەواز، پرسیار کرا لە دایکی باوەڕداران عائیشە سەبارەت بە شەونوێژی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئەویش فەرمووی: مەگەر سوورەتی (یا أیها المزمل) ت نەخوێندۆتەوە؟. خوای گەورە لە سەرەتای ئەو سوورەتەوە

---

(١) ابن حجر العسقلاني: فتح الباري شرح صحيح البخاري، ج١٢، ص ٣٥٩.

(٢) المزمل: ١-٤.

شەونوێژی فەرز کرد، ماوەیەك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و هاوەڵانی شەونوێژیان دەکرد، دواتر لە کۆتایی سوورەتەکەدا دوای دوانزە مانگ خوای گەورە ئاسانکاری دابەزاند، ئیتر دوای فەرزبوونی، شەونوێژ بوو بە تەطەوع.[١]

---

(١) صحيح مسلم، الرقم ١٢٧١، صحيح ابن خزيمة، الرقم ١٠٥٧، صحيح ابن حبان، الرقم ٢٥٩٢.

# باسی دووەم

## دەستپێکردنی بانگەواز

### بانگەوازی نهێنی:

سەرەتای بانگەوازەکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە نهێنی دەستی پێکرد و تیایدا دەستەیەك لە ژنان و پیاوان و تازەپێگەیشتوان و منداڵان لەناو چین و توێژە جیاجیاکاندا موسڵمان بوون، سەردەستەی موسڵمانبووەکانیش بریتی بوون لە: (خەدیجەی کچی خوەیلید کە یەکەم کەس و یەکەم ئافرەت بوو موسڵمان بوو،[1] ئەبووبەکری صدیق کە یەکەم پیاو بوو موسڵمان بوو،[2] عەلی کوڕی ئەبووطالیب کە یەکەم منداڵ بوو موسڵمان بوو،[3] لە ناو مەولاکاندا یەکەم کەس زەیدی کوڕی حارثەی مەولای بوو کە موسڵمان بوو.[4]

---

(١) ابن الأثير: ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٧، ص ٨٩.

(٢) النويري: نهاية الإرب في فنون الأدب، ج١٩، ص ١١.

(٣) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٣، ص ٢٥.

(٤) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٣، ص ٢٤.

بەرەبەرە ژمارەیەك لە خەڵكی مەككە لە تیرە جیاجیاكان موسڵمان بوون،[١] بە نموونە لە بەنووهاشم (عەلی[٢] و جەعفەری[٣] كوڕانی ئەبووطالیب، ئوممولفەضلی كچی حارث،[٤] عوبەیدەی كوڕی حارث[٥] و ئەسمائی كچی عومەیس[٦] و خەدیجەی كچی خوەیلید)،[٧] لە بەنوئومەییە (عوثمانی كوڕی عەففان[٨] و خالیدی كوڕی سەعید[٩] و عەبدوڵای كوڕی جەحش[١٠] و چەندێكی دی)، لە بەنوتیم (ئەبووبەكری صدیق[١١] و طەلحەی كوڕی عوبەیدوڵا[١٢] و عامیری كوڕی فوهەیرەی مەولا[١٣])، لە بەنومەخزووم (ئەبووسەلەمە[١٤] و عەمماری كوڕی یاسری هاوپەیمانیان[١٥] و ئەرقەمی كوڕی ئـەبی ئەرقەم)،[١٦] لە

---

(١) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٣، ص ٢٥.

(٢) خوێنەری ئازیز، بۆ وەرگرتنی زانیاری سەبارەت بە هەریەك لەم ناوانە، دەتوانیت بگەڕێیتەوە سەر كتێبی (ناسینی هاوەڵانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم كه لە (٩) بەرگدا بە شێوەی ئەبجەدی ناو و ژیانی هاوەڵانمان خستۆتەڕوو.

(٣) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج١، ص ٤٢١.

(٤) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٧، ص ٢٧٤.

(٥) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٨.

(٦) ابن عبدالبر: الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٤، ص ١٧٨٤.

(٧) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٧، ص ٨٩.

(٨) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٣، ص ٣٠.

(٩) ابن عبدالبر: ابن عبدالبر: الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص ٤٢٠.

(١٠) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٣، ص ١٩٥.

(١١) النويري: نهاية الإرب في فنون الأدب، ج١٩، ص ١١.

(١٢) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٣، ص ٣٠.

(١٣) ابن عبدالبر: الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج٢، ص ٧٩٦.

(١٤) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص١٥٢-١٥٣.

(١٥) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٤، ص ١٣٩.

(١٦) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص ٤٣.

بەنو عەددی (سەعیدی کوڕی زەید[١] و فاطیمەی کچی خەططاب)،[٢] لە بەنووزوهرە (سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص[٣] و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف[٤] و عەبدوڵای کوڕی مەسعوودی هاوپەیمانیان)،[٥] لە بەنوجومەح (سائیبی کوڕی عوثمان[٦] و حاطیبی کوڕی حارث[٧] و فاطیمەی هاوسەری)،[٨] لە بەنوو ئەسەد (زوبەیری کوڕی عەووام)، لە بەنووعامیر (ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەراح[٩] و سەلیطی کوڕی عەمر).[١٠]

ئەمانە بوونە بنکەی بەهێزی بانگەوازی ئیسلامی و هەریەك لەمانە بە نهێنی بانگەوازی ئەکرد، کەسانێك بوون خوای گەورە لێیان رازی بوو و شایەتی بۆ دان:

﴿ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ﴿١٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿١١﴾ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿١٢﴾ ﴾[١١]،

(پێشکەوتووەکان، ئەوانەی پێشکەوتن بە خەیرات لە دنیادا، هەمیشە پێشەنگبوون بۆ بە دەستهێنانی ڕەزامەندی خوا، ئا ئەوانە نزیکخراوەکانن، لەناو باخاتی خۆشگوزەرانیدان)، هەروەها دەفەرموێت:

---

(١) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٢، ص ٤٥٦.

(٢) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨، ص ٦٢.

(٣) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٢، ص ٤٣٣.

(٤) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٣، ص ٣٠.

(٥) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ٢٣٣.

(٦) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٢، ص ٣٨٠.

(٧) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٦.

(٨) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٧، ص ٢٤٩.

(٩) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٣، ص ٣٠.

(١٠) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٢، ص ٥١٢.

(١١) الواقعة: ١٠-١٢.

﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلْأَوَّلُونَ مِنَ ٱلْمُهَٰجِرِينَ وَٱلْأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحْسَٰنٍ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى تَحْتَهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾﴾،[1]

واتە:(خوای میهرەبان لەوانەی کە پێشکەوتن و یەکەم کەس بوون لە ئیسلام بوون و خزمەتکردنی ئیسلامدا لە کاروانی کۆچەران و پشتیوانان و ئەوانەی کە بە ڕێکوپێکی شوێنیان کەوتوون، ڕازی بووە و ئەوانیش لەو ڕازی بوون، باخەکانی بەهەشتی بۆ ئامادەکردوون کە چەندەها ڕووبار بە بەردەم کۆشکەکانی و بەژێر درەختەکانیدا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ نەمریدا بۆ هەمیشەیی تیایدا دەمێننەوە، ئەوە سەرکەوتنێکی زۆر گەورەیە).

هەر لەم قۆناغەدا کە قۆناغی بانگەوازی نهێنی بوو نوێژکردن تیایدا فەرز بوو، بەڵام لە شەو و ڕۆژێکدا دوو جار بوو، پێش خۆرهەڵاتن و پێش خۆرئاوابوون، ماوەیەکیش شەونوێژ تیایدا واجب بوو، دواتر لە شەوی ئیسرائدا خوای گەورە پێنج نوێژی فەرز کرد لەسەر موسڵمانان.[2]

هێشتا موسڵمانان بانگەوازیان ئاشکرا نەکردبوو و بۆ نوێژکردن بە شیوەکاندا بڵاو دەبوونەوە، ئەوکاتیش فەرمانی جیهادیان پێ نەکرابوو، بە دەقی صەریحیش ئاگادار نەکرابوون لە دەستگرتنەوە، بۆیە کاتێك سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و چەند هاوەڵێکی تر لە شیوێك نوێژیان ئەکرد، برێ لە بێباوەڕان ئەوانیان بینین و وەزعەکەیان پێ ناخۆش بوو و کەوتنە ئازاردانیان، سەعدیش چونکە بڕیاری پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) پێ نەبوو، هەستا و یەکێك لە بێباوەڕەکانی بریندار کرد، ئەوەش یەکەم قەترەی خوێن بوو لە ئیسلامدا ڕژا.[3]

---

(١) التوبة: ١٠٠.

(٢) تفسير ابن كثير، ج٤، ص ٢٣٠.

(٣) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٢، ص ٤٣٤، ابن كثير: البداية والنهاية، ج٣، ص ٣٧.

لەو ماوەدا موسڵمانان لە ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەبی ئەرقەم کۆدەبوونەوەو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕێنمایی پێ دەدان، ماڵی ئەرقەم لە مەککە لە ناوچەیەکی صەفا بوو کە کەنار بوو و کەس گومانی بۆی نەدەچوو.[١]

قۆناغی بانگەوازی نهێنی ماوەی سێ ساڵی خایاند،[٢] ئینجا قۆناغی بانگەوازی ئاشکرا دەستی پێکرد.

هەر لەم ماوەدا بوو کە دەستەیەك لە جنۆکەکان پەیامی ئیسلامیان بیست، جنۆکەکان کە ڕێگرییان لێ کرا لە ئاسمانەوە هەواڵ وەربگرن، هەستیان کرد شتێك ڕوویداوە، کەوتنە گەڕان و دواجار زانییان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نێردراوە، دەستەیەکیان هاتن و پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) ئەوکات هاودەم بە چەند هاوەڵێکی لە بازاڕی عوکاڤ بوو، گوێیان هەڵخست بۆ فەرمایشتەکانی و پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) ئەوانی نەبینی، دواتر جنۆکەکان گەڕانەوە بۆ لای قەومی خۆیان و باسی پەیامی پێغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم) کرد، خوای گەورەش سوورەتی (الجن) ی دابەزاند بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و هەواڵی پێ دا کە جنۆکەکان گوێیان لێگرتووە.[٣]

---

(١) أسدالغابة، ج١، ص٩٥.

(٢) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٩٧.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ٧٥٢، صحيح مسلم، الرقم ٧١٠.

## ئاشکراکردنی بانگەواز:

کاتێك ریژەی موسڵمانان زیادی کرد و کەوتنە بەرچاو، دەنگوباسیان لەناو مەککەدا بڵاو بوویەوەو خەریك بوو بانگەوازەکە ئاشکرا دەبوو،[1] دەستپێکردنی قۆناغی بانگەوازی ئاشکرا بە ویست و بیرکردنەوەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەبوو، بەڵکو خوای گەورە وادەکەی و شێوازەکەشی دەستنیشان کرد:

﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ ٱلْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢١٥﴾ فَإِنْ عَصَوْكَ فَقُلْ إِنِّي بَرِيٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢١٦﴾ ﴾[2].

(سەرەتا عەشرەت و خێڵە نزیکەکەت بەسزای خوا بترسێنە، باڵی میهرەبانی و سۆزت نەوی بکە بۆ ئەو بڕوادارانەی کە پەیڕەوییت لێ دەکەن، ئینجا ئەگەر - ئەو خوا نەناسانە - یاخی بوون و بەگوێیان نەکردیت، پێیان بڵێ: بەڕاستیی لەهەموو کاروکردەوەیەك کە ئێوە ئەنجامی بدەن من بەریی و بێزارم).

**دیارترین تایبەتمەندیەکانی ئەم قۆناغە بریتی بوون لە:**

**یەکەم:** پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و موسڵمانان لە هەموو ماڵ و شوێنێك بانگەوازیان دەکرد بۆ پەیامی خوا و باکیان نەبوو بە ئازار و نارەحەتیەکان.

**دووەم:** موسڵمانان بەرامبەر بە بێباوەڕان هێزیان بەکارنەدەهێنا و فەرمانیان پێ کرابوو دەست بگرنەوە، ئەوەش دەیان هۆکار و حیکمەتی لەپشت بوو.

**سێیەم:** بانگەوازەکە لە سەر زاری خەڵکانی ترەوە گەیشت بە کەسانی تر و خەڵکانێ لە دوور و نزیکەوە هەواڵی بانگەوازەکەیان پێ گەیشت و دەهاتن بۆ

---

(١) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٩٧.

(٢) الشعراء: ٢١٤ — ٢١٦.

دڵنیابوون لە راستی و ناڕاستی ئەو مەسەلەیە و بەو هۆیەوە ژمارەیەکی بەرچاو موسڵمان بوون، لەوانە (حەمزەی مامی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئەبووذەری غیفاری، گوفەیلی کوڕی عەمری دەوسی) لەم قۆناغەدا موسڵمان بوون.

**چوارەم:** رۆژ دوای رۆژ ژمارەی موسڵمان بوان زیاتر دەبوو و ئیمان دەچوویە ناو ماڵی سەرکردە بێباوەڕەکانەوە، هەیانبوو کوڕەکەی موسڵمان دەبوو، هەیانبوو کۆیلەکەی یان برازاکەی یان کەسانی تری نزیکی موسڵمان دەبوون.

**پێنجەم:** بێباوەڕان هەرچەشنە هێزێکی هزری و ماددی و جەستەییان بەکاردەهێنا بۆ دژایەتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم).

**شەشەم:** قۆناغی بەرگرتن بە موسڵمانان و ئازاردانیان لە نارەزایی و تانەدانەوە گەیشتە رشتنی خوێنیان و دەرکردنیان لە مەککە.

**حەوتەم:** پەیامی خوا و پەروەردەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆ هاوەڵان لەم قۆناغەدا بەهێزکردن و پتەوکردنی بیروباوەڕی موسڵمانان بوو، ئیتر موسڵمانان هێزێکی رۆحی وایان بۆ دروست بوو مەرگ و دووری و ئازار و نەبوونی نەیاندەتوانی هیچ لە بیروباوەڕەکەیان پەشیمانیان بکەنەوە.

کاتێك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەم فەرمانەی وەرگرت، چوویە سەر بەرزایی صەفا و هاواری کرد: ئەی بەنی فەهر، ئەی بەنی عەددی) ئاوا یەك یەك هەموو قورەیشی بانگ کرد هەتا هەموویان کۆبوونەوە، هەرکەسیش خۆی نەیتوانیایە بڕوات لەبری خۆی کەسێکی دەنارد هەتا بزانێت مەسەلە چیە، ئەبولەهەبیش خۆی هات، کە هەموان کۆبوونەوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی (ئەگەر هەواڵتان پێ بدەم سوپایەکی سوارە لەو دۆڵەوە دەیانەوێت شاڵاو بهێننە سەرتان، باوەڕم پێ دەکەن؟) ئەوانیش وتیان بەڵێ، خۆ ئێمە جگە لە راستی هیچی ترمان لە تۆ نەبیستووە، ئینجا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پەیامەکەی خستەڕوو و فەرمووی (دەی من بێدارتان ئەکەمەوە سەبارەت بە سزایەکی زۆر سەخت)، خێرا ئەبولەهەب

هەنگاوی نارەزایی نا و وتی رۆژ تا ئێوارە دەستت بشکێ، بۆ ئا ئەمە کۆت کردووینەتەوە؟ خوای گەورەش وەڵامی ئەبولەهەبی دایەوەو ئایەتی لەبارەوە دابەزاند:

﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ۝١ مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ۝٢ سَيَصۡلَىٰ نَارٗا ذَاتَ لَهَبٖ ۝٣ وَٱمۡرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلۡحَطَبِ ۝٤ فِي جِيدِهَا حَبۡلٞ مِّن مَّسَدِۭ ۝٥﴾ [١].

(یاخوا هەر دوو دەستەکانی (ئەبوولەهەب) بە برین چن و تیابچن، خۆ تیاشچوو ماڵ و سامانیی و ئەوەی کە کردی لە دوژمنایەتی کردنی پەیامبەر سوودی پێ نەدا، لەمەو پاش دەچێتە ناو ئاگرێکی بڵێسە دارەوەو دەسوتێ، هاورێ لەگەڵ هاوسەرەکەیشیدا، چونکە ئەویش ماڵەو ماڵ ئەگەراو، ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد کە نەچنە سەر قسەی موحەممەد، لە گەردنیایەتی لە دۆزەخدا گوریسێکی چنراو لە پووشی خورما).

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کۆتایی نەهێنا بە قسەکانی و فەرمووی (ئەی گرۆی قورەیش خۆتان بکرنەوە، لای خوا هیچم پێ ناکرێ بۆتان، ئەی بەنی عەبدمەناف لای خوا هیچم پێ ناکرێ بۆتان، ئەی عەبباسی کوری عەبدولموطەلیب لای خوا هیچم پێ ناکرێ بۆت . ئەی فاطیمەی کچی موحەممەد لە ماڵ و سامانم چیت دەوێ داوام لێ بکە، لای خوا هیچم پێ ناکرێ بۆت).[٢]

ئیتر ئەبوولەهەب بوویە یەکەم نەیاری دینی خوا و دەرگای دژایەتی پەیامی خوای کردەوە، لێرە بەدواوە بانگەوازی ئیسلامی چوویە قۆناغێکی ترەوە، قۆناغی سەختی و نارەحەتیەکان.

---

(١) المسد: ١-٥.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٢٦٢١، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٦٢٧٥.

# باسی سێیەم

## دژایەتیکردنی بانگەوازەکە

هەڵوێستی قوڕەیش بەرامبەر بانگەوازەکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم):

قوڕەیش بەرامبەر بانگەوازەکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) حەوت هەڵوێستیان گرتەبەر:

### یەکەم: هەوڵی پەشیمان کردنەوەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم):

ئەمە یەکەم هەنگاوی قوڕەیشیەکان بوو، سەرەتا چوون بۆ لای ئەبووطالیبی مامی و داوایان لێکرد پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) رازی بکات واز بهێنێت لە بانگەوازەکەی، ئەگەرنا واز بهێنێت هەتا خۆیان چارەسەری بکەن، ئەبووطالیبیش پاش ئەوەی هەوڵی خۆی دا و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) پەشیمان نەبوویەوە، ئامادە نەبوو پشتی بەر بدات، زیاتر لە چەند جارێك ئەم هەوڵەیان لەگەڵ ئەبووطالیب دا هەتا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) پەشیمان بکاتەوە یان پشتی بەر بدات، بەلام هەوڵەکەیان سەری نەگرت.[١]

---

(١) ابن هشام: السیرة النبویة، ج٢، ص ١٠٠-١٠٣.

## دووەم: هەوڵی پەشیمان کردنەوەی شوێنکەوتوانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم):

هەوڵی بێباوەڕان بۆ پەشیمان کردنەوەی شوێنکەوتوانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سنووری بۆ نەبوو، سەرەتا داوایان لێدەکردن پەشیمان ببنەوە، ئەگەر رازی نەبوونایە، هەوڵیان دەدا لە ڕێی کەسانی ترەوە پەشیمانیان بکەنەوە، ئەگەر لەوەشدا سەرکەوتوو نەبوونایە، ئازار و ئەشکەنجەو بەندکردن و تەنانەت کوشتنیان دەگرتەبەر، نموونەی ئەوەش سزادانی بیلال و عەممار و یاسر و شەهیدکردنی سومەییە کە یەکەم شەهیدی ئیسلامەو بەندکردنی عوثمانی کوڕی عەففان[١] و لێدانی ئەبووبەکری صدیق[٢] و چەندین نموونەی تر کە لە سەرچاوە مێژووییەکاندا بە وردی باس کراون.

## سێیەم: هەوڵی شکاندنی کەسێتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم):

بێباوەڕەکان کە نەیانتوانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پەشیمان بکەنەوە، ئینجا هەوڵیان دەدا بدەن لە کەسێتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و بیشکێنن، بۆ ئەمەش بێباك لە شایەتی چاکەی دوێنێیان، کەوتنە بەخشینەوەی تۆمەت بەرامبەر پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ژمارەیەك لەو تۆمەتانەش کە دەیانبەخشینەوە لە قورئاندا باس کراون:

**یەکەم:** دەیانوت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) جادووگەرە، ﴿ أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنْ أَوْحَيْنَا إِلَىٰ رَجُلٍ مِّنْهُمْ أَنْ أَنذِرِ النَّاسَ وَبَشِّرِ الَّذِينَ آمَنُوا أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ

---

(١) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٣، ص ٥٥.

(٢) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٧، ص ٣٥٤.

صِدْقٍ عِندَ رَبِّهِمْۗ قَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ مُّبِينٌ ﴿٢﴾ ﴾[١]

(ئاخۆ بۆ خەڵك جێی سەرسوڕمانە کەوەحیمان بۆ پیاوێکیان کردووەو کردوومانەتە پێغەمبەرو پێمان گوتووە ؟! کە گشت مەردم بەسزای دواڕۆژی خوای گەورەو بەدەسەڵات بترسێنە و بەو کەسانەش باوەڕیان هێناوە مژدەو مزگێنی بدە کە بەڕاستیی پایەو پلەو پاداشی باش و بەرزیان بۆ هەیە لای پەروەردگاریان، بە هۆی ئەوەی لە دنیادا کاروکردەوەی چاکیان پێشخستووە، کەچی کافرو بێ باوەڕەکان بەپێغەمبەرێکی ئاوایان گوت: بێگومان ئەم موحەممەدە (صلى الله عليه وسلم) جادووگەرێکی ئاشکراو ڕوونە!).

**دووەم:** دەیانوت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) جادووی لێ کراوە، ﴿ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَسْتَمِعُونَ بِهِۦٓ إِذْ يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ وَإِذْ هُمْ نَجْوَىٰٓ إِذْ يَقُولُ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا ﴿٤٧﴾ ﴾[٢]

(ئێمە لە هەمووکەس چاکتر دەزانین کە خوا نەناسەکان بە چ نیازێ گوێ بۆ قورئان دەگرن، کاتێ گوێت بۆ دەگرن و، ئەوکاتەش کە دەکەونە چرپە چرپ و سرتە سرت، واتە: ئاگامان لێیانە کەچۆن لاقرتیی و گاڵتە دەکەن و دەڵێن: جادووبازە، یان دەڵێن جادووی لێکراوە! ئەودەمەی کە ستەمکارەکان لەناو یەکتردا دەڵێن: ئێوە هەر لەپیاوێکی جادوولێکراو پەیڕەوی دەکەن).

**سێیەم:** دەیانوت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) درۆزنە، ﴿ وَعَجِبُوٓا۟ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْۖ وَقَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٌ كَذَّابٌ ﴿٤﴾ ﴾[٣]

(سەرسام مان لەوە کە هەر لە خۆیان - نەك لە فریشتە- پەیامبەرێکی (ترسێنەریان) بۆ هات؟!. بێ باوەڕەکان - لە باتی تەسلیم بوون و باوەڕهێنان- وتیان: ببێ و نەبێ ئەم موحەممەدە کە دەڵێت: من نێرراوی خوام جادووگەرێکی درۆزنە!).

---

(١) یونس: ٢.

(٢) الإسراء: ٤٧.

(٣) ص: ٤.

**چوارەم:** دەیانوت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) تووشی شێتی بووەو لە کۆڕ و شوێنەکاندا بە کەسێتیەکی شێت باسیان دەکرد، ﴿وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَـٰرِهِمْ لَمَّا سَمِعُوا۟ ٱلذِّكْرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُۥ لَمَجْنُونٌ ﴿٥١﴾﴾[1]

(وە بەڕاستی ئەی پێغەمبەر! ئەوانەی کە کافرو بێ بڕوا بوون نزیکە لە ڕق و دوژمنایەتیدا بە چاویان هەڵت دێرن، وەختێ کە قورئانیان بیست وە لەگەڵ ئەوەیشدا دەڵێن: بەڕاستی ئەو (موحەممەد)ـە شێتە!).

**پێنجەم:** دەیانوت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) شاعیرەو ئەوەی بە پەیامی خوای دەزانێت شیعرەو هیچی دی، ﴿وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوٓا۟ ءَالِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍ ﴿٣٦﴾﴾[2]

(دەشیانگوت: ئایا ئێمە بۆ شاعیرێکی شێت و لێوەی وەکو موحەممەد، واز لە خواکانمان بێنین؟!).

**شەشەم:** دەیانوت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کەسێکی کاهینە، خوای گەورەش بەرپەرچی تۆمەتەکەی دانەوە، ﴿وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾﴾[3]

(وتەو قسەی جووکیش نیە، کەوایە بیربکەنەوەو ئامۆژگاری وەرگرن).

**حەوتەم:** ئەیانوت ئەمەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) باسی دەکات ئەفسانەی پێشینانەو ئەمڕۆ گەرمی دەکاتەوەو دەرخواردی ئەو خەڵکەی دەدات، ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوكَ يُجَـٰدِلُونَكَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَـٰذَآ إِلَّآ أَسَـٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٥﴾﴾[4]

---

(١) القلم: ٥١

(٢) الصافات: ٣٦.

(٣) الحاقة: ٤٢.

(٤) الأنعام: ٢٥.

(ئەوساکەیش کە هاتنە لات دەکەونە شەڕە قسەو چەلەحانێ لەگەڵت کافرو بێ باوەڕەکان دەڵێن: ببێ و نەبێ ئەم قورئانە هەر ئەفسانەو (ئوستورە)ی پێشووەکانە، لەوە بەولاوە شتێکی دی نیە).

**هەشتەم:** ئەیانوت ئەمەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) باسی ئەکات درۆ و هەڵبەستەیەکە، خۆیشی تەنها ئەمەی نەکردووە، بەڵکو خەڵکانێ یارمەتییان داوە تا ئەمە بکات، ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ إِفْكٌ ٱفْتَرَىٰهُ وَأَعَانَهُۥ عَلَيْهِ قَوْمٌ ءَاخَرُونَ ۖ فَقَدْ جَآءُو ظُلْمًا وَزُورًا ﴿٤﴾ ﴾[1]

(وە ئەو کافرو بێ باوەڕانە دەربارەی قورئان گوتیان: ئەم قورئانە هەر درۆیەو، موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) خۆی هەڵیبەستووە و کەسانی تریش - وەك خاوەن نامەکان - بۆ هۆنینەوەو ڕێکخستنی یارمەتییان داوە، بەڕاستیی هەرچییەکیان گوت، بوختانەو ستەمێکی گەورەش دەکەن).

**نۆیەم:** دەیانوت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خۆی هیچی نەزانیوەو ئەمەی بە وەحی ناوی دەبات مرۆڤێك فێری کردووە، وەك چۆن ئەمڕۆ خەڵکێ دەڵێن هەمووی لە بەحیراوە وەرگرتووە، ﴿ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ ۗ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾ ﴾[2]

(سوێندبێ ئەمەش چاك دەزانین کەئەوانە پێت دەڵێن: هەر ئادەمیە کە ئەم قورئانەی فێر دەکات، خۆ زمانی ئەوکەسەی ئەوان نیازیانە ئەم قورئانە بدەنە پاڵی ئەو، عەجەمییەو لەعارەبیش نەزان و کۆڵە، ئەم قورئانەش بەزمانێکی عەرەبیی خۆشخوان و ڕەوانبێژی ئاشکرایە).

---

(١) الفرقان: ٤.

(٢) النحل: ١٠٣.

جا خۆیشیان نەیاندەزانی بڕیاری کام لەو تۆمەتانەی بۆ بدەن، تووشی سەرلێشێوانێك بوون نەیاندەزانی چۆن بەرەی تۆمەتەکانیان یەکخەن، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱنظُرۡ كَيۡفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلۡأَمۡثَالَ فَضَلُّواْ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ سَبِيلٗا ﴿٤٨﴾ ﴾(١)

(دەسا بڕوانە چۆن نموونەی جۆراوجۆرت بۆ دەهێننەوە بەوەش سەریان لە خۆیان تێکدا، بۆیە جارێ دەڵێن شێتە، جارێکی تر دەڵێن جادووی لێکراوە. گومڕایە، ساحیرە، شاعیرە!! ئینجا ناتوانن ڕێگەیەك بۆ هیدایەت بدۆزنەوە).

بەڵام هیچ کام لەو پڕوپاگەندەو بانگەشانە سوودیان نەبوو بۆیان، بەڵکو بوونە هۆکارێ هەتا خەڵکێ لە دوورەوە بێن و لێکۆڵینەوە لە ڕاستی و ناڕاستی ئەو بانگەشانە بکەن و بە دوای ئەوەشدا موسڵمان ئەبوون، بۆ نموونە ئیبن عەبباس دەڵێت چیماد هاتە مەککە و سەرقاڵی روقیە کردن بوو، بیستی خەڵکێکی مەککە بە پێغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم) دەوت شێتە، ئەویش وتی من دەچم بۆ لای، بەڵکو خوا لەسەر دەستی من شیفای بدات، بۆیە چوو بۆ لای و وتی ئەی موحەممەد من روقیە دەکەم و خوا لەسەر دەستم شیفای کەسانێکی داوە، تۆیش دەتەوێت؟ پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی (إِنَّ الْحَمْدَ لِلَّهِ، نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلَا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَا هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ)، (سوپاس بۆ خوا، سوپاسی دەکەین وپشتی پێ دەبەستین، خوا هەرکەسی ڕێنموونی کرد هیچ گومڕاکەرێکی بۆ نیە، هەرکەس خوا گومڕای کرد هیچ ڕێنموونێکی بۆ نیە، شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێ نیە جگە لە خوای تاك و تەنهای بێهاوەڵ، موحەممەدیش بەندەو نێردراویەتی)، خێرا چیماد وتی وتەکانتم بۆ دووبارە بکەرەوە، سێ جار پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)بۆی دووبارە کردەوە، چیماد وتی من وتەی کاهین و جادووگەر و شاعیرانم بیشتووە، بەڵام شتی لەمجۆرەم نەبیستوە کە گەیشتوونەتە قووڵایی دەریاوە، دەی دەستت بێنە با لەسەر ئیسلام بەیعەتت پێبدەم، ئەویش بەیعەتی پێدا، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی هی هۆزەکەشت؟ وتی بەڵێ.(٢)

---

(١) الإسراء: ٤٨.

(٢) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٦٤٩، صحيح مسلم، الرقم ١٤٨٢، صحيح ابن حبان، الرقم ٦٦٧٢.

## چوارەم: هەوڵی قەتیس کردنی بانگەوازەکە لە مەککەدا:

بێباوەڕانی مەککە زۆر هەوڵیاندەدا بارێکی تایبەتی وا دروست بکەن کە هەر کەسێك هاتە مەککە، تێکەڵی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و موسڵمانان نەکات، بۆیە هەر وەفدێك دەهات پێشوەختە هۆشیارییان پێ دەدا نەکەیت نزیکی موحەممەد ببیتەوە، چونکە ئەو شێتە یان جادووگەرە یان . هتد، هەروەها هەوڵیان دەدا هێندە موسڵمانان سەرقاڵ بکەن بە ئەشکەنجەو برسێتی و کەنارخستن، ئیتر دەرفەتی ئەوەیان نەبێت خۆیان بگەیەننە کەسانی دەرەوەی مەککە، بەڵام ئەم هەوڵەشیان کاریگەریەکی سنووورداری هەبوو و نەیتوانی بەر بگرێت بە بانگەوازەکەی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم).

## پێنجەم: هەوڵی ئاوێتەکردنی بانگەوازەکە:

ئەمەش هەوڵێکی تری بێباوەڕان بوو کە زانییان کار لە کار ترازاوەو ئەم بانگەوازە هی لەناوچوون نیە، بیریان لەوە کردەوە بانگەوازەکە بگونجێنن لەگەڵ بەرژەوەندی و بیرکردنەوەی خۆیاندا، بۆ ئەمەش پێشنیاریان ئەکرد ڕۆژێك ئایینەکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کاری پێ بکرێت و ڕۆژێك ئایینەکەی ئەوان، بە جۆرێك وا بکەن پێویست نەکات هیچ کەس واز لە ئایینەکەی ئەوان بهێنێت بۆ ئایینی ئیسلام، قورئانی پیرۆزیش ئەم بەسەرهاتەی تۆمار کردووە:

﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ١ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ٢ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ٣ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ٤ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ٥ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ٦ ﴾[1]

---

(١) الکافرون: ١-٦.

(ئەی موحەممەد! بڵێ: ئەی هۆزی کافرو بێ باوەڕان! دارو بەرد پەرستان! خوا نەناسان! ئەوەی ئێوە دەیپەرستن من نایپەرستم، من چی لە دارو بەرد بکەم؟ وە ئەوەش من ئەیپەرستم ئێوە نایپەرستن، وە منیش پەرەسندەی ئەوە نیم کە ئێوە پەرستووتانەو دەیپەرستن، ئێوەیش پەرەسندەی ئەو زاتە نین کە من ئەیپەرستم، جا کەوابوو دین و ئایینی خۆتان بۆ خۆتان و، منیش دین و ئایینی خۆم بۆ خۆم).

## شەشەم: هەوڵی شێواندنی پەیامەکەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم):

بێباوەڕانی قورەیش هەوڵیاندەدا بە بنیادنانی دیواری جیاوازی چینایەتی، گومان لەسەر راستی پەیامەکەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دروست بکەن، بۆیە بە پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) دەوت کاتێك ئێمە دێین بۆ لات، کەسانی هەژار و بێدەسەلاتی وەك سەعد و ئیبن مەسعوود و بیلال و کەسانی لەو چین و توێژە لە خۆت دوور بخەرەوە با تێکەڵی ئێمە نەبن، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) خەریك بوو بیر لەوە بکاتەوە شتێکی وا بکات بۆ ئەوەی بانگەوازەکە بگەیەنێت، خوای گەورە روونکردنەوەی پێدا و فەرمووی:

﴿ وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَىْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَىْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٢﴾ ﴾[١]

(تۆ هەرگیز ئەو کەسانە تار مەنێ کەبە بەیانیان و ئێواران یادی پەروەردگاریان دەکەن و بەدڵ و دەروونیش هەر رەزامەندی ئەویان ئەوێ، چونکە تۆ هیچ کارت بەکاری ئەوانەوە نییە و ئەوانیش هیچ کارێکیان بەسەر تۆوە نییە، بەڵکو حیسابی هەردوولاتان لای خوایە و ئەر تاریان بنێی، ئەوە دەچیتە ریزی ستەمکارانەوە).

---

(١) الأنعام: ٥٢.

## حەوتەم: هەوڵی زۆرکردنی نەیارانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم):

بۆ ئەمەش هەوڵیاندەدا هەموو دەوروبەریان بکەن بە دوو بەرە، بەرەی دۆستانی خۆیان و بەرەی دۆستانی موحەممەد، هەوڵیان دەدا سوود لە توانا هەمەچەشنەکانی دەوروبەر وەربگرن بۆ دژایەتی کردنی ئیسلام، لەوانە داوایان کرد لە جوولەکەکان برێ پرسیاری سەخت دابنێن بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەتا نەتوانێت وەڵامیان بداتەوەو بەوە گومان بخەنە سەر پەیامەکەی، ئەوانیش وتیان سەبارەت بە رۆح پرسیاری لێ بکەن، ئەوەبوو خوای گەورە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە:

﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ٨٥ ﴾[1].

## دوژمنە سەرسەختەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم):

لەو قۆناغەدا ئەگەرچی هەموو بێباوەڕانی قورەیش دژایەتی پەیامەکەی پێغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم) دەکرد، بەڵام چەند کەسێکیان خۆیان یەکلایی کردبوویەوە بۆ دژایەتی کردن و ئازاردانی خودی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ئەمانەش هەندێکیان بوون: (ئەبوولەهەبی مامی کە خوای گەورە ئایەتی لەبارەوە دابەزاندە خوارەوە، ئەبووسوفیانی کوڕی حارثی ئامۆزای کە دوای فەتحی مەککە موسڵمان بوو، عوتبەی کوڕی رەبیعە، شەیبەی کوڕی رەبیعە، عوقبەی کوڕی ئەبی موعەیط، حەکەمی کوڕی

---

(١) الإسراء: ٨٥.

ئەبولعاص کە دوای فەتی مەککە موسڵمان بوو، ئەبووسوفیانی کوڕی حەرب کە دوای فەتحی مەککە موسڵمان بوو، نەظری کوڕی حارث، ئەبولبوختەری، ئەبووجەهل، وەلیدی کوڕی موغیرە، عاصی کوڕی وائیل، ئومەییەی کوڕی خەلەف، ئوبەی کوڕی خەلەف، ئەسوەدی کوڕی موگهلیب، ئەسوەدی کوڕی عەبدیەغووپ ).

## پاڵپشتی نێوخۆیی موسڵمانان:

یەکێك لە دەستەی یەکەمی موسڵمانبوان کە ئەبووبەکری صدیق بوو، کەسێکی دەوڵەمەند بوو، کاتێك حاڵی هەندێ لە موسڵمانانی دەبینی لە چ ناڕەحەتیەکدان و سزا دەدران، بەتایبەت ئەو کەسانەی کۆیلە بوون و لەلایەن گەورەکانیانەوە سزا دەدران، لە دارایی تایبەتی خۆی دەستی کرد بە ئازادکردنی ژمارەیەك لەو کەسانە، لەوانە (بیلالی کوڕی رەباح، ئەبووفوکەیهە، عامیری کوڕی فوهەیرە، زەننیرە، جاریەی بەنی موئەممەل، نەهدیە)، مەبەستیشی لەم کارە وردەکاریەکی سیاسی یان ناوبانگێکی جەماوەری نەبوو، بەڵکو رەزامەندی خوا بوو هەتا کارئاسانی بکات بۆ ئەو موسڵمانانە، بۆیە کاتێك باوکی پێشنیاری بۆ کرد هیچ نەبێت با کۆیلە بەهێز و بەتواناکان ئازاد بکات و سوودیان لێ وەربگرێت و ببنە پاسەوان و پاڵپشتی، ئەویش وەڵامی دایەوە کە مەبەستی تەنها رەزامەندی خوایە، خوای گەورەش لەو بارەوە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە:

﴿ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾ ﴾ .. ﴿ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰٓ ﴿١٩﴾ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٠﴾ وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ ﴿٢١﴾ ﴾ [١]

---

(١) فضائل الصحابة لأحمد بن حنبل، الرقم ٦١، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٣٨٧٨ و قال على شرط مسلم، سكت عنه الذهبي.

# باسی چوارەم

## کۆچ بۆ حەبەشە

پاش ئەوەی قورەیش درێژەیان دا بە ئازاردانی موسڵمانان و هەوڵیان دەدا بنکەی یەکەمی بانگەوازی ئیسلامی لەناوبەرن، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بڕیاری دا دەستەیەك لە موسڵمانان کۆچ بکەن بۆ حەبەشە، ئامانج لە کۆچەکەش تەنها رزگاربوون نەبوو لە ئازاری قورەیش، چونکە بەشێکی دیاری ئەوانەی کۆچیان کرد کەسانێك بوون کە خزم و کەس و ناوبانگیان هەبوو لە مەککەدا، وەك عوثمانی کوڕی عەففان و زوبەیری کوڕی عەووام و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف و عوثمانی کوری مەظعوون،[١] بەڵکو ئامانجێکی گرنگی کۆچەکە بریتی بوو لە دروستکردنی بنکەیەکی تری بانگەوازی ئیسلامی و گەیاندنی دەنگی موسڵمانان بە دەرەوە و پەرتکردنی هێزی قورەیش لە بەرەنگاربوونەوەی بانگەوازەکەدا.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە هاوەڵانی فەرموو (إن بأرض الحبشة ملكا لا يظلم أحد عنده فالحقوا ببلاده حتى يجعل الله لكم فرجا ومخرجا مما أنتم فيه)[٢] (لە خاکی حەبەشە پاشایەك هەیە کە لەلای ئەو کەس ستەمی لێ ناکرێت، جا خۆتان بگەیەننە وڵاتەکەی هەتا خوا دەروو دەروازەیەکتان لێ

---

(١) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج١، ص ٢٠٤.

(٢) السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٦٤٧٧، صححه الألباني في السلسلة الصحيحة، الرقم ٣١٩٠.

ئەکاتەوە و لەو نارەحەتیەی تیایدان رزگارتان بێت)، ئەمەش شتێکی ئاسان نەبوو، چونکە هاوەڵان دەبوو زێدی خۆیان جێبهێڵن و بچنە خاکێ کە تیایدا نەژیاون، نەریت و ئایین و زمان و سروشتی تەواو جیاوازە بەوان.

ئەوەبوو لە هەنگاوی یەکەمدا لە سەرەتای پاییز و لە مانگی رەجەبی ساڵی پێنجەمی پێغەمبەرایەتیدا یانزە پیاو و چوار ئافرەت بە نهێنی کۆچیان کرد، سوارە و پیادەیان تێدا بوو، هەیانبوو بە خێزانەوەو هەشیانبوو بە تەنها بوو، قورەیش کە پێیان زانین کەوتنە دوایان، بەڵام تا گەیشتنە کەنار دەریا، ئەوان بە کەشتی پەڕیبوونەوە، دەستەی یەکەم بریتی بوون لە (عوثمانی کوڕی عەففان و روقییەی هاوسەری کە کچی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بوو، ئەبووحوذەیفەی کوڕی عوتبە و سەهلەی هاوسەری، ئەبووسەلەمەی کوڕی عەبدولئەسەد و ئوممسەلەمەی هاوسەری، عامیری کوڕی رەبیعە و لەیلای هاوسەری، زوبەیری کوڕی عەووام، موصعەبی کوڕی عومەیر، عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف، عوثمانی کوڕی مەظعوون، ئەبووسەبرە، حاطیبی کوڕی عەمر، سوهەیلی کوڕی بەیضاء، لەوێ رێزێکی زۆریان گیرا و هیچ ستەمێکیان لێ نەدەکرا.[١]

لەو ماوەدا جارێك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) قورئانی پیرۆزی بۆ دابەزی، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سوجدەی برد و هەرچی لە دوایەوە بوون سوجدەیان برد،[٢] جا چەند گێڕانەوەیەکی نادروست هاتون ناسراو بە بەسەرهاتی غەرانیق گوایە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دانی ناوە بە بتەکانی قورەیشدا و وەسفی کردون، هیچ بەڵگەی لەسەر نیەو لەگەڵ هەموو دەقەکانی قورئان و فەرموودەو رووداوە مێژووییەکاندا ناگونجێت.

کاتێك کۆچەرانی حەبەشە بەسەرهاتی سوجدە بردنەکەیان بیست، وایانزانی خەڵکی مەککە موسڵمان بوون، بۆیە بڕیاری گەڕانەوەیان دا و لە لە شەووالی

---

(١) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج١، ص ٢٠٤.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٣٧٧٤، صحيح مسلم، الرقم ٩٣٤.

هەمان ساڵدا گەڕانەوە بەرەو مەککە، کە نزیکبوونەوە لە مەککەو راستی مەسەلەکەیان بۆ دەرکەوت، ویستیان بگەڕێنەوە بەرەو حەبەشە، بەڵام دواجار بڕیاریان دا بە نهێنی بچنەوە ناو مەککە، هەندێکیشیان لەلایەن کەسوکار و ناسراوەکانیانەوە پەنا دەدران.[١]

دوای ئەوە قوڕەیش بیریان لەوە کردەوە هەرچۆنێکیان کردبێت کەسێتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بخەن، بەوە هەموو شوێنکەوتەکانی وازدێنن و چی باسوخواسێکیشی گەیشتبێتە دەرەوە دەپووکێتەوە، بۆ ئەمەش هەنگاوی یەکەمیان ئەوەبوو پشتگیری ئەبووطالیبی مامی لێ زەوت بکەن، وەفدێکیان ناردە لای مامی و پێشنیاری ئەوەیان بۆ کرد پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ناچار بکات دەست هەڵبگرێت، ئەویش ناچار بوو مەسەلەکە لەگەڵ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) باس بکات، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وەڵامی دایەوە کە هەرگیز ناتوانێت دەستبەرداری پەیامەکەی بێت،[٢] ئینجا داوایان لێکرد و وتیان دەی موحەممەدمان بدەرە دەست با خۆمان چارەی بکەین، لە بری ئەودا گەنجێکی جوان و هەڵکەوتەو بە توانات پێ دەدەین، ئەویش وەڵامی دانەوە موحەممەدتان بدەمێ بیکوژن و ئێوەش کوڕی خۆتان بدەن بە من تا بەخێوی بکەم بۆتان؟ بێ ویژدانی نیشان ئەدەن، بەوەش رازی نەبوو.[٣]

ئیتر دوای ئەوە ترسی ئەوە هەبوو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تیرۆر بکرێت، بۆیە جارێك کە دیار نەما، ئەبووطالیب ترسا کوشتبێتیان، خێرا گەنجانی بەنوهاشمی کۆکردەوەو هانیدان گەمارۆی سەرانی قوڕەیش بدەن و هەرکامیان بە چەکێکەوە بچێتە لای سەرکردەیەکیان، ئەوانیش وایانکرد، بەڵام چاوی کەوت بە زەیدی کوڕی حارثە و هەواڵی پێغەمبەری خوای (صلی الله

---

(١) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج١، ص ٢٠٦.

(٢) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٦٥٠٨، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٤٣٥٦.

(٣) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج١، ص ٢٠٢.

علیه وسلم) لێ پرسی، ئەویش چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە ماڵی ئەرقەم و مەسەلەکەی بۆ باسکرد، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گەڕایەوە بۆ لای ئەبووطالیب، ئینجا ئەبووطالیب بە سەرانی قوڕەیشی وت دەزانن بە تەمای چی بووم؟ وتیان چی، بە گەنجەکانی وت چەکەکانتان نیشان بدەن، ئەوانیش چەکەکانیان ئاشکرا کرد، ئەبووطالیب وتی ئەگەر موحەممەدتان کوشتبایە بە تەما بووم فەرمان بکەم هەمووتان بکوژرێن، بەوە ترسێکی زۆر لە دڵی بێباوەڕاندا نیشت.[١]

وێڕای ئەوەش دەستیان هەڵنەدەگرت لە ئازاردانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) چونکە دەیانزانی بانگەوازەکە بەردەوام لە تەشەنەسەندندایە، ئەو دژایەتیەش هەر بە زیانیان دەشکایەوە، بۆ نموونە دژایەتی ئەبووجەهل بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بوویە هۆی موسڵمانبوونی حەمزەی مامی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، موسڵمانبوونی حەمزە خاڵێکی وەرچەرخان بوو بۆ موسڵمانان، چونکە کەسێتیەکی دلێر و نەبەرد بوو،[٢] هەروەها عومەری کوڕی خەططابیش کە پێشتر نەیارێکی سەرسەختی موسڵمانان بوو، هەر بە هۆکاری ئازاردانی موسڵمانان و نزای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆ موسڵمانبوونی باوەڕی هێنا، موسڵمانبوونیشی شکۆ و عیززەتی بەخشی بە موسڵمانان.[٣]

هەنگاوێکی تر کە قوڕەیش دەیانویست پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) پێ بشکێنن، داوای موعجیزەیان لێ دەکرد هەتا لە داواکاریەکدا دەستەوسان بوەستێت و ئەوانیش بیکەنە بەڵگەی نادروستی پەیامەکەی، یان رەخنەی ژیانی رۆژانەیان لێ دەگرت، قورئانی پیرۆز هەندێ لەو بیانووانەی تۆمار کردووە:

---

(١) ابن سعد: الطبقات الکبری، ج١، ص ٢٠٢-٢٠٣.

(٢) المستدرك علی الصحیحین، الرقم ٤٨٣١.

(٣) صحیح البخاري، الرقم ٣٥٠٢، صحیح ابن حبان، الرقم ٦٩٩٠.

﴿ وَقَالُواْ مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ يَأۡكُلُ ٱلطَّعَامَ وَيَمۡشِي فِي ٱلۡأَسۡوَاقِ لَوۡلَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مَلَكٞ فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا ٧ ﴾[١]

(خوا نەناس و کافران گوتیان: بۆ ئەوچی لەئێمە زیاترە، وا داوای پەیامبەرێتی ئەکات؟ وای ئەمە چ پەیامبەرێکە، خۆراك دەخوا و بە بازاڕیشدا دەگەڕێ؟ ئەی بۆچی فریشتەیەکی لەگەڵ نەهات لە لایەن خواوە تا بەهاوڕێیەتی ئەو خەڵك بترسێنن ئەگەر راست دەکا پێغەمبەرە؟)، هەروەها:

﴿ وَقَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفۡجُرَ لَنَا مِنَ ٱلۡأَرۡضِ يَنۢبُوعًا ٩٠ أَوۡ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٞ مِّن نَّخِيلٖ وَعِنَبٖ فَتُفَجِّرَ ٱلۡأَنۡهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفۡجِيرًا ٩١ أَوۡ تُسۡقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمۡتَ عَلَيۡنَا كِسَفًا أَوۡ تَأۡتِيَ بِٱللَّهِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ قَبِيلًا ٩٢ أَوۡ يَكُونَ لَكَ بَيۡتٞ مِّن زُخۡرُفٍ أَوۡ تَرۡقَىٰ فِي ٱلسَّمَآءِ وَلَن نُّؤۡمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيۡنَا كِتَٰبٗا نَّقۡرَؤُهُۥۗ قُلۡ سُبۡحَانَ رَبِّي هَلۡ كُنتُ إِلَّا بَشَرٗا رَّسُولٗا ٩٣ ﴾،[٢]

(موشریکە خۆ بەزلزانەکانی مەککە دوای ئەوەی کە لە بەربەرەکانێ کردن لەگەڵ قورئاندا بێ ئومێدبوون و پەکیان کەوت گوتیان: هەرگیز ئێمە بڕوات پێ ناکەین ئەی موحەممەد! تا لەو زەوییە وشکەی مەککەیە "کانی" ئاوێکمان بۆ هەڵنەقوڵێنیت و ئاوەکەیشی هەمیشەو بەردەوام بێت، یا خود باغێکی پڕ لە خورماو ترێت هەبێ، و جۆگەو چۆمە ئاوو ڕووباری زۆرو فراوان لەناویا هەڵقوڵێنیی و بە بندارەکانییدا بەخوڕەم بڕوات، یاخود پارچە پارچەی ئەم ئاسمانەمان بەسەردا بخەیت، هەر وەکو خۆت خەیاڵت دەکردو دەت ترسانین و، هەڕەشەت لێ دەکردین و پێت دەگوتین: ئەگەر بڕوا نەهێنن خوا سزاتان دەدات، یاخود خوای گەورەو فریشتەکانی هەردوو بێنە پێش چاومان و ڕوبەڕوومان بکەیت و بیان بینین، یا ماڵ و کۆشکێکی گەورەت لەزێڕ هەبێ و نەخشێنرابێت، وە یان لە پێش چاوماندا بەرەو ئاسمان سەرکەویت هێشتا بەوەش هەر باوەڕت پێناکەین، هەتا لەگەڵ خۆتدا

---

(١) الفرقان: ٧.

(٢) الإسراء: ٩٠ - ٩٣.

نامەیەکمان بەزمانی خۆمان بۆ دێنیی و بیخوێنینەوەو دان بە پێغەمبەریێتی تۆدا بنێ!! بڵێ: پاك و خاوێنی و بێگەردی هەر بۆ پەروەردگارەکەمە، لەوەی کە ئێوە پێشنیاری لەسەر دەکەن، بۆچی من چیم تا ئەوانە داوای شتم لێ بکەن؟ مەگەر من تەنها پێغەمبەرێك نیم لە گرۆی ئادەمیزاد؟)

بەڵام بە فەرمانی خوا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) داواکاریەکانی جێبەجێ نەکردن، چونکە ئەوان ئامانجیان بەڵگەکە نەبوو، بەڵکو تەنها گاڵتەو دژایەتی بوو، خوا نیەتی دڵی بێباوەڕانی لەو داواکاریانەیاندا ئاشکرا کرد:

﴿ وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَٰبًا فِى قِرْطَاسٍ فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ لَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ۝٧ ﴾[1]

(ئەوساکەیش کە هاتنە لات دەکەونە شەڕە قسەو چەلەحانێ لەگەڵت کافرو بێ باوەڕەکان دەڵێن: ببێ و نەبێ ئەم قورئانە هەر ئەفسانەو (ئوستورە)ی پێشووەکانە، لەوە بەولاوە شتێکی دی نیە)، بەڵکو خوای گەورە قورئانی کرد بە موعجیزە بۆیان:

﴿ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَىٰ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ۝٥١ ﴾[2]

(مەگەر ئەوانە داوای بەڵگە ئەکەن، ئەوەیان بەس نیە کە ئێمە قورئانمان بۆ ناردویت و بەسەریاندا ئەخوێنرێتەوە؟ تا بیکەنە بەڵگە بۆ ڕاستی تۆ؟ بەراستیی لەو قورئانەدا بەزەیی و ئامۆژگاری هەیە، بۆ هەر قەوم و هۆزێ، بیانەوێ باوەڕ بێنن).

---

(١) الأنعام: ٧.

(٢) العنكبوت: ٥١.

## کۆچی دووەمی حەبەشە:

پاش ئەوەی قورەیش نەیانتوانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بشکێنن، هەمدی کەوتنەوە بەکارهێنانی ئەشکەنجەو ئازاردانی موسڵمانان، بۆیە جارێکی دی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) مۆڵەتی دا موسڵمانان کۆچ بکەن بۆ حەبەشە، هەشتاو سێ پیاو و هەژدە ئافرەت کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، لە کۆچی دووەمدا موسڵمانان تووشی نارەحەتیەکی زۆر بوون، چونکە قورەیشیەکان هەوڵیان دەدا رێگرییان لێ بکەن.[1]

قورەیشیەکان هەوڵیاندا لەبری رێگرتن لە کۆچکردنیان، لە رێی دەسەڵاتدارانی حەبەشەوە موسڵمانان بێهیوا بکەن لە کۆچکردن بۆ حەبەشە، بۆیە دیاریەکی زۆریان کۆکردەوەو دیارییان بۆ نەجاشی و یەك یەکی دەست و پێوەندەکانی ئامادە کرد بۆ ئەوەی گومانی بەدینەهاتنی خواستەکەیان نەهێڵن، ئەو هەوڵەشیان ئەگەرێکی زۆری سەرکەوتنی پێ بەخشین، بەڵام ویستی خوا وابوو نەجاشی دواتر ملکەچی رای دەست و پێوەندەکانی نەبێت، عەمری کوڕی عاص و عەبدوڵای کوڕی ئەبی رەبیعەیان بە نوێنەری هەموویان ناردن، ئەو دوانە پێش ئەوەی بچنە لای نەجاشی قەناعەتیان بە دەست و پێوەند و راوێژکارەکانی کرد موسڵمانەکانیان بدەنەوە دەست، ئینجا کە چوونە لای نەجاشی جەختیان لە سێ تەوەرە کردەوە:

پەیوەندی پتەوی نێوان ئەوان و نەجاشی،

لاساری و دەرچوونی موسڵمانان لە هۆز و کەسوکاری خۆیان،

دژایەتی موسڵمانان لەگەڵ ئایینی مەسیحیەت و هێنانی ئایینێکی نوێ کە تا ئێستا ریشەی نەبووە،

---

(١) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج١، ص ٢٠٧.

لە بەرامبەردا نەجاشی بڕیاریدا دەبێت گوێ لە موسڵمانان بگرێت ئینجا بڕیاری کۆتایی بدات، جەعفەر وەك نوێنەری موسڵمانان قسەی کرد و لە وتەکەیدا جەختی لەم تەوەرانە کردەوە:

تاوانباری و گومڕایی پێشتری قوڕەیشیەکان لە بوارە جیاجیاکاندا.

پاکی و پێگەی بەرزی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەنێویاندا.

جوانی و ڕەوایی ڕێنماییەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆیان.

ستەمی قوڕەیش بەرامبەر موسڵمانان.

وەسفی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ دادپەروەری نەجاشی.

دواجار لەسەر خواستی نەجاشی بڕێك لە قورئانیشی خوێندەوە، نەجاشی و دەوروبەرەکەشی کە گوێیان لێگرت پێی سەرسام بوون و گریان، نەجاشی دانی بەوەدانا کە پەیامەکەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سەرچاوەکەی هی هەمان ئەو پەیامەیە کە بۆ مووسا و عیسا هاتووە، ئینجا نوێنەرانی قوڕەیشی بە دیاریەکانیانەوە ناردەوەو دڵنیایی بەخشی بە موسڵمانان تا لە حەبەشە بمێننەوە.(١)

موسڵمانانی ناو حەبەشە تا فەتحی خەیبەر لە ساڵی حەوتەمی کۆچی لەوێ مانەوەو ڕێزی زۆریان دەگیرا و پەیوەندییان لەگەڵ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و نەجاشیشدا هەبوو و هەواڵی کۆچی موسڵمانان بۆ مەدینە و جەنگی بەدر و وردەکاریەکانی تریان پێ دەگەیشت، جارجارە ڕێنمایی پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) پێ دەگەیشت، لەوێ چەند منداڵیان بوو، ژمارەیەکی بەرچاویش لە حەبەشیەکان بە خودی نەجاشیشەوە موسڵمان بوون.(٢)

---

(١) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٦٧٤، صحيح ابن خزيمة، الرقم ٢١٠١، حسنه شعيب الأرناؤوط.

(٢) وردەکاری هەریەك لەوانەمان لە کتیبی (ناسینی هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دا لە ژیانی هەریەك لە کۆچەرانی حەبەشەدا باسکردووەو لەبەرئەوەی لێرەدا ئامانجمانە بە پوختی باسی بکەین، ناچینە وردەکاری سەلماندنی هەریەك لەو خاڵانە.

# باسی پێنجەم

## خۆگرتنی موسڵمانان

### گەمارۆ خستنە سەر بەنوهاشم:

زۆربوونی ژمارەی موسڵمانان و بڵاوبوونەوەی ئایینەکە لە دەرەوەی مەککەو موسڵمانبوونی حەمزەو عومەری کوڕی خەططاب و پەیداکردنی حەبەشە وەك پەناگەیەك بۆ موسڵمانان، هەموو ئەمانە قوڕەیشیان ناچارکرد بیر لە سزادانی قورستر بکەنەوە، ئەویش گەمارۆ خستنە سەر بەنوهاشم بوو بە چەشنێك هەموو مامەڵەیەکی ئابووری و کۆمەڵایەتییان لەگەڵ بپچڕێنن تا کاتێك هاشمیەکان پێغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم) دەدەنە دەست، ئەمەشیان کردە بڕیارێکی رەسمی و بە نووسراو نووسییان و هەڵیانواسی بە کەعبەوەو هەموانیش جێبەجێیان کرد، ماوەی سێ ساڵ گەمارۆکە بەردەوام بوو و موسڵمانان تووشی ناڕەحەتیەکی زۆر بوون،[1] برسێتی خەریك بوو لەناوی دەبردن، تەنها بە نهێنی خواردنێکی کەمیان پێ دەگەیشت،[2] ناچار دەبوون بە خواردنی گەڵای دارەکانیش، دواجار هەستی هەندێ لە بێباوەڕانی قوڕەیش بزوا و بڕیاریان دا کۆتایی بەو سزادانە بهێنن، هەرچەند هەڵوێستی بەرگریکاریی هەبوو، بەڵام دواجار هەڵوێستی هەڵوەشاندنەوەی گەمارۆکە سەرکەوت.[3]

---

(١) ابن سعد: الطبقات الکبری، ج١، ص ٢٠٩.

(٢) ابن کثیر: البدایة والنهایة، ج٣، ص ٨٨.

(٣) ابن کثیر: البدایة والنهایة، ج٣، ص ٨٥.

دوای ئەوە لە ماوەیەکی کەمدا هەریەك لە ئەبووطالیبی مامی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە بێباوەڕی[١] و خەدیجەی کچی خوەیلیدی هاوسەری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە باوەڕداری وەفاتیان کرد،[٢] ئەمەش کاریگەری زۆری هەبوو، چونکە خەدیجە پاڵپشت و دڵنەوای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و ئەبووطالیبیش بەرگریکاری پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بوو، دوای مەرگی ئەبووطالیب قوڕەیش ترسیان نەما و کەوتنە ئازاردانی خودی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، وەك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت (ما زالت قريش كاعة حتى توفي أبو طالب)[٣] (قوڕەیش ترسنۆك بوون هەتا ئەبووطالیب مرد).

جارێك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لای کەعبە نوێژی دەکرد، عوقبەی کوڕی ئەبی موعەیط جلێکی خستە گەردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و خەریك بوو بیخنکێنێت هەتا ئەبووبەکر هات و دووری خستەوە لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم).[٤]

جارێکی تر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نوێژی دەکرد، بێباوەڕان وەستان تا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چوویە سوجدە، ئەوکات عوقبەی کوڕی ئەبی موعەیط پیسایی ناوسکی ئاژەڵی کرد بەسەر شانی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) و هەموان دەستیان کرد بە پێکەنین، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە سوجدەدا مایەوە هەتا فاطیمەی کچی هات و لایبرد.[٥]

هاوکات هاوەڵانی تر و لەنێویشیاندا ئەبووبەکریش ئازار دەدران، بۆیە ئەبووبەکر داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کرد تا کۆچ بکات

---

(١) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٣، ص ١٢٢-١٢٦.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٣٧٠٥ و خبر دخولها الجنة في صحيح مسلم، الرقم ٤٥٦٦.

(٣) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤١٨٧.

(٤) صحيح البخاري، الرقم ٣٦٦٥.

(٥) صحيح البخاري، الرقم ٢٣٧، صحيح مسلم، الرقم ٣٤٣٧.

بۆ حەبەشە و پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) مۆڵەتی دا، ئەبووبەکر کەوتەڕێ و لە سەرەتای ڕێدا ئیبن دوغنەی پێگەیشت و پاشگەزی کردەوە لە کۆچکردنەکەی و پەنای دا، دواتر لەژێر فشاری بێباوەڕاندا پەناکەی لە ئەبووبەکر وەرگرتەوەو جارێکی دی بێباوەڕان کەوتنەوە ئازاردانی ئەبووبەکر.[١]

رووکـردنە طـائیـف:

پاش ئەوەی قوڕەیشیە بێباوەڕەکان چاوقایمیان نواند لە ئازاردانی موسڵمانان‌دا، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بیری لەوە کردەوە بنکەیەکی دی پەیدا بکات بۆ بانگەوازەکە، بۆیە لە کۆتاییەکانی مانگی شەووالی ساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتیدا هاودەم بە زەیدی مەولای روویکردە شاری طائیف کە بنکەی دووەمی هێز و بڕیار بوو لە حیجازدا، ماوەی دە رۆژ مایەوەو چاوی کەوت بە هەرچی کەسایەتی و سەرکردەی ناو شارەکە بوو، بەڵام هیچکام پاڵپشتییان نەکرد، بەڵکو هەرزەکارەکانیان هاندان هەتا بەردبارانی بکەن هەتا قاچەکانی خوێناوی کران،[٢] پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەرەو مەککە گەڕایەوەو بێتاقەتی و خەفەتێك دایگرت تا نەگەیشتە ناوچەی قەرنوپهعالیب ئەو بێتاقەتیە بەری نەدا، لەوێ جیبریل هات بۆ لای و زانیاری پێدا کە خوای گەورە فریشتەی شاخەکانی ناردووە هەتا ئەگەر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمان بکات چۆن بیەوێت سزای ئەو خەڵکە بدات، بەڵام پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چاوی لە نەوەکانی ئەو خەڵکە بوو و فەرمووی (هیوام وایە خوا لە پشتی ئەمانەوە کەسانێ دەربکات کە تەنها خوا بپەرستن و هیچ هاوەڵێکی بۆ بڕیار نەدەن).[٣]

---

(١) مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٥٠٥٢، صحیح البخاري، الرقم ٢١٩٧، صحیح ابن حبان، الرقم ٦٣٦٨.

(٢) ابن سعد: الطبقات الکبری، ج١، ص ٢١٢.

(٣) صحیح البخاري، الرقم ٣٠٧٥، صحیح مسلم، الرقم ٣٤٤٠.

ئینجا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لای حیراء لایدا و ناردی بە شوێن چەند کەسێکدا تا یەکێکیان پەنای بدەن، بەڵام هیچکام رازی نەبوون، دواتر موطعیمی کوڕی عەدی رازی بوو و بە بەرچاوی هەموانەوە پەناکەی راگەیاند،[1] پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هیچ کات ئەو هەڵوێستەی موطعیمی بیر نەدەچوویەوە، تەنانەت لە کاتی دیلگرتنی بێباوەڕان لە بەدردا فەرمووی (ئەگەر موطعیمی کوڕی عەدی زیندوو بوایەو سەبارەت بەم بۆگەنانە قسەی لەگەڵ بکردمایە، بەرم دەدان بۆی).[2]

## شەورەوی:

خوای گەورە لە قورئاندا هەریەك لە شەوڕەوی و بەرزکردنەوەی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) بۆ ئاسمان باسکردووە:

﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١﴾ ﴾[3]

(پاکەو خاوێنە لەهەرشتێکی ناپەسەندو خراپ، ئەو خوایەی کە شەوڕەوی بە بەندەی خۆی کرد لە بەشێکی زۆر کەمی شەوێکدا لەمزگەوتی (حەرام) ـەوە لە مەککەدا بۆ مزگەوتەکەی ئەولاتر (بيت المقدس)، ئەو مزگەوتەی ئێمە دەوروبەریمان پیرۆزو پیتدارکرد بەجۆرەها نیعمەت و میوەو میوەجات و، کردیشمانە بارەگای پەیامبەران، تا هەندێ لە نیشانەکانی دەسەڵات و توانایی خۆمانی پێ نیشان بدەین لەو شەو ڕەویەدا چونکە هەرئەوە زۆر بیسەندە بۆ قسەو گوفتاری مەردم، زۆر بیناو بەئاگا بە ئەحواڵی گشت مرۆڤەکان).

---

(١) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٣، ص ١٣٧-١٣٨.

(٢) مسند احمد بن حنبل، الرقم ١٦٤١٠، صحيح البخاري، الرقم ٢٩٨٧، سنن أبي داود، الرقم ٢٣٢٨.

(٣) الإسراء: ١.

﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ﴿١٥﴾ إِذْ يَغْشَى ٱلسِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ ﴿١٦﴾ مَا زَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ﴿١٧﴾ لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلْكُبْرَىٰٓ ﴿١٨﴾ ﴾[١]

(وە بێگومان پەیامبەر جارێکی تریش لە دابەزینێکی تردا جبریلی دیتووە لە شێوەی خۆیداجاری دووەمیش لەلای (سدرة المنتهى)دا لەلایەتی بەهەشتی (جێی دانیشتن و حەوانەوە) ئەوکاتەی دیتی، سیدرەی داپۆشی ئەو شتەی دایئەپۆشی وە چاوی پێغەمبەر کلا نەبوو لەوەی دیتی، تەجاوزیشی نەکرد لەوەی بۆی دیاریکرابوو، بەراستی پێغەمبەر گەلێك بەڵگەو نیشانەی گەورە گەورەی پەروەردگاری خۆی لە سەفەرەکەیدا بینیی).

سەبارەت بە کاتی روودانەکەی نزیکەی دە بۆچوونی جیاواز هەیە، هەندێ دەڵێن ساڵێك پێش هیجرەت بووە، یانزە مانگ یان حەڤدە مانگ یان هەژدە مانگ یان سێ ساڵ یان پێنج ساڵ و چەندی تر.[٢]

سەبارەت بە گرنگترین رووداوەکانی شەوڕەوی بریتین لە: (لەتکردنی سنگی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) و شۆردنی دڵی، سواربوونی بوراق، هاودەمی جیبریل،[٣] چوون بۆ بەیتولمەقدیس و نوێژکردن تیایدا،[٤] بینینی دەجال،[٥] بەرزبوونەوە بەرەو ئاسمان و بینینی یەك یەکی ئاسمانەکان و بینینی هەندێ پێغەمبەران لە هەر ئاسمانێکدا و بینینی سیدرەتولمونتەها و رووبار و بەیتولمەعموور لە ئاسمانی حەوتەم، هەڵبژاردنی شیر لەنێوان شیر و مەیدا، فەڕزبوونی نوێژە فەڕزەکان،[٦] بەرنوێژی کردن بۆ پێغەمبەران،[٧] دەیان رووداوی تر و بینینی

---

(١) النجم: ١٣ - ١٨.

(٢) فتح الباري، ج٧، ص ٢٠٣.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ٣٦٩٦.

(٤) صحيح مسلم، الرقم ٢٦٠.

(٥) مسند احمد بن حنبل، الرقم ٣٤١٩، صححه شعيب الارناؤوط.

(٦) صحيح البخاري، الرقم ٣٦٩٦.

(٧) صحيح مسلم، الرقم ٢٧٧.

زۆر شت کە لە کتێبەکانی فەرموودەدا باس کراون، گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ مەککە و باسکردنی بەسەرهاتەکە بۆ خەڵکەکە بە گشتی،[١] بێباوەڕان بڕوایان پێ نەکرد و گاڵتەشیان پێ دەکرد،[٢] ئینجا کەوتنە پرسیارکردن لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سەبارەت بە وەسفی بەیتولمەقدیس و ئەویش وەڵامی دەدانەوە،[٣] داوای بەڵگەیەکیان دەکرد کە بیسەلمێنێت رۆیشتووە، ئەویش بەڵگەی پێ دان و فەرمایشتەکەشی راست دەرچوو،[٤] ئینجا چوون بۆ لای ئەبووبەکر بەڵکو ئەو بەسەرهاتە بکەنە بەڵگەیەك تا پەشیمان بێتەوە، ئەبووبەکریش وتی بڕوای پێ دەکەم.[٥]

لە دوای شەوڕەویەوە نوێژ دەکرا و رووگەی موسڵمانان رووەو بەیتولمەقدیس بوو هەتا لە مەدینەدا قیبلە گۆڕا بۆ کەعبە.[٦]

لەتکردنی مانگ: بێباوەڕانی قوڕەیش بەردەوام داوای موعجیزەیان لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەکرد بەو هیوایەی بە درۆی بخەنەوە، جا جارێك بێباوەڕان داوای نیشانەو موعجیزەیەکیان کرد، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لەتکردنی مانگی نیشاندان هەتا لەنێوان هەردوو بەشی مانگدا کێوی حیرائیان دەبینی.[٧]

بەسەرهاتی لەتکردنی مانگیش لە قورئانی پیرۆزدا باسکراوە، کاتێك ئەو موعجیزەیە روویدا، خوای گەورە ئایەتی دابەزاندە خوارەوە:

---

(١) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٣٤١٩، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ١٠٨٣٦.

(٢) مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٧١٦، صححه شعيب الأرناؤوط.

(٣) صحيح مسلم، الرقم ٢٧٧.

(٤) سيرة ابن هشام، ج٢، ص ٢٤٩.

(٥) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٣٥٥ و صححه الحاكم و وافقه الذهبي.

(٦) مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٨٧٥، صححه شعيب الأرناؤوط.

(٧) صحيح البخاري، الرقم ٣٦٧٧.

﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ۝١ وَإِن يَرَوۡاْ ءَايَةٗ يُعۡرِضُواْ وَيَقُولُواْ سِحۡرٞ مُّسۡتَمِرّٞ ۝٢﴾ [١]

(ڕۆژی قیامەت نزیك بۆتەوە، مانگیش لەتبوو وە ئەگەر هەر بەڵگەو نیشانەیەك ببینن کە: بەڵگەبێ لەسەر ڕاستیی پێغەمبەر، پشت هەڵدەکەن و گوێی نادەنێ و ئەڵێن ئەمە جادوویەکی هەمیشەیی و هەموو کاتییە)، بەڵام بێباوەڕان لە بری باوەڕهێنان تۆمەتی جادوویان دایە پاڵ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم).

چاوپێکەوتن لەگەڵ هۆزەکان: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەو ماوەدا سەردانی هۆزەکانی دەکرد و پێشنیازی موسڵمانبوون و داڵدەدانی لای هەموویان دەخستەڕوو و دەیفەرموو (کێ هەیە پەنام بدات؟ کێ هەیە سەرم بخات هەتا پەیامی پەروەردگارم بگەیەنم و ئەویش بەهەشتی دەست بکەوێ)،[٢] پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێشنیارەکەی بردە لای هەریەك لە هۆزەکانی (هەمەدان،[٣] بەنی عامیر بن صەعصەعە کە داوای جێگرتنەوەی پێغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم) دەکرد دوای خۆی،[٤] کیندیەکان کە قسەکانیان پێ جوان بوو، بەڵام ئامادە نەبوون بڕوای پێ بهێنن و ببنە پاڵپشتی،[٥] بەنی حەنیفە کە زۆر بە ناشیرینی وەڵامی پێغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم) دایەوە،[٦] بەنوشەیبانیش رازی نەبوون،[٧] عەبسیەکان کە

---

(١) القمر: ١-٢.

(٢) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٤١٧٠، صححه شعيب الأرناؤوط وقال على شرط مسلم.

(٣) مسند احمد بن حنبل، الرقم ١٤٩٠١، صححه شعيب الأرناؤوط.

(٤) سيرة ابن هشام، ج٢، ص ٢٧٢.

(٥) دلائل النبوة للأصبهاني، الرقم ٢١٨.

(٦) دلائل النبوة للأصبهاني، الرقم ٢١٨.

(٧) دلائل النبوة للأصبهاني، الرقم ٢١٠.

ئەمانیش رازی نەبوون،[١] کەلبیەکان کە ئەمانیش ئامادەییان نەبوو،[٢] ویستی خوا وابوو هەموو ئەمانە نەبنە پەناگەی بانگەوازی ئیسلامی هەتا کەسانی شیاو بەو کارە بێنە پێشەوە کە ئەوانیش پشتیوانان بوون.

## پەیوەندی لەگەڵ پشتیوانان:

یەکەم چاوپێکەوتنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ پشتیوانان لە حەجی ساڵی یانزەی پێغەمبەرایەتی لە وەرزی بەهاردا بوو، ئەم چاوپێکەوتنە رێخۆشکەر و ئامادەکاری بوو بۆ هەردوو بەیعەتی عەقەبەی یەکەم و دووەم، لەو چاوپێکەوتنەدا شەش کەس ئامادە بوون، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) قورئانی بۆ خوێندنەوەو ئەوانیش باوەڕیان هێنا و بە ئیمانەوە گەڕانەوە مەدینەو لەوێ کەوتنە باسکردنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)،[٣] بۆیە بۆ ساڵی داهاتوو پێنج کەس لە وەفدی پێشوو و حەوت کەسی تر لە پشتیوانان هاتنەوە بۆ مەککە، دە کەسیان لە خەزرەجیەکان و دوو کەسیش لە ئەوسیەکان، ئەمانە وادەی یەکتربینینیان لەگەڵ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە عەقەبە بوو و لەوێ بەیعەتیان پێدا،[٤] پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەیعەتی لێ وەرگرتن لەسەر خۆپاراستن لە شیرك و دزی و زینا و کوشتنی منداڵەکانیان و بوختانکردن و لادان لە چاکە.[٥]

ئەم وەفدە کاتێك ویستیان بڕۆنەوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) موصعەبی کوڕی عومەیری نارد لەگەڵیاندا تا قورئان خوێندنیان فێر بکات

---

(١) دلائل النبوة للأصبهاني، الرقم ٢١٦.

(٢) سيرة ابن هشام، ج٢، ص ٢٧١.

(٣) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٢٧٧.

(٤) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٣، ص ١٥٠.

(٥) صحيح البخاري، الرقم ٣٧٠١.

و شارەزایان بکات لە ئیسلامدا،[١] موصعەبیش سەرکەوتوانە توانی ئەرکی خۆی بەجێ بگەیەنێت و خەڵکێکی زۆر لە مەدینەدا موسڵمان ببن،[٢] ئەمەش بارودۆخەکەی لەبار کرد هەتا سەرەتای گواستنەوەی بنکەی بانگەوازی ئیسلامی بۆ مەدینە دەربکەوێت.

بۆ ساڵی دواتر کە ساڵی دوانزەهەمی پێغەمبەرایەتی بوو، حەفتا و سێ پیاو لە پشتیوانان لە وەرزی حەجدا چاویان کەوت بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و لە عەقەبە بە ئامادەبوونی عەبباسی مامی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەیعەتی دووەمی عەقەبەیان ئەنجامدا و تیایدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەیعەتی لێ وەرگرتن[٣] (تبايعوني على السمع والطاعة في النشاط والكسل، وعلى النفقة في العسر واليسر، وعلى الأمر بالمعروف، والنهي عن المنكر، وعلى أن تقولوا في الله لا تأخذكم فيه لومة لائم، وعلى أن تنصروني إذا قدمت يثرب، فتمنعوني مما تمنعون منه أنفسكم وأزواجكم وأبناءكم ولكم الجنة)، (لەسەر: گوێڕایەڵی لە هەموو کاتێکدا، خەرجی و پاڵپشتی لە خۆشی و تەنگانەدا، فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە، ئەگەر پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کۆچی کرد بۆ مەدینە چۆن خۆیان و ماڵ و منداڵیان دەپارێزن ئەویش بپارێزن، لە بەرامبەردا بەهەشتیان بۆ هەبێت)، ئەوانیش بەیعەتیان پێدا،[٤] هەروەها دوو ئافرەتیش بەیعەتیان پێدا.[٥]

هەر لەو دانیشتنەدا دوانزە نەقیب دیاری کران کە نۆیان خەزرەجی و سیانیان ئەوسی بوون و بریتی بوون لە (ئەسعەدی کوڕی زورارە، بەرائی کوڕی مەعروور، عەبدوڵای کوڕی عەمری کوڕی حەرام، سەعدی کوڕی عوبادە، مونذیری

---

(١) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٣، ص ١٥٠.

(٢) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٣، ص١٥٢-١٥٣.

(٣) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٥٤٩٣، صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٢١ و حسنه الألباني.

(٤) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٤٣٦٤، صححه شعيب الأرناؤوط.

(٥) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٨، ص ١١.

کوڕی عەمر، رافیعی کوڕی مالیك، عەبدوڵای کوڕی رەواحە، سەعدی کوڕی رەبیع، عوبادەی کوڕی صامت، ئوسەیدی کوڕی حوضەیر، سەعدی کوڕی خەیثەمە، ریفاعەی کوڕی عەبدولمونذیر).

## کۆچ بۆ مەدینە:

دەستەی بەیعەتی عەقەبە کە گەڕانەوەو لە مەدینەدا کەوتنە بانگەوازکردن بۆ ئیسلام و ئامادەکاری بۆ ئەو بەڵێنەی بە پێغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم) دابوو کە ئەگەر کۆچی کرد وەك خۆیان بیپارێزن، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) لەلایەن خواوە رێنموونی پێ درا کە شوێنی هیجرەتی موسڵمانان یەثریبە، بۆیە بە هاوەڵانی فەرموو کامتان دەیەوێت با کۆچ بکات، هاوەڵانێکی زۆر کۆچیان کرد بۆ مەدینە و ژمارەیەك لەوانەش کە چووبوون بۆ حەبەشە کە ئەمەیان بیست گەڕانەوەو چوون بۆ مەدینە.[١]

موسڵمانان لەو کۆچەیاندا دوچاری نارەحەتی زۆر دەبوون، بێباوەڕان رێیان لێ دەگرتن و ئازاریان دەدان،[٢] بەڵام کە دەگەیشتنە مەدینە، لەلایەن پشتیوانانەوە رێزێکی زۆریان لێ دەنرا.

زۆربەی موسڵمانان کۆچیان کرد بۆ مەدینەو جگە لەوانەی توانای کۆچیان نەبوو، تەنها پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و ئەبووبەکر و عەلی مانەوە،[٣] ئەبووبەکریش ویستی کۆچ بکات، بەڵام پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێشنیاری بۆ کرد بمێنێتەوە تا پێکەوە کۆچ بکەن، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) چاوەڕێی رەزامەندی خوا بوو تا کۆچ بکات،[٤] لە

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٢١٩٧.

(٢) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٣، ص ١٧٢.

(٣) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج١، ص ٢٢٦.

(٤) صحيح البخاري، الرقم ٢١٩٧.

هەمان کاتدا قورەیش کۆبوونەوە تا پیلانی کوشتنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دابنێن پێش ئەوەی لە چنگیان دەربچێت،[١] هەتا ئەوەی خوای گەورە مۆڵەتی دا و هاودەم بە ئەبووبەکری صدیق بە وردەکاریەکی زۆرەوە دەستیان کرد بە کۆچەکەیان،[٢] عەلی ئامۆزایشی لە شوێنی خۆیدا جێهێشت.[٣]

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و ئەبووبەکر بەرەو مەدینە کۆچیان کرد و بێباوەڕانیش کە زانییان ڕۆیشتوون، هەوڵیان دا بیانگرن و کەوتنە گەڕان بە شوێنیاندا و خەلاتیشیان دانا بۆ هەر کەسێك کە بیانگرێت،[٤] لەولاشەوە موسڵمانان لە مەدینە هەموو بەیانیەك چاوەڕوانی هاتنی پێغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم) دەکرد، تەنانەت جوولەکەکانیش چاوەڕوان بوون و یەکەمجاریش جوولەکەیەك موژدەی گەیشتنی پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) دا بە موسڵمانان.[٥]

خەڵکی مەدینە لە سەربانیماڵەکان و لە کوچەو کۆڵانەکانەوە چاوەڕوانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بوون و بە گەیشتنیشی هەموان لە کێبڕکێی ئەوەدا بوون پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ببەنەوە ماڵی خۆیان،[٦] پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە مەدینە لە ماڵی ئەبووئەیووبی ئەنصاری مایەوە هەتا لە پەنا مزگەوتدا خانووی دروست کرد.[٧]

---

(١) تأريخ الأمم و الملوك، ج١، ص ٥٦٦.

(٢) صحيح ابن حبان، الرقم ٦٩٧٨، صححه شعيب الأرناؤوط.

(٣) تأريخ الأمم و الملوك، ج١، ص ٥٦٧.

(٤) صحيح البخاري، الرقم ٣٧١٤.

(٥) صحيح البخاري، الرقم ٣٧١٤.

(٦) صحيح مسلم، الرقم ٥٤٤٧.

(٧) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٢، ص ٢٣٤.

# باسی یەکەم

## بناغـەدانـــان

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە مەککەدا دەوڵەتی ئیسلامی لە دڵەکاندا دروست کرد و تاکە تاکەی هاوەڵانی پەروەردە کرد، لە قۆناغی مەدینەدا دەوڵەتی ئیسلامی لە ناو کۆمەڵگەیەکی گشتیدا دامەزرا و هەموو بوارەکانی ژیانی گرتەوە.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە هاتە مەدینە، دەبوو لەناو خودی مەدینەدا لەگەڵ پتشیوانان و دووڕوان و جوولەکەکاندا هەڵسوکەوت بکات، لە ئاستی دەرەوەش ئاگاداری هاوپەیمانێتیە دەرەکیەکان و مەترسیەکانی قوڕەیش و بارودۆخی موسڵمانانی حەبەشەو مەککەش بێت.

**قۆنــاغی مەدینە لە روانگەی سیاسیەوە سێ قۆناغی لەخۆدەگرت:**

قۆناغی بنیاد و بەرەنگاربوونەوەی هەوڵەکانی لەناوبردن.
قۆناغی رێککەوتن لەگەڵ قوڕەیش و گەیاندنی بانگەوازەکە بە دەرەوەی ناوچەکە.
قۆناغی شەپۆلی موسڵمانبوونی خەڵکی.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پاش ئەوەی کۆچی کرد بۆ مەدینە، سێ هەنگاوی زۆر گرنگی نا:

دروستکردنی مزگەوتێك وەك دامەزراوەیەکی نوێی باڵا.
یەکخستنی دڵەکان و ڕێکخستنیان.
پێکەوە ڕێکخستنی بیر و نەتەوە جیاوازەکان و دیاریکردنی ئەرك و مافەکانیان.

**یەکەم:** بنیادنانی مزگەوتێك بوو لە قوبائدا کە خوا وەسفی کردووە لەسەر تەقوا دامەزراوە[(١)]:

﴿لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا۟ ۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾﴾ [(٢)]

(هەرگیز تۆش - ئەی پێغەمبەر! - لە مزگەوتی وادا ڕامەوەستەو نوێژ مەکە، دڵنیابە ئەو مزگەوتەیە کە هەر یەکەم ڕۆژ لەسەر بناغەی تەقوا دامەزرا، بەهەقترە تۆ نوێژی تیا بکەیت، هەتا مزگەوتی (ضیرار) لەم مزگەوتەدا کۆمەڵە پیاوێکی تێدایە - لە پشتیوانان - زۆر حەزیانە لەهەموو چڵك و چەپەڵیەك و، لەهەر تاوان و گوناهێك پاك ببنەوە، دیارە خواش بۆخۆی پاکانی خۆش دەوێ) هەر لە دوای ئەوەش لە مەدینەدا مزگەوتێکی دروست کرد کە ئەویش بە هەمان شێوە لەسەر بنەمای تەقوا دامەزرا و ناسراوە بە مزگەوتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم).[(٣)]

**دووەم:** دروستکردنی برایەتیەکان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە مەککەدا موسڵمانانی لەسەر ئەوە پەروەردە کردبوو کە نزیکیی ئیمان پێش نزیکیی خوێن بخرێت، هەرکات نزیکیی خوێن هۆکار بوو بۆ نەهێشتن یان تێکدانی نزیکیی ئیمان، نابێت ڕێگە بەم حاڵەتە بدرێت و بوەستێنرێت، ئینجا لە مەدینەدا برایەتیەکەی تۆختر کردەوەو چەند هێڵێکی وردتری برایەتی لەنێوان موسڵماناندا کێشا، هێڵی برایەتی نێوان پشتیوانان و کۆچەران، هەر کۆچەریەکی

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٣٧١٤.

(٢) التوبة: ١٠٨.

(٣) صحيح مسلم، الرقم ٢٥٥٦.

لەگەڵ پشتیوانیەکدا کرد بە برای یەکدی تا ئاستێك کەسی کۆچەری میراتی لە برا پشتیوانیەکەی دەبرد، ئەمە ماوەیەکی زۆر بەردەوام بوو هەتا دواتر ئەو چەشنی میرات وەرگرتنە هەڵوەشایەوە،[1] پشتیوانان لەم بوارەدا نموونەی باڵای برایەتی و پشتیوانییان نیشاندا و بەسەرهاتی زۆر لەو بارەیەوە لە سەرچاوەکاندا تۆمار کراوە، هێڵی برایەتی نێوان خودی کۆچەران،[2] هەر کۆچەریەکی لەگەڵ کۆچەریەکی تردا کرد بە برا، هەروەها نەهێشتنی ناکۆکی نێوان ئەوس و خەزرەج، هەریەك لەمانەی بە جیا ئەنجام دا، بەوە یەکێتیەکی بەهێزی لەنێو موسڵماناندا دروستکرد.

**سێیەم:** نووسینەوەی پەڕاوی ڕێککەوتن (دەستووری مەدینە):

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە پەڕاوێکدا نووسراوێکی تۆمار کرد بۆ ڕێککەوتن لەگەڵ خەڵکی مەدینە کە ڕەزامەندی هەموو لایەنەکانی مەدینەی لەسەر بوو، هەریەك لە کۆچەران و پشتیوانان و جوولەکەکانیش ڕەزامەندییان لەسەر نیشاندا.

نامەکە تەنها بە گوفتار نەبوو، بەڵکو نووسرابوویەوە، بەشی پەیوەندی نێوان موسڵمانانی بە گشتی بە جیا باس کردبوو، هەروەها بەشی پەیوەندی نێوان جوولەکەکان و موسڵمانانیشی بە جیا باس کردبوو، هەروەها بەشی پەیوەندی هەموو دانیشتوانی مەدینەی لەگەڵ دەسەڵات و هێزەکانی دەرەوەو قوڕەیش بە تایبەتی بە جیا باس کردبوو.[3]

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٢١٩٨.

(٢) فضائل الصحابة لأحمد بن حنبل، الرقم ١٠٩٤، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٤٩٩٨.

(٣) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٣، ص ٢٢٤-٢٢٦.

# باسی دووەم

## پەیڕەوی جیهـاد

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە قۆناغی مەدینەدا تا کاتی وەفاتی نۆزدە غەزای ئەنجامدا،[١] لە هەشت غەزایاندا بەشداری جەنگی کرد،[٢] سەبارەت بە سەریەکانیش راجیایی هەیە، هەر لە چل و حەوتەوە[٣] هەتا سەد سەریە باسکراوە.[٤]

لە دیارترین ئەو غەزایانەی ئایەتیان لە بارەوە دابەزیوە بریتین لە (بەدر، ئوحود، خەندەق، خەیبەر، فەتحی مەککە، حونەین، تەبووك).

### هەنگاوەکانی پێش جەنگ:

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەوڵی داوە هەتا بکرێت بەشداری لە سوپادا خۆبەخشانە بێت و لە چەند حاڵەتێکی تایبەتدا نەبێت بەشداری گشتی پەیڕەو نەکردووە.

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٣٧٥٣، صحيح مسلم، الرقم ٣٤٦٩.

(٢) صحيح مسلم، الرقم ٣٤٧٢.

(٣) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٦.

(٤) فتح الباري، ج٨، ص ١٥٤.

لە کاتی واجبیشدا رەچاوی پیر و پەککەوتەو ئافرەت و منداڵ کراوە.

هێندەی لە تواناداا بوبێت لە رووی چەك و تفاقەوە ئامادەکاری پێشوەختەی کردووە.

ناونووسکردنی پێشوەختەی بەشداربوانی غەزاکە.

پێش دەرچوونی کاروباری ناوخۆی مەدینەی رێکخستووەو کەسی یەکەمی بۆ دیاری کراوەو بارودۆخی ئەمنی شارەکەشی دڵنیا کردووە.

گرنگی زۆری داوە بە بواری هەواڵگری و لەسەر بنەمای گومان هەنگاوی نەناوە.

رەحم و سۆزی هەبووە بۆ ئەو وشتر و ئەسپانەی بەکاریان هێناون، نەیهێشتووە لە توانای خۆیان زیاتر باریان لێ بنرێ.

ئامۆژگاری هەموو بەشداربوانی کردووەو رێنمایی جەنگی پێ داون.

گەڕاندنەوەی ئەو کەسانەی تەمەنیان کەم بووە یان توانای جەنگییان نەبووە.

رێنمایی بە موسڵمانان داوە پێش جەنگ بانگەوازی خەڵکەکە بکەن بۆ ئیسلام.

لایەنی دەروونی هاوەڵانی بەهێزکردووەو موژدەی بەهەشت یان سەرکەوتنی پێ داون.

ئامانجی جیهادی دەستنیشانکردووە کە سەرخستنی پەیامی ئیسلام و لابردنی بەربەستەکانی بەردەم بانگەوازە نەوەك خوێن ڕشتن و لەناوبردنی دوژمن، بۆیە دەبینین لە هەموو ماوەی ژیانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) جیا لە رووداوی بەنوقورەیچە ژمارەی کوژراوانی دوژمن نەگەیشتۆتە پێنج سەد کەس.

## هەنگاوەکانی جەنگ:

لە زۆربەی جەنگەکاندا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) شوێن و کاتی جەنگی دیاری کردووە.

رێی نەداوە هاوەڵانی لە رێنمایی و ئەخلاقی جەنگی دەربچن، وەك (کوشتنی ئافرەت یان منداڵ یان پیر یان کەسی مەدەنی یان کەسێ لە مەیدانی جەنگ هەڵدێ، زیان گەیاندن بە پەرستگاکان و بڕینی دارو درەخت و کاولکاری)، هەرکام لە هاوەڵانیش دەرچووبێت سەرکۆنەی کردووە تا جارێکی تر دووبارەی نەکاتەوەو ببێتە وانە بۆ هاوەڵانی تریش.

لانەدان لە فەرمانی سەرکردە و ئەمیری سوپا.

دوورگرتن لە شێواندنی تەرمی دوژمن و نەکوشتنی بریندارەکان و هەر کەسێ کە هەر موسڵمانێ پەنای دابێت.

خۆپاراستن لە ناپاکی کردن لە پەنادان و بەڵێن و رێککەوتنێ کە لەنێوان موسڵمانان و سوپای بەرامبەردا روویداوە.

سەرکردە هاودەم بە سەربازەکان بەشداری جەنگی کردووەو هاندەریان بووە.

## هەنگاوەکانی دوای جەنگ:

رێزگرتنی تەرمەکان، چ تەرمی موسڵمانان یان تەرمی دوژمن.

مامەڵەی جوان لەگەڵ دیلەکان و رێککەوتن لەسەر ئازادکردنیان.

ناچارنەکردنی خەڵکی ناوچە دەست بەسەردا گیراوەکان بە موسڵمان بوون و هێشتنەوەی ئازادی ئایینی.

دڵدانەوەی کەسوکاری شەهیدەکان و بەسەرکردنەوەیان.

هەر کوشتنێکی هەڵە روویبدایە، خوێن بابیەکەی دەدرا.

کۆکردنەوەی دەستکەوتەکان و دابەشکردنی بەسەر بەشداربواندا.

## سەرەتاکانی مەیدانی جیهاد:

هەنگاوی یەکەم بریتی بوو لە ناردنی چەند سەریەیەك بە بێ بەشداری خودی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، چونکە هەم دەوروبەری مەدینە بە نەیاران دەورە درابوو و دەبوو تێ بگەن کە موسڵمانان بێ ئاگا نین، هەم قورەیش بێخەم دانەنیشتبوون و خەیاڵیان لای لەناوبردنی بنکە نوێکە بوو، هەم جوولەکەکانیش بەرەبەرە هەستیان بە مەترسی کرد ئەگەر دەستی خۆیان نەوەشێنن، ئایینی نوێ بەهێزتر دەبێت و ئەوان هێز و ناوبانگ و دەرکەوتنەکەیان نامێنێت، جا بۆ وەڵامدانەوەی ئەم مەترسیانە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە ئاڕاستەی جیاجیا چەند سەریەیەکی نارد.

### خشتەی زانیاری لەسەر دیارترین غەزاکان

| ناوی غــەزا | ساڵ | بــەرەکان | ئەنجــام |
|---|---|---|---|
| غەزای وەددان | ٢ | موسڵمانان و بێباوەڕانی قورەیش | جەنگ روویندا |
| غەزای بواط | ٢ | موسڵمانان و بێباوەڕانی قورەیش | راکردنی بێباوەڕان |
| غەزای عوشەیرە | ٢ | موسڵمانان و بێباوەڕانی قورەیش | راکردنی بێباوەڕان |
| غەزای بەدری یەکەم | ٢ | موسڵمانان و بێباوەڕانی قورەیش | راکردنی بێباوەڕان |

| غەزای بەدری گەورە | ٢ | موسڵمانان و بێباوەڕانی قوڕەیش | سەرکەوتنی موسڵمانان بە کوشتارەوە |
| --- | --- | --- | --- |
| غەزای بەنی قەینووقاع | ٢ | موسڵمانان و جوولەکەکان | سەرکەوتنی موسڵمانان بەبێ کوشتار |
| غەزوەی سوەیق | ٢ | موسڵمانان و بێباوەڕانی قوڕەیش | راکردنی بێباوەڕان |
| غەزای بەنی سولەیم | ٣ | موسڵمانان و بەنوسولەیم | سەرکەوتنی موسڵمانان بەبێ جەنگ |
| غەزای غەطەفان | ٣ | موسڵمانان و غەطەفانیەکان | راکردنی بێباوەڕان |
| غەزای ئوحود | ٣ | موسڵمانان و بێباوەڕانی قوڕەیش | شکستی موسڵمانان |
| غەزای حەمرائولئەسەد | ٣ | موسڵمانان و بێباوەڕانی قوڕەیش | سەرکەوتنی موسڵمانان بەبێ جەنگ |
| غەزای بەنونەضیر | ٤ | موسڵمانان و جوولەکەکانی بەنونەضیر | سەرکەوتنی موسڵمانان بەبێ کوشتار |
| غەزای بەدرولمەوعید | ٤ | موسڵمانان و بێباوەڕانی قوڕەیش | سەرکەوتنی موسڵمانان بەبێ جەنگ |
| غەزای دەومەتولجەندەل | ٥ | موسڵمانان و بێباوەڕان | سەرکەوتنی موسڵمانان بەبێ جەنگ |
| غەزای مورەیسیع | ٥ | موسڵمانان و جوولەکەکانی بەنیلموصطەلەق | سەرکەوتنی موسڵمانان بەبێ کوشتارێکی ئەوتۆ |
| غەزای خەندەق | ٥ | موسڵمانان و هاوپەیمانیی بێباوەڕان | سەرکەوتنی موسڵمانان بەبێ کوشتارێکی ئەوتۆ |
| غەزای بەنوقورەیظە | ٥ | موسڵمانان و جوولەکەکانی بەنوقورەیظە | سەرکەوتنی موسڵمانان بە کوشتارەوە |
| غەزای بەنولیحیان | ٦ | موسڵمانان و بەنولیحیان | راکردنی دوژمن |
| غەزای غابە | ٧ | موسڵمانان و | سەرکەوتنی موسڵمانان بە کوشتارێکی کەمەوە |

| غەزای خەیبەر | ٧ | موسڵمانان و جوولەکەکانی خەیبەر | سەرکەوتنی موسڵمانان بە کوشتارەوە |
|---|---|---|---|
| غەزای ذاتوریقاع | ٧ | موسڵمانان و بەنوموحاریب و غەطەفانیەکان | راکردنی دوژمن |
| غەزای موئتە | ٨ | موسڵمانان و بەرەی رۆمەکان | شکستی موسڵمانان |
| فەتحی مەککە | ٨ | موسڵمانان و بێباوەڕانی قورەیش | سەرکەوتنی موسڵمانان بەبێ کوشتارێکی ئەوتۆ |
| غەزای حونەین | ٨ | موسڵمانان و ثەقیف و هەوەزانیەکان | سەرکەوتنی موسڵمانان بە کوشتارەوە |
| غەزای طائیف | ٨ | موسڵمانان و خەڵکی طائیف | یەکلانەبوونەوەی جەنگەکە |
| غەزای تەبووك | ٩ | موسڵمانان و بەرەی رۆمەکان | سەرکەوتنی موسڵمانان بەبێ کوشتار |

# باسی سێیەم

## غەزاکانی پێش بەدر

دیارترین غەزاکان بەپێی ریزبەندی مێژوویی:

**غەزای وەددان:** دوانزە مانگ پاش هیجرەت لە مانگی صەفەردا خودی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هاودەم بە دووسەد کەس بەڕێکەوتن بە مەبەستی ڕێگرتن بە کاروانێکی بازرگانی قوڕەیش کە بەرەو شام دەچوو، بەڵام لەگەڵ قوڕەیشدا بەریەککەوتن روویندا، ڕۆیشتن و هاتنەوەی موسڵمانان پانزە شەوی خایاند.[1]

**غەزای بواط:** لە مانگی رەبیعولئەووەلی ساڵی دووەمی کۆچیدا خودی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هاودەم بە دووسەد کەس بەڕێکەوتن بە مەبەستی ڕێگرتن بە کاروانێکی بازرگانی سەد کەسی قوڕەیش کە ئومەییەی کوڕی خەلەف سەرکردایەتی دەکرد، ئەوان بەو سوپایان زانیبوو و خێراتر لە ڕێگەیەکی ترەوە دەرچووبوون.[2]

**غەزای عوشەیرە:** لە مانگی جومادیئاخیرەی ساڵی دووەمی کۆچی پاش شانزە مانگ لە هیجرەت خودی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هاودەم

---

(١) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٨.

(٢) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٨.

بە دووسەد کەس لە کۆچەران بەڕێکەوتن بە مەبەستی ڕێگرتن بە کاروانێکی بازرگانی قوڕەیش کە ئەبووسوفیان سەرکردایەتی دەکرد، بەڵام قوڕەیشیەکان ڕێڕەوێکی تریان گرتەبەر.[١]

**غەزای بەدری یەکەم:** لە مانگی ڕەبیعولئەووەلی ساڵی دووەمی کۆچیدا خودی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هاودەم بە دووسەد کەس بەڕێکەوتن بە مەبەستی وەڵامدانەوەی هێرشێکی پارتیزانی بێباوەڕان کە بردیانە سەر مەڕو ماڵاتی موسڵمانان لە دەوروبەری مەدینە، بەڵام تا موسڵمانان گەیشتنە ئەوێ، دوژمن هەڵهات.[٢]

---

(١) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٩.

(٢) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٩.

# باسی چوارەم

## غەزای بەدری گەورە

غەزای بەدر لە ڕۆژی هەینی لە وەرزی زستان و لە حەڤدەی ڕەمەزانی ساڵی دووەمی کۆچیدا ڕوویدا،[١] لە هەمان ساڵدا کە تیایدا قیبلە لە مەسجیدولئەقصاوە گۆڕا بەرەو کەعبە[٢] و ڕۆژووی ڕەمەزان[٣] و سەرفیترەش فەرز کرا.[٤]

هۆکار و پێشەکیەکانی غەزاکە: کاتێك ئەبووسوفیان بە کاروانێکی گەورەی بازرگانی قورەیشەوە لە شامەوە گەڕایەوە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە سێ سەد و ئەوەندە کەسەوە بەڕێکەوت تا ڕێ بگرێت[٥] بەو کاروانە بازرگانیەیان، بەڵام ئەبووسوفیان لە لایەکەوە هەواڵی نارد بۆ مەککەو لە لایەکی تریشەوە ڕێڕەوی خۆی گۆڕی، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) کە هەواڵی هاتنی سوپای قورەیشی بیست، ڕاوێژی کرد بە هاوەڵەکانی،

---

(١) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ١٥.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٦٨٤٥، صحيح مسلم، الرقم ٨٥٠.

(٣) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج١، ص ٢٤٢.

(٤) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج١، ص ٢٤٨.

(٥) مەبەست لە ڕێگری کردن، بەربەست خستنە سەر ئەو کاروانە بازرگانییانە بوو کە زۆربەشیان هی سەرانی قورەیش بوون هەر وەک لە ڕیوایەتەکاندا هاتوون و ئاماژەمان پێ داون، ئەمەش وەک قەرەبوویەک وابوو لەپای دەستبەسەر داگرتنی موڵک و ماڵی مسوڵمانان لەلایەن ئەو سەرانەی قورەیش دوای کۆچ کردنیان بۆ شاری مەدینە، ماڵەکانیان لێ داگیر کرابوو. ئەم ڕوونکردنەوەیەشمان بۆ ئەوەبوو بۆ ئەوەی کەس هەڵە حاڵی نەبێ لە ووشەی ڕێگرتن.

هەموو کۆچەران و پشتیوانان ئامادەییان دەربڕی دژ بە قورەیش بجەنگن، ئینجا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) شوێنی بەدری هەڵبژارد،[١] چی سەرچاوەی ئاوی بەدر هەبوو هەمووی کوێر کرایەوە تەنها دانەیەکیان نەبێت،بەوە بێباوەڕان بێبەش دەبوون لە ئاوخواردنەوە.[٢]

ژمارەی بەشداربوان سێ سەد و نۆزدە کەس بوو،[٣] نزیکەی سێ لەسەر چواری سوپاکە لە پشتیوانان بوو،[٤] ژمارەی بێباوەڕانیش زیاد لە هەزار کەس دەبوو.[٥]

**ئینجا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چەند هەنگاوێکی گرتەبەر، لەوانە:**

گەڕاندنەوەی ئەوانەی تەمەنیان کەم بوو.

دابەشکردنی سەرکردایەتیەکان، ئاڵای کۆچەرانی دایە دەست عەلی کوڕی ئەبووطالیب، ئاڵای پشتیوانانی دایە دەست سەعدی کوڕی موعاذ، لە راستەوە زوبەیر و لە چەپەوە میقدادی کوڕی عەمر و سەرکردایەتی گشتیش لەلای خۆی بوو.

فەرمانی کرد بە موسڵمانان رۆژووەکەیان بشکێنن.[٦]

بە راوێژی موسڵمانان[٧] شوێنێ بۆ مانەوەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) درووستکرا.[٨]

ورەی موسڵمانانی بەرز دەکردەوەو هەواڵی کوژرانی یەکە یەکەی سەرکردەکانی قورەیشی پێ دەدان.[٩]

---

(١) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٩١٩، صححه شعيب الأرناؤوط.

(٢) دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ٨٧٢.

(٣) صحيح مسلم، الرقم ٣٣٩٦.

(٤) صحيح البخاري، الرقم ٣٧٥٩و٣٨٢٠.

(٥) صحيح مسلم، الرقم ٣٣٩٦.

(٦) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٣٦، قال شعيب الأرناؤوط حديث قوي، سنن الترمذي، الرقم ٦٨٠،

(٧) دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ٨٨٩.

(٨) صحيح البخاري، الرقم ٤٥٩٨.

(٩) صحيح مسلم، الرقم ٥٢٢٨.

ئینجا خوای گەورە جۆرێ لە دڵخۆشی و پاڵپشتی بە موسڵمانان بەخشی:

﴿ إِذْ يُغَشِّيكُمُ ٱلنُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِۦ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ ٱلشَّيْطَٰنِ وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ ٱلْأَقْدَامَ ﴿١١﴾ إِذْ يُوحِى رَبُّكَ إِلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ أَنِّى مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا۟ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ سَأُلْقِى فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلرُّعْبَ فَٱضْرِبُوا۟ فَوْقَ ٱلْأَعْنَاقِ وَٱضْرِبُوا۟ مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ ﴿١٢﴾ ﴾ (١)

(ئەوەشتان لە بیر بێت بەخەوە نووچکە لەوکاتی نارەحەتیی و ترسەدا هێمنیی و ئاسوودەیی دایگرتن، بارانیشی لە ئاسمانەوە بۆتان نارد تا لە چڵك و چەپەڵی ڕێگە پاك و خاوێنتان بکاتەوە و بەد گومانیی و هەموو خەیاڵات و نیازێکی نەگونجاوی شەیتانیشتان لێ وە دوورخات و دڵنیاتان کات لەسەر یارمەتی خۆی و لە گۆڕەپانی جیهاددا پێتان مەحکەم و سەقامگیرکا. وە بیرتان بێت کە پەروەردگارت نیگای بۆ فریشتەکان کرد: کە بچن هاوکارییان بکەن، بە ڕاستیی خۆیشم لەگەڵتانم و غیرەت وەبەر بڕوادارەکان بنێن و، موژدەی سەرکەوتنیان بدەنێ و، دڵ ئەستووریان بکەن بۆ خۆیشم زوو ترس و بیم دەخەمە دڵی کافرو بێ باوەڕەکانەوە، هەتا هەڵبێن و جەنگییان پێنەکرێت دەسا ئێوەش - ئەی فریشتەکان! - بە توندی لە ملیاندەن و هەموو پەنجەو سەر پەنجەکانیان بپەڕێنن).

## ڕوودانی جەنگەکە:

کاتێك سوپای قوڕەیش گەیشتن و کاتی جەنگ هات، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی کرد هیچ کەس بەبێ فەرمان نەجەنگێت،[٢] هەروەها هونەری جەنگ و شێوازی بەرەنگاربوونەوەی بۆ دیاری کردن.[٣]

---

(١) الأنفال: ١١ – ١٢.

(٢) مسند احمد بن حنبل، الرقم ١٢١٥٥، صححه شعيب الأرناؤوط.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ٢٧٦٥.

سەرەتای جەنگەکە جەنگی رووبەڕوو بوو، سێ کەس لە قوڕەیش (عوتبە، شەیبە، وەلید) و سێ کەس لە موسڵمانان (حەمزە، عوبەیدە، عەلی) تیایدا سێ بێباوەڕەکە کوژران و عوبەیدەش پێکرا.[١]

ئینجا جەنگەکە دەستی پێکرد، قوڕەیش گوڕ و تینیان زیادی کرد، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) نزای دەکرد،[٢] خوای گەورەش فریشتەی دابەزاندە خوارەوە بۆ یارمەتیدانی موسڵمانان:

﴿إِذۡ تَسۡتَغِيثُونَ رَبَّكُمۡ فَٱسۡتَجَابَ لَكُمۡ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلۡفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُرۡدِفِينَ ٩﴾[٣]

(وە بیر بێنن ئەوەدەمە کە ناڕەحەت و دڵ نیگەران بوون و، هاناتان بۆ پەروەردگارتان برد ئەوا پەروەردگارتان وەڵامی دانەوە کە دڵنیابن بە شوێن یەکدا هەزار فریشتە بۆ پشتیوانیتان دەنێرم) خودی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) بەشداری جەنگەکەی کرد،[٤] رێنماییشی دا بە موسڵمانان هەندێ کەس لە بێباوەڕان بە ناچاری هاتون با نەیانکوژن.[٥]

جەنگەکە بە سەرکەوتنی موسڵمانان کۆتایی هات، ژمارەیەکی دیار لە سەرکردەکانی قوڕەیش کوژران، نزیکەی حەفتا کوژرا و حەفتا دیلیان هەبوو،[٦] نزیکەی چواردە موسڵمانیش شەهید بوون، دەستکەوتێکی زۆریش بۆ موسڵمانان مایەوە.

---

(١) سنن أبي داود، الرقم ٢٣٠٥، صححه الألباني و شعيب الأرناؤوط، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٨٣٥ وقال على شرط الشيخين.

(٢) صحيح مسلم، الرقم ٣٣٩٦.

(٣) الأنفال: ٩.

(٤) مسند احمد بن حنبل، الرقم ٣١٩٧٣، صححه شعيب الأرناؤوط.

(٥) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٩٤١ وقال على شرط مسلم.

(٦) صحيح مسلم، الرقم ٣٣٩٦.

ئینجا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی کرد موسڵمانان لەگەڵ دیلەکاندا چاك بن، دواتر راوێژی بە موسڵمانان کرد، رایەك پێی وابوو بە لەبریتی ئازاد بکرێن، هەندێکیش پێیان وابوو بکوژرێن تا ببێتە وانەو ترسێ بۆ بێباوەڕان، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) مەیلی بە لای یەکەمیاندا بوو و ئەوەشی جێبەجێ کرد، بەڵام دواتر خوای گەورە رای دووەمی پەسەند کرد:

﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٦٧﴾ لَّوْلَا كِتَٰبٌ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمْ فِيمَآ أَخَذْتُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٦٨﴾ ﴾[1]

(بە هیچ پەیامبەرێك رێ نەدراوە کە دیلی هەبێ و، دیل ڕاگرێ، یان بریتی وەرگرێ هەتا هێزو دەسەڵات بەدەست دەگرێت ئێوە دەتانەوێ لەززەت و کاڵای دونیاتان دەسکەوێ لەوەرگرتنی بریتیدا خوایش پاشە ڕۆژی ئەوێ بۆتان خوا بۆخۆی زۆر بەدەسەڵات و زۆریش کارجوانە ئەر پێشتر لەخواوە بڕیار دەرنەچووبا کە سزای هەڵەکار - بە ئیجتیهاد - نەدات لەو بریتی وەرگرەتنەتاندا سزایەکی گەورەتان دووچار دەبوو و قاری لێدەگرتن).

ئینجا موسڵمانان رای جیاوازیان هەبوو لەسەر دەستکەوتەکان و هەریەکەو بە بۆچوونی خۆی بڕیاری لەسەر دەدا، خوای گەورەش ئایەتی دابەزاندە خوارەوە (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَنْفَالِ قُلِ الْأَنْفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ)،[2] (لە بابەت ئەو دەستکەوتەی جەنگی (بەدر) ەوە لێت دەپرسن: ئاخۆ بۆ کێبێ و، چۆن دابەش دەکرێ ؟ پێیان بڵێ: حوکمی (ئەنفال) بەدەست خواو پەیامبەرە، واتە: شێوەی دابەشکردنەکەی تایبەتە بەوانەوە دەبێ ئێوەش لەخوا ترستان هەبێ و، سەرپێچی لە بڕیارەکانی نەکەن و نێوان خۆتان بسازێنن و، دەبێ گشتتان یەکبن و جیاوازیی و کێشەتان نەبێت و، یەکتر

---

(١) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٣٢٩١، قال شعيب الأرناؤوط حسن لغيره.

(٢) صحيح مسلم، الرقم ٣٣٧٦.

ئاشت بکەنەوە و گشت کاتێ لە فەرمانی خواو، لەقسەی پەیامبەری ئەو، گوێرایەڵیی بکەن کە بڕواتان هێناوە، دەبێ ملکەچبن).

کاتێك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەواڵی سەرکەوتنی نارد بۆ مەدینە، لەگەڵ گەیشتنی هەواڵەکەدا تەرمی روقییەی کچی ئەسپەردە دەکرا.[١]

## گرنگی غــەزاکە:

**یەکەم:** ئەمە یەکەم غەزا بوو جەنگی سەخت لەنێوان موسڵمانان و بێباوەڕاندا روودات، بۆیە چاوی هەموو لایەکی لەسەر بوو، چ بۆ بێباوەڕان و چ بۆ موسڵمانان هەنگاوێکی یەکلاکەرەوە بوو.

**دووەم:** بۆ یەکەم جار پشتیوانانیش بەشداری سەربازییان کرد لەگەڵ کۆچەریەکاندا.

**سێیەم:** هەر موسڵمانێ بەشداری ئەو غەزایەی کرد، لەبەر گەورەیی و رێزی لەناو خەڵکدا بە بەدری ناودەبرا.

**چوارەم:** چەندین ئایەت و فەرموودە لە بارەی فەزڵی بەشداربوانی بەدرەوە هاتووە.

**پێنجەم:** سوورەتی ئەنفال لە بارەی غەزای بەدرەوە دابەزی.[٢]

-----------------------------

(١) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٤٩.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٤٣٧٧.

## گرنگترین ڕووداوەکانی دوای غەزای بەدر:

هاوسەرگیری عەلی و فاطیمەی کچی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) کە ماوەیەك دوای غەزای بەدر بوو.[١]

کۆچکردنی زەینەبی کچی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کە هاوسەری ئەبولعاص بوو، لە مەککەوە کۆچی کرد بۆ مەدینە.[٢]

دەرکەوتنی مونافیقەکان لە دوای غەزای بەدردا ڕوویدا، چونکە پێشتر موسڵمان نەبوون، کە بینییان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سەرکەوت، بڕیاریان دا بە ڕووکەش موسڵمان ببن،[٣] ئەمانە لە ناخەوە بێباوەڕ و بە ڕووکەش موسڵمان بوون، بە دڵ و بە پەنهانی دۆستی بێباوەڕان و بە ڕووکەش و بە ناچاری هاوڕێی موسڵمانان بوون.

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٢٠٠٠، صحيح مسلم، الرقم ٣٧٥٥.

(٢) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٣، ص ٢٠٤.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ٤٢٩٩.

# باسی پێنجەم

## غەزاکانی پێش ئوحود

### غەزای بەنی قەینووقاع:

لە ڕۆژی شەممەی نیوەی مانگی شەووالی ساڵی دووەمی کۆچی لەنێوان موسڵمانان و جوولەکەکانی بەنووقەینوقاعدا ڕوویدا، هۆکارەکەشی پێشێلکردنی ڕێککەوتنی نێوان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و جوولەکەکان بوو لەلایەن بەنوقەینوقاعەوە، چونکە ئافرەتێکی موسڵمان لە بازاڕی ئەواندا فرۆشی دەکرد، ئەوانیش زۆریان لێ ئەکرد دەموچاوی نیشان بدات و ئەویش ڕازی نەبوو، دواجار کارێکیان کرد کە هەستایەوە جەستەی دەرکەوت، ئەوانیش کەوتنە پێکەنین و گاڵتەپێکردنی، ئافرەتەکەش هاواری کرد و یەکێك لە موسڵمانان ئەو کابرای کوشت کە وایکرد، ئەوانیش موسڵمانەکەیان کوشت، بەمە ناکۆکی و جەنگ کەوتە نێوان موسڵمانان و بەنوقەینوقاعەوە، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) ماوەی پانزە شەو گەمارۆی دان هەتا ئەوانیش ڕازی بوون بە حوکمی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، عەبدوڵای کوڕی ئوبەی سەرکردەی دووڕووەکان تکای بۆ کردن و پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) تکاکەی وەرگرت،[1] ئینجا فەرمانی کرد دووربخرێنەوەو عوبادەی کوڕی صامتی

---

(١) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٣، ص ٣١٤-٣١٥.

ڕاسپارد تا ئەو ئەرکە بەجێ بگەیەنێت، ماڵ و سامانیشیان بە دەستکەوت بۆ موسڵمانان دەستی بەسەردا گیرا.[1]

## غەزوەی سوەیق:

لە ڕۆژی یەکشەممە پێنجی ذولحیجەی ساڵی دووەمی کۆچیدا ڕوویدا،[2] ئەبووسوفیان هاودەم بە دووسەد سواری مەککەوە هەوڵیاندا تۆڵە بکەنەوەو هێرشیان بردە سەر دەوروبەری مەدینە و دوو کەسیان کوشت و باخەخورمایەکیان سووتاند و گەڕانەوە، موسڵمانانیش کەوتنەشوێنیان، بەڵام فریایان نەکەوتن.[3]

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و موسڵمانان یەکەم جەژنی قوربانیان بەڕێکرد و تیایدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دوو ئاژەڵی کردە قوربانی.[4]

## غەزای بەنی سولەیم:

ماوەی پانزە شەوی پێ چوو، لە نیوەی مانگی موحەڕەمی ساڵی سێیەمی کۆچیدا بوو، هۆکارەکەشی ئەوەبوو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەواڵی پێ گەیشت کە بەنی سولەیم و غەطەفانیەکان لە ناوچەی (قەرقەرەتولکودر) کۆبوونەتەوە دژ بە موسڵمانان، بۆیە بە دووسەد کەسەوە خۆی گەیاندە ئەوێ و سێ شەو لەوێ مایەوە، بەڵام جەنگ ڕووینەدا، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە دەستکەوتێکی زۆری پێنج سەد وشتریەوە گەڕایەوە بۆ مەدینەو دابەشی کرد بەسەر بەشداربواندا.[5]

---

(١) تأريخ الأمم و الملوك، ج٢، ص ٤٩.

(٢) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٣٠.

(٣) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٣، ص ٣١٠-٣١١.

(٤) تأريخ الأمم و الملوك، ج٢، ص ٤٩.

(٥) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٣١.

## غـەزای غـەطـەفان:

ماوەی یانزە شەوی خایاند، لە موحەڕەمی ساڵی سێیەمی کۆچیدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەواڵی پێگەیشت بەشێ لە غەطەفانیەکان کۆبوونەتەوە لە دژی، بۆیە بە چوارسەد و پەنجا کەسەوە بەڕێکەوت بەرەو ناوچەی (ذي ئەمر)، ئەوانیش کە هەواڵەکەیان بیست، هەڵهاتن بەرەو شاخەکان، لەوێ بارانێکی زۆر باری و جلەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تەڕ بوون و ویستی وشکیان بکاتەوە، موسڵمانانیش سەرقاڵ بوون، کەسێك بە ناوی دوعثور لە بێباوەڕەکان دەرفەتی هێنا و بە شمشێر هەڵیکوتایە سەر پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، وتی کێ رزگارت ئەکات؟ ئەویش فەرمووی الله، ئەوەبوو شمشێرەکەی لەدەست کەوت، ئینجا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) شمشێرەکەی هەڵگرت و فەرمووی کێ رزگارت ئەکات ئەویش وتی کەس، ئینجا شایەتومانی هێناو بەڵێنیدا جارێکی تر لە دژی کۆنەبێتەوە، لەم بارەشەوە ئایەت دابەزی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ هَمَّ قَوۡمٌ أَن يَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ فَكَفَّ أَيۡدِيَهُمۡ عَنكُمۡۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ١١ ﴾[1]

(ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! دەبێ یادی نیعمەت و بەخشەکانی خوا بکەنەوە بەسەرتانەوەو لەبیرتان نەچن ئەوجارە کەهۆزی ویستیان دەستی خیانەتتان بۆ درێژ کەن و پەلامارتان بدەن خوایش دەستی گرتن و نەیهێشت زاڵبن بەسەرتانا، دەسا لە خوا پەرواتان بێ و بترسن بڕوادارانیش دەبێ تەنها پشت بەخوا ببەستن. تا هەمووکات فریایان کەوێت).

---

(١) المائدة: ١١.

# باسی شەشەم

## غەزای ئوحود

### کاتی غەزاکە:

ئەم غەزایە لە سەرەتای وەرزی بەهار و لە نیوەڕۆی ڕۆژی شەممە لە پانزەی شەووالی ساڵی سێیەمی کۆچیدا ڕوویدا.

### هۆکاری غەزاکە:

هۆکارەکەی بریتی بوو لە شکستی بێباوەڕانی قوڕەیش لە غەزای بەدردا، بەو شکستەیان هەم لە ڕووی دەروونیەوە هەستیان بە شکست دەکرد و دەبوو قەرەبووی ئەو شکستە دەروونیە بکەنەوە، نموونەکەی وەحشیش چاکترین بەڵگەیە،[1] هەم لە ئاستی ناوخۆییدا لەناو مەککەدا شکۆی سەرانی قوڕەیش وەك جاران نەمابوو، هەم لە ڕووی ناوبانگی دەرەکیەوە ناوبانگیان ڕووشابوو و دەنگۆی شکستیان بڵاوبووبوویەوە، وەك لە بەسەرهاتی نەجاشی و جەعفەردا باسکراوە،[2] هەستکردنی قوڕەیش بەم مەسەلانە زۆری نەخایاند، بەڵکو هەر

---

(١) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٥٧٥٩، صحيح البخاري، الرقم ٣٨٦٢.

(٢) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٣، ص ٧٨.

لەناو مەیدانی جەنگی بەدردا هەستیان پێکرد و وادەیان دانا بۆ جەنگێك لە ساڵی داهاتوودا، پاش سەرکەوتنیشیان لە ئوحود و نیشاندانی خۆشیەکانیان، بە روونی ئەوەیان دەربڕی کە بە ئامانجەکانیان گەیشتون.

## ئامادەکاریەکانی بێباوەڕان:

قورەیشیەکان هەر کە لە بەدر گەڕانەوە، بڕیاریان دا ئەو کاروانە بازرگانیەی ئەبووسوفیان سەرکردایەتی دەکرد، هەمووی ببەخشرێ بۆ خەرجی جەنگێ کە تیایدا تۆڵەی بەدر لە موسڵمانان بکەنەوە، ئینجا کەوتنە کۆکردنەوەی هێزی سەربازی و بیانووی هەر کەسێکیشیان دەبڕی کە بیویستایە بەشداری لەم جەنگە نوێیەدا نەکات، هەروەها سەرکردەکانیان بڕیاریان دا ئافرەتانیش لەگەڵ خۆیان ببەن، بۆ ئەوەی هیچ پیاوێك جەستەی لەگەڵ سوپا و دڵی لای خێزانەکەی نەبێت.[١]

دواتر سەرکردایەتی سوپا دەستنیشان کرا: ئەبووسوفیان سەرکردایەتی گشتی گرتەدەست، خالیدی کوڕی وەلید سەرکردایەتی بەرەی لای راستی سوارەکانی گرتەدەست کە سەد سوارە بوون، عیکریمەی کوڕی ئەبووجەهلیش سەرکردایەتی بەرەی لای چەپی سوارەکانی گرتەدەست کە سەد سوارە بوون.[٢]

---

(١) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٦٠ – ٦٣.

(٢) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٤، ص ١٣ – ١٥.

## ئامادەكاریەكانی موسڵمانان:

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێشتر عەبباسی مامی لە مەككە هێشتبوویەوە، هەرچەندە عەبباس موسڵمان بووبوو و ویستی كۆچ بكات، بەڵام پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرموو (مانەوەت لە مەككە باشترە)، بۆیە وەك چاوێك هەواڵی بێباوەڕانی بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەنارد،[1] كاتێكیش قوڕەیش خۆیان ئامادەكرد بۆ جەنگەكە، عەبباس هەموو وردەكاریەكانی ئامادەسازیی قوڕەیشی نارد بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم).[2]

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە لایەكەوە هێزێكی پاسەوانی خێرای ئامادە كرد بۆ چاودێری و پاسەوانی مەدینە، لەلایەكی تریشەوە كەسایەتیە دیارەكانی ناو مەدینەی كۆكردەوە بە سەركردەی دووڕووەكانیشەوەو راوێژی پێ كردن سەبارەت بە شێوازی خۆئامادەكردن و دەستنیشانكردنی مەیدانی جەنگەكە، ئایا لە ناو مەدینەدا بەرگری بكەن یان مەیدانی جەنگەكە ببەنە دەرەوەی شارەكە، خودی خۆی پێی وابوو مانەوەیان لە شارەكەدا باشترە، سەركردەی دووڕووەكانیش هەمان بۆچوونی هەبوو، بەڵام رای بەشێك لە پشتیوانان و كۆچەرانیش وابوو جەنگەكە ببەنەدەرەوە، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) رازی بوو.[3]

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەستەیەكی هەواڵگریی دوو كەسی نارد بۆ وەرگرتنی زانیاری و ئەوانیش وردەكاری پێویستیان وەرگرت و گەڕانەوە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەردەوام زانیاریەكانی نوێ دەكردەوەو دەستەی تری هەواڵگریی دەنارد، ئینجا سوپایەكی هەزار كەسی پێكهێنا و

---

(١) أسدالغابة، ج٣، ص١٦٣.

(٢) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٢٨.

(٣) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٢٩.

سەرکردایەتی سوپای دەستنیشان کرد: سەرکردایەتی گشتی لای خۆی بوو، باڵی لای راستی سوپا مونذیری کوڕی عەمر بوو، باڵی لای چەپیش زوبەیری کوڕی عەووام بوو،[١] ئاڵای ئەوسیەکان بە دەست ئوسەیدی کوڕی حوضەیرەوە، ئاڵای خەزرەج بەدەست حوبابی کوڕی مونذیرەوە، ئاڵای کۆچەران بەدەست موصعەبی کوڕی عومەیرەوە، بەرپرسیارێتی مەدینەشی سپارد بە ئیبن ئوم مەکتوم، ئینجا کەوتەڕێ، لە نیوەی رێدا عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کە سەرکردەی دووڕووەکان بوو و سێ سەد کەسی لەگەڵ بوو، بە بیانووی بەهەندوەرنەگرتنی بۆچوونەکەی لە هێزەکە کشایەوەو گەڕایەوە بۆ مەدینە و موسڵمانان درێژەیان دا بە رێگەکەیان بەرەو ئوحود،[٢] پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە چەشنێ خۆی گەیاندە کێوی ئوحود کە سوپای بێباوەڕان کەوتە نێوان ئوحود و مەدینەوە، ئینجا دەستەیەکی پەنجا کەسی تیرهاوێژانی لەسەر تەپۆڵکەیەك دانا و عەبدوڵای کوڕی جوبەیری کرد بە ئەمیریان، ئەرکیان بەرگرتن بوو بە هێزی سوارەی دوژمن،[٣] رێنمایی روونیشی پێدان (احْمُوا ظُهُورَنَا فَإِنْ رَأَيْتُمُونَا نُقْتَلُ، فَلَا تَنْصُرُونَا)[٤] (إِنْ رَأَيْتُمُونَا تَخْطَفُنَا الطَّيْرُ فَلَا تَبْرَحُوا مَكَانَكُمْ، هَذَا حَتَّى أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ)[٥] (وَإِنْ رَأَيْتُمُونَا قَدْ غَنِمْنَا، فَلَا تَشْرَكُونَا)،[٦] (ئەگەر بینیتان دەکوژرێین مەیەن بۆ سەرخستنمان، تەنانەت ئەگەر بینیتان داڵ و باڵندە دەمانفرێنن شوێنی خۆتان جێمەهێڵن هەتا خۆم دەنێرم بە شوێنتاندا، ئەگەریش بینیتان خەریکی دەستکەوت کۆکردنەوەین مەیەن بۆ شەریکیمان).

---

(١) ابن القيم الجوزية: زاد المعاد في هدي خير العباد، ج٣، ص ١٧٤.

(٢) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٢٨ — ٣٠.

(٣) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٦٥ — ٦٦.

(٤) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٥١١، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٣٠٩٥ و صححه و وافقه الذهبي.

(٥) صحيح البخاري، الرقم ٢٨٩٥.

(٦) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٥١١، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٣٠٩٥ و صححه و وافقه الذهبي.

## مەیدانی جەنگ:

قورەیشیەکان ژنەکانیان لەگەڵ خۆیان هێنابوون بۆ ئەوەی بە لاواندنەوەی کوژراوانی بەدر گەرمیان بکەن لەسەر جەنگەکە،[1] پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) هاوەڵانی گەرم دەکرد لەسەر جەنگەکە بە چەشنێ شانەخڕێیان بوو لەسەر ئەوەی کامیان شمشێرەکەی دەستی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەربگرن هەتا بەر ئەبودوجانە کەوت.[2]

دواجار جەنگێکی سەخت لە نێوان هەردوو سوپادا روویدا، هەتا نیوەڕۆ بێباوەڕان تووشی شکستێکی سەخت بوون و هەڵهاتن، موسڵمانانیش کەوتنە کۆکردنەوەی دەستکەوتەکان، تیرهاوێژەکانیش کە ئەرکیان بەرگرتن بوو بە سوپای سوارەی بێباوەڕان ڕێنماییەکانیان پشتگوێ خستن و دابەزین بۆ کۆکردنەوەی دەستکەوت،[3] کاتێك تیرهاوێژەکانی موسڵمانان کێوەکەیان چۆڵکرد، خالید تەماشای کرد ژمارەیەکی زۆر کەم ماونەتەوە، بۆیە لە پشتەوە هات بۆیان و ئەوانەی کوشت و هێرشی هێنا بۆ موسڵمانان، کاتێك بێباوەران بینییان وا خالید لە پشتووە کەوتوەتە وێزەی موسڵمانان گەڕانەوە، بەوە موسڵمانان کەوتنە نێوان دوو بەرەی جەنگی بێباوەرانەوە، ئەم هەڵوێستەی خالید شکستی بێباوەڕانی لە ئوحوددا گۆڕی بۆ سەرکەوتن،[4] دەنگۆی ئەوە بڵاوبوویەوە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کوژراوەو خەریك بوو موسڵمانان ورە بەربدەن، بەڵام دواتر زانییان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەکوژراوەو بریندار بووە،

---

(١) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٦٧.

(٢) صحيح مسلم، الرقم ٤٦٢٠.

(٣) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٥١١، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٣٠٩٥ و صححه و وافقه الذهبي.

(٤) ابن الأثير: الكامل في التاريخ، ج٢، ص ٤٨.

درێژەیان دا بە جەنگەکە، موسڵمانان ناچار دەستیان کرد بە پاشەکشە رووەو کێوی ئوحود، ئینجا ئەبووسوفیان بە نوێنەرایەتی بێباوەڕان جاڕی سەرکەوتنی دا و بە رەسمی رایگەیاند تەرمی کوژراوانی موسڵمانان دەشێوێنن،[١] لەنێویشیاندا تەرمی حەمزەی مامی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) شێوێنرا، وەحشی بە خەنجەرێك سکی حەمزەی هەڵدڕی،[٢] ئینجا جەرگی حەمزەی هەڵگرت و بردی بۆ هیند، چونکە ئەو ئافرەتە هەر لە کاتی کوژرانی باوکیەوە لە جەنگی بەدردا بە دەستی حەمزە نەزری کردبوو جەرگی حەمزەی دەست بکەوێت،[٣] هیند جەرگەکەی جوی و دواتر تفیەوە، ئینجا هاتە لای تەرمەکەی حەمزەو زیاتر شێواندی،[٤] پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کە دواتر تەرمەکەی بینی فەرمووی (ئەگەر دڵی صەفیە بەرگەی بگرتایەو پێی دڵتەنگ نەبوایە بە دڵنیاییەوە تەرمەکەیم وا جێدەهێشت تا گۆشت خۆرەکان بیانخواردایە تا لە رۆژی دواییدا لەناو سکی ئەواندا حەشر بکرایە)،[٥] هەروەها گوێ و لووتی عەبدوڵای کوڕی جەحشیان بڕی و کردیان بە دەزوویەکەوە.[٦]

---

(١) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٣٠٩٥ و صححه و وافقه الذهبي.

(٢) مصنف إبن أبي شيبة، الرقم ٣٦٠٦٦.

(٣) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج١، ص ١٧٩.

(٤) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٣، ص ١٠.

(٥) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٢٠٥٨، سنن أبي داود، الرقم ٢٧٤٥، سنن الترمذي، الرقم ٩٧٣، .

(٦) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٢٣٤٩، صححه الذهبي في التلخيص.

## دەرەنجامی جەنگەکە:

جەنگەکە بە سەرکەوتنی بێباوەڕان کۆتایی هات و تیایدا حەفتا هاوەڵ شەهیدبوون، شەست و چوار پشتیوانی و شەش کۆچەری،[١] چەند هاوەڵێك پێکەوە بێ شۆردن و بە جلەکانی خۆیانەوە ئەسپەردە دەکران،[٢] هەموویشیان لە شوێنی کوژرانەکەیان ئەسپەردە کران و نەبرانەوە مەدینە،[٣] کوژراوانی بێباوەڕانیش بیست و دوو کوژراو بوون.[٤]

## دڵنەوایی خوا بۆ موسڵمانان:

پاش ئەو شکستەی موسڵمانان و گوێبیستی بەیاننامەی سەرکەوتنی بێباوەڕان، حاڵەتێکی دەروونی سەخت لای موسڵمانان دروست بوو، بەڵام خوای گەورە لە بری سزادان و سەرکۆنە و شکاندنەوەی موسڵمانان، دڵدانەوەیەکی چاکی کردن، هەم بۆ حاڵەتی شکانەکەیان، هەم وەك وەڵامێك بۆ تانە و تەشەری دووڕووەکان، وەك لە قورئاندا باسکراوە:

﴿ ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيۡكُم مِّنۢ بَعۡدِ ٱلۡغَمِّ أَمَنَةٗ نُّعَاسٗا يَغۡشَىٰ طَآئِفَةٗ مِّنكُمۡۖ وَطَآئِفَةٞ قَدۡ أَهَمَّتۡهُمۡ أَنفُسُهُمۡ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ ظَنَّ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِۖ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلۡأَمۡرِ مِن شَيۡءٖۗ قُلۡ إِنَّ ٱلۡأَمۡرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِۗ يُخۡفُونَ فِيٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبۡدُونَ لَكَۖ يَقُولُونَ

---

(١) سنن الترمذي، الرقم ٣١٣٧ و قال حسن غريب، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٣٣٠١ و صححه و وافقه الذهبي.

(٢) مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٣٠٢٥، صححه شعيب الأرناؤوط.

(٣) صحيح ابن حبان، الرقم ٣٢٤٠، قال شعيب الأرناؤوط إسناده قوي.

(٤) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ١٢٩.

﴿لَوۡ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٞ مَّا قُتِلۡنَا هَٰهُنَاۗ قُل لَّوۡ كُنتُمۡ فِي بُيُوتِكُمۡ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَتۡلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمۡۖ وَلِيَبۡتَلِيَ ٱللَّهُ مَا فِي صُدُورِكُمۡ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِي قُلُوبِكُمۡۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ١٥٤ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوۡاْ مِنكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ إِنَّمَا ٱسۡتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِبَعۡضِ مَا كَسَبُواْۖ وَلَقَدۡ عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٞ ١٥٥﴾ (١)

(جاخوای میهرەبان پاش ئەوخەم وخەفەتە قورسە، هێمنیی و ئاسوودەییەکی باشی بۆناردن، سووکە خەوێکی لێخستن، هەتا بحەوێنەوەو وزەشتان دەمە زەرد بێتەوەو ئەو نارەحەتیەتان لەبیربچێتەوە خەوەنووچکەکە، هەندێکتانی گرتەوەو لەوخەم وخەفەتە حەوانەوە دەستەیەکیش (لە دوورڕازەکان) هەرخۆیانیان لا مەبەست بوو، لەبەرئەوە لەخەوەنووچکەکە کەمایەی ئیسراحەت و حەوانەوەی دڵان بوو بێبەشبوون گومانی ناهەقیان بەخودا دەبرد وەکو گومانی سەردەمی جاهیلیەت و ئەیانوت: ئایا ئێمە لەم کارە هیچمان هەیە؟ پێیان بڵێ ئەی پێغەمبەر! کەبێ شك گشت کارێ هەر بەدەستی خوایە گەلێ کاری نهێنی لەدڵ ءدەروونیاندا دەشاردنەوەو لای تۆ دەریناخەن بۆنموونە دەڵێن: ئەگەر ئێمە شتێکمان بەدەست بوایە، هەرگیز نەدەهاتین بۆ دەرەوەی مەدینە و لێرەیش بەکوشت نەدەچووین ئەی پێغەمبەر! پێیان بڵێ: ئەگەرئێوە لەماڵی خۆشتان بووبان و نەهاتنایە گۆڕەپانی جەنگەوە، هێشتا ئەوانەی وا کوشتنیان لەسەر نووسراوە، دەهاتنە جێی تەخت بوونی لاشەیان و لەوێ مەرگیشیان تووش دەبوو بۆیە خوا ئەوشتانەشتان بەسەردێنی، دەیەوێ دڵاءدەروونتان تاقی بکاتەوە دەیشیەوێ هەرچی لەدڵتانایە لە بێژنگی بداو دەری بخا خواش لە ڕازو نیازی دڵەکان زاناو ئاگادارە).

---

(١) آل عمران: ١٥٤-١٥٥.

تایبەتمەندیەکانی غەزاکە:

- دەرکەوتنی رای جیاواز لە کاتی راوێژدا و پشتگوێ نەختنی پێشنیارەکان هەرچەندە بە دڵی سەرکردایەتیش نەبن.

- دەرکەوتنی ناپاکی گەورە لە دووڕووەکانەوەو چارەسەرکردنی لە کات و شوێنی خۆیدا.

- لادان لە فەرمانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و زیان گەیشتن بە موسڵمانان و پەند لێ وەرگرتنی.

- بێباوەڕان تەرمی موسڵمانانیان شێواند و سەرکەوتنەکەشیان بە رەسمی رایگەیاند.

# باسی حەوتەم

## غەزاکانی پێش خەندەق

### غەزای حەمرائولئەسەد:

کاتێك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە ئوحودەوە گەڕایەوە مەدینە و دەنگۆی ئەوەی بیست بێباوەڕان بە تەمان هێرش بکەنە سەر مەدینە هەتا بە یەکجارەکی موسڵمانان لەناوببەن،[١] لە رۆژی یەکشەممە شانزەی شەووالیساڵی سێیەمی کۆچیدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی کرد تەنها بەشداربوانی ئوحود ئامادە بن بۆ دەرچوون،[٢] ئاڵای سوپای دایە دەست عەلی کوڕی ئەبووتالیب و کەوتنەڕێ، پێشوەختە سەریەیەکی سێ کەسی نارد بۆ وەرگرتنی هەواڵی دوژمن، موسڵمانان گەیشتنە حەمرائولئەسەد و شەو ئاگرێکی زۆریان کردەوەو دەنگیشیان دەبیسترا، ئەم حاڵەتە ترسێکی خستە دڵی قورەیشیەکانەوەو هەڵهاتن، ئینجا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گەڕایەوە بۆ مەدینە، ماوەی رۆیشتن و گەڕانەوەکە پێنج شەو بوو.[٣]

---

(١) السنن الكبرى للنسائي، الرقم ١٠٦٣٩.

(٢) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ١٠١.

(٣) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٣٧-٣٨.

## کارەساتی بیئر مەعوونە:

لە مانگی صەفەری ساڵی چوارەمی کۆچیدا روویدا،[١] هۆکارەکەشی ئەوەبوو کە ریعل و ذەکوان و عوصەییە لە بەنی لیحیان هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و داوایان کرد پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) برێك لە هاوەڵانی بنێرێت بۆ ناویان، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) حەفتا کەس لە گوڵبژێری نێو پشتیوانانی نارد لەگەڵیان، کەچی کە گەیشتنە بیئر مەعوونە، ناپاکییان نواند و هەموو هاوەڵەکانیان شەهید کرد، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) ماوەی یەك مانگ لە نوێژی بەیانیاندا نزای لەو ناپاکانە دەکرد.[٢]

## غەزای بەنونەضیر:

لە رۆژی شەممە لە مانگی رەبیعولئەووەلی ساڵی چوارەمی کۆچیدا روویدا، دوو هۆکار بۆ روودانی ئەم غەزایە باسکراوە:

**یەکەم:** دووکەس بە هەڵە لەلایەن عەمری کوڕی ئومەییەوە کوژرابوون، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چوو هەتا بۆ خوێن بایبەکەیان هاوکاری بەنونەضیریش وەربگرێت وەك چۆن پێشتر لە رێککەوتننامەی مەدینەدا باسکرابوو، ئەوانیش بە رووکەش رەزامەندییان نیشان دا، بەڵام کاتێك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە لاپاڵی دیوارێکدا دانیشتبوو، نیەتیان هێنا بیکوژن و بەردێ هەڵبدەن بەسەریدا، پێش ئەوەی پرۆسەکە جێبەجێ بکەن،

---

(١) ابن سعد: الطبقات الکبری، ج٢، ص ٣٩ -٤٠.

(٢) صحیح البخاري، الرقم ٣٨٨٠.

جیبریل هەواڵی دا بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و ئەویش بە پەلە شوێنەکەی جێهێشت و گەڕایەوە نێو مەدینە.(١)

**دووەم:** قورەیشیەکان نامەیەکی هەڕەشەئامێزیان نووسی بۆ بەنونەضیر بە زمانی هانیان دەدان بۆ هێرش بردنە سەر پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)، ئەوانیش بڕیاریاندا پیلانێکی بۆ دابڕێژن و داوایان کرد دیمانەیەك لەنێوان زانایانی خۆیان و پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) ساز بکەن، ئەگەر دەرکەوت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) راست دەکات بڕوای پێ بهێنن، بەڵام پیلانیان دانابوو بیکوژن،(٢) ژنێ لە خۆیان ئەو هەواڵەی دزەپێکرد بۆ نێو موسڵمانان و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە پیلانەکەی زانی و گەڕایەوە بۆ نێو مەدینە.(٣)

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بڕیاری دەرکرد دەبێت لە ماوەی دە رۆژدا مەدینە جێبهێڵن، ئەوانیش لەبری جێهێشتن، لە ماوەی ئەو دە رۆژەدا هەوڵیاندەدا خۆیان ئامادە بکەن بۆ بەرگری کردن و سەرۆکی دووڕووەکانیش بە نهێنی پەیامی بۆ ناردن کە لە مەدینە دەرنەچن و بەڵێنی پشتیوانی پێدان و ئەوانیش بە بەڵێنەکەی هەڵخەڵەتان و بڕیاری بەرگرییان دا، دواییش راستگۆ نەبوو لە بەڵێنەکەیدا.(٤)

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئیبن ئوم مەکتومی کرد بە بەرپرسی مەدینە و بە سوپایەکەوە ماوەی پانزە رۆژ گەمارۆی بەنونەضیری دا، ئەوانیش رۆژانە بە تیرهاویشتن و بەرد بەردانەوە لە قەڵاکانیانەوە بەرگرییان دەکرد،(٥) پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە رێنمایی خوای گەورە

---

(١) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٤٤.

(٢) سنن أبي داود، الرقم ٢٦٢٦، صححه الألباني.

(٣) مصنف عبدالرزاق الصنعاني، الرقم ٩٤٣٠.

(٤) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٤٤.

(٥) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٤٤.

فەرمانی کرد دارخورماکانیان بڕانەوەو سووتێنران،[١] وەك لە قورئاندا ئاماژەی پێ دراوە:

﴿ مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِىَ ٱلْفَٰسِقِينَ ۝٥ ﴾[٢]

دووڕووەکان و جوولەکەکانی تریش ئامادە نەبوون پشتیوانییان بکەن، ناچار رازی بوون مەدینە جێبهێڵن، بەڵام پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) مەرجی لەسەر دانان تەنها خۆیان و باری وڵاخەکانیان شمەك ببەن و هەرچیەکی تریان هەیە جێی بهێڵن، ئەوانیش رازی بوون و بێ کوشتار شارەکەیان جێهێشت و روویانکردە خەیبەر،[٣] هەندێکیشیان روویانکردە شامن[٤] دەستکەوتەکانیش بە فەرمانی خوا تایبەت کران بە پێغەمبەری خواوە و ئەویش خەرجی یەك ساڵ خێزانەکانی لێ جیادەکردەوەو چەك و سوار و شمەکە جەنگیەکانیشی دادەنا بۆ مەیدانی جیهاد،[٥] سوورەتی حەشر تایبەت بەم رووداوە دابەزی[٦] و وردەکاری رووداوەکە و حوکمی خوای لەو بارەوە تێدا باسکردووە.

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٢٢٢٢، صحيح مسلم، الرقم ٣٣٧٢.

(٢) الحشر: ٥.

(٣) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٤٤.

(٤) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٤، ص ٨٧.

(٥) صحيح البخاري، الرقم ٢٧٦٩، صحيح مسلم، الرقم ٣٣٨٨.

(٦) صحيح البخاري، الرقم ٤٦٠٢، صحيح مسلم، الرقم ٥٤٧٨.

## غەزای بەدرولمەوعید:

ئەم غەزایە لە مانگی شەعبانی ساڵی چوارەمی کۆچیدا روویدا،[١] هۆکارەکەشی لەسەر بەڵێنێ بوو کە لە غەزای ئوحوددا ئەبوسوفیان وادەی جەنگی دانا بۆ ساڵی داهاتوو.[٢]

ئەبووسوفیان لە بەڵێنەکەی خۆی پەشیمان بوو و هەوڵیدا لە رێی نێردراوەوە ترسێك لای موسڵمانان دروست بکات ناچار بن نەیەن بەدەم مەوعیدەکەوە، بەڵام پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بڕیاری دا بە تەنهاش بێت بچێت،[٣] ئینجا عەبدوڵای کوڕی عەبدوڵای کوڕی ئوبەی (کوڕی سەرکردەی دووڕووەکان) ی کرد بە بەرپرسی مەدینە[٤] و خۆی بە هەزار و پێنج سەد هاوەڵەوە رووەو بەدر رۆیشت،[٥] ئەبووسوفیانیش بە نابەدڵی بە سوپایەکی دوو هەزار کەسیەوە بەڕێکەوت هەتا لە نیوەی رێدا ترس و بیم دایگرت و بڕیاری کشانەوەی دا و بە زمانی لووس قەناعەتی بە خەڵکەکەش کرد و گەڕانەوە بەرەو مەککە،[٦] پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ماوەی هەشت رۆژ چاوەڕوانی ئەبووسوفیانی کرد کەچی هەر نەهات، بۆیە گەڕایەوە بۆ مەدینە.[٧]

---

(١) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٢٠٩.

(٢) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٤٥.

(٣) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٤٦.

(٤) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٢٠٩.

(٥) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٤، ص ١٠٢.

(٦) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٤٦.

(٧) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٤، ص ١٠١.

## غەزای دەومەتولجەندەل:

کاتەکەی لە مانگی رەبیعولئەووەلی ساڵی پێنجەمی کۆچیدا بوو، هۆکارەکەشی کۆبوونەوەیەکی سەربازی بوو لە ناوچەی دەومەتولجەندەل و نیازیان هەبوو هێرش ببەنە سەر مەدینە، بۆیە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سیباعی کوڕی عورفوطەی غیفاری کرد بە بەرپرسی مەدینە و بە دوو هەزار موسڵمانەوە هێرشی بردە سەریان و بێباوەڕان بڵاوەیان لێکرد و دەستکەوتێکی زۆر بۆ موسڵمانان مایەوە و بە سەلامەتی گەڕانەوە مەدینە، چوون و هاتنەوەکە نزیکەی مانگێکی پێ چوو.[١]

## غەزای مورەیسیع :

کاتی غەزاکە لە دووی شەعبانی ساڵی پێنجەمی کۆچیدا بوو،[٢] هۆکارەکەشی ئەوەبوو کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بیستی حارثی سەرگەورەی بەنیلموصطەلەق خەریکی پێکهێنانی سوپایەکە بۆ هێرش کردنە سەر موسڵمانان.[٣]

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سەرەتا بۆ دڵنیایی هەواڵگرێکی نارد و دڵنیابوویەوە کە هەواڵەکە راستە، بۆیە خێرا ئەبووزەری غیفاری کرد بە بەرپرسی مەدینە و بە حەوت سەد جەنگاوەرەوە[٤] کە دەستەیەك لە دووڕووەکانیشی

---

(١) ابن سعد: الطبقات الکبری، ج٢، ص ٤٨.

(٢) ابن کثیر: البدایة والنهایة، ج٤، ص ١٧٨.

(٣) ابن هشام: السیرة النبویة، ج٢، ص ٢٩٠.

(٤) ابن کثیر: البدایة والنهایة، ج٤، ص ١٧٨.

تێدابوو بەرێکەوت، لە کتوپڕێکدا دای بەسەریاندا و دەستکەوتێکی زۆریش بۆ موسڵمانان مایەوە،[١] یەك موسڵمانیش بە هەڵە کوژرا.[٢]

## پەرچەکرداری دووڕووەکان :

عەبدوڵای کوڕی ئوبەی ویستی تۆوی دووبەرەکی نێوان موسڵمانان بچێنێ، بەڵام شکستی هێنا[٣] و دەقی ئایەتیش لە بارەیەوە دابەزی[٤]:

﴿ يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَآ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ ٱلْأَعَزُّ مِنْهَا ٱلْأَذَلَّ ۚ وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨﴾ ﴾،[٥]

(دوو ڕووەکان دەڵێن: سوێندبێ بە خوا، ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە و لەم جەنگە ڕزگارمان بوو دەبێ دەسەڵاتدارو بەڕێز خەڵکە ڕووت و لاتەکەی لێدەرکەن و ڕێزو عیززەت و گەورەیی هەر بۆ خواو بۆ پەیامبەرەکەیی و بۆ باوەڕ دارانە، بەڵام دووڕووەکان نازانن، چونکە ڕێی راستیان لێچەواشە بووە).

هەوڵی دووەمی دووڕووەکان تۆمەت بەخشینەوە بوو بۆ دایکی باوەڕداران عائیشە کە بە ڕووداوی ئیفك ناسراوە، ئەم هەوڵەیان کاریگەریی زیاتری هەبوو و چارەسەرکردنی ماوەیەکی پێویست بوو، بنەڕەتی ڕووداوەکەش ئەوەبوو کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەرکات بیویستایە لە مەدینە دەربچێت تیروپشکی دەکرد بۆ هاوسەرەکانی و یەکێك لە هاوسەرەکانی لەگەڵ خۆی دەبرد،

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٢٤٢٣، صحيح مسلم، الرقم ٣٣٤٧.

(٢) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٦، ص ٥٣٩.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ٣٣٤٨، صحيح مسلم، الرقم ٤٧٨٧.

(٤) صحيح البخاري، الرقم ٤٦١٩.

(٥) المنافقون: ٨.

لە غەزای مورەیسیعدا عائیشە ناوی دەرچوو،[١] کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە غەزاکە بوویەوەو بەرەو مەدینە کەوتەوەڕێ، کە لە مەدینە نزیك بوونەوە، پاش حەوانەوە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی دەرچوونی دەرکرد، عائیشە بە پیادە کەمێك لە سوپاکە دوورکەوتبوویەوە، کە هاتەوە کاروانەکە ڕۆیشتبوو، لەوێ مایەوە بەو هیوایەی بێنەوە بە شوێنیدا.

صەفوانی کوڕی موعەططەلی سولەمی لە دوای سوپاکەوە بوو، کە عائیشەی بینی سواری وشترەکەی کرد هەتا گەیاندیەوە کاروانەکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و موسڵمانان، دووڕووەکان ئەمەیان بە فرسەت زانی و تۆمەتی زینایان دایە پاڵ عائیشە و صەفوان، تۆمەتەکە بە چەشنێ بوو پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) نەیدەزانی چ بڕیارێکی تێدا بدات، ماوەیەکی زۆر لە چەند روانگەوە وردەکاری تێدا کرد، دواجار ئایەت لەو بارەوە دابەزی و حوکمی یەکلاکەرەوەی لەسەردا، ئەگەرنا ئاگری فیتنەیەکی گەورە بوو دەکرا دەستکەوتەکانی غەزاکە بگۆڕێت بۆ شکست، حوکمەکەش پاکداوێنی عائیشە و ناڕاستی تۆمەتی دووڕووەکان و سزادانی ئەو موسڵمانانەی لەخۆدەگرت کە دانیان نابوو بە تۆمەتەکەدا.[٢]

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٢٥٣٩، صحيح ابن حبان، الرقم ٧٢٠٨.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٢٥٣٩، صحيح مسلم، الرقم ٥٠٨٠.

# باسی هەشتەم

## غەزای خەندەق و بەنوقورەیظەو بەنولیحیان

### غەزای خەندەق:

لە مانگی شەووالی ساڵی پێنجەمی کۆچیدا روویدا،[١] هۆکارەکەشی ئەوەبوو کە چەند هێزێکی جیاواز بە یەك ئامانج و بە پێشنیاری جوولەکەکانی بەنونەضیر رێککەوتن لەسەر هێرش بردنە سەر مەدینە بە مەبەستی لەناوبردنی دەوڵەتی ئیسلامی،[٢] هێزێکی گەورەی دە هەزار کەسییان لە رووی سوپا و پێداویستیەکانیەوە پێکهێنا و بەرەو مەدینە بەڕێکەوتن و ئەبووسوفیانیش سەرکردایەتی گشتی پێ سپێردرابوو.[٣]

هەواڵەکە گەیشت بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ئەویش راوێژی کرد بە هاوەڵانی و دواجار پێشنیاری سەلمانی فارسی وەرگرت، ئەویش لێدانی خەندەقێك بوو بە دەوری مەدینەدا،[٤] ئەم ئەزموونەش بۆ عەرەب نامۆ بوو، پێشنیارەکەش ئەنجامی باشی بەدەستەوەدا، دووڕووەکان نەدەچوون بە دەم

---

(١) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٤، ص ١٠٧.

(٢) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٢١٤ – ٢١٥.

(٣) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٥١.

(٤) المصدر نفسه.

بەرگریەکەوەو خۆیان دەدزیەوە،[١] بەڵام کۆچەران و پشتیوانان بە گەرموگوڕیەوە بەشدارییان کرد، خودی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەشداری هەڵکەندنی خەندەقەکەی کرد[٢] و لە گەرمەی ئیشکردندا موژدەی سەرکەوتنی گەورەتر لە سەرکەوتنی نێو ئەو جەنگەی پێدان، موژدەی فەتحکردنی خاکی فارس و رۆم و یەمەنی پێدان،[٣] ئینجا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئیبن ئوم مەکتومی کرد بە بەرپرسی مەدینە و بە سێ هەزار کەسەوە دەرچوو بۆ رووبەڕووبوونەوەی هێزەکانی دوژمن.[٤]

بێباوەڕان کە هاتن واقیان وڕما لەو پلانە و نەیانتوانی هێرش بکەن، ناچار بڕیاری گەمارۆیان دا و جارجارەش لە ڕێی تیرهاویشتنەوە هێرشیان دەکرد، ماوەی بیست و سێ رۆژ زیاتر گەمارۆی مەدینەیان دا، بەردەوام لەو ماوەدا لەگەڵ بەشێك لە جوولەکەکانی بەنوقورەیظە لەسەر هێڵ بوون بۆ دزەکردنە ناو مەدینە، دواتر هێزیی ناپاکی لەنێو جوولەکەکاندا زاڵ بوو بەسەر هێزی پەیمانپارێزدا و ئەو بەڵێننامەی لەگەڵ پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) نووسیبوویان بۆ پاراستنی مەدینە دڕاندیان و لەگەڵ هێزی شاڵاوهێنی بێباوەڕاندا دەستیان تێکەڵکرد.[٥]

حاڵەتێکی زۆر سەخت تووشی موسڵمانان بووبوو، چەند هێز لەوپەڕی ئامادەباشیدا هاتبوون بەو نیازەی بە یەکجارەکی لەناویان ببەن، دووڕووەکان بەشدارییان نەدەکرد لە بەرگریکردندا و ترسیشیان بڵاودەکردەوە، جوولەکەکانیش بەڵێنی خۆیان شکاند و نەوەك تەنها بەرگرییان نەدەکرد، بەڵکو لەگەڵ دوژمندا دەستیان تێکەڵ کردبوو، قورئانی پیرۆز وردەکاری حاڵەتەکەی تۆمارکردووە:

---

(١) ابن هشام: السیرة النبویة، ج٢، ص ٢١٦.

(٢) صحیح البخاري، الرقم ٣٦٠٩، صحیح مسلم، الرقم ٣٤٥٤.

(٣) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٨٣١٦، السنن الکبری للنسائي، الرقم٨٥٨٤.

(٤) ابن هشام: السیرة النبویة، ج٢، ص ٢٢٠.

(٥) ابن کثیر: البدایة والنهایة، ج٤، ص ١١٨ – ١٢٠.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ جَآءَتۡكُمۡ جُنُودٞ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا وَجُنُودٗا لَّمۡ تَرَوۡهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرًا ٩ إِذۡ جَآءُوكُم مِّن فَوۡقِكُمۡ وَمِنۡ أَسۡفَلَ مِنكُمۡ وَإِذۡ زَاغَتِ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلۡقُلُوبُ ٱلۡحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ١٠ هُنَالِكَ ٱبۡتُلِيَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَزُلۡزِلُواْ زِلۡزَالٗا شَدِيدٗا ١١ وَإِذۡ يَقُولُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورٗا ١٢ وَإِذۡ قَالَت طَّآئِفَةٞ مِّنۡهُمۡ يَٰٓأَهۡلَ يَثۡرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمۡ فَٱرۡجِعُواْۚ وَيَسۡتَـٔۡذِنُ فَرِيقٞ مِّنۡهُمُ ٱلنَّبِيَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوۡرَةٞ وَمَا هِيَ بِعَوۡرَةٍۖ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارٗا ١٣ ﴾[1]

(ئەی گەلی خاوەن باوەڕ! بەردەوام یادی نیعمەت و بەخششی خوا بکەنەوە بەسەرتانەوە ئەو دەمە کە لە شکرێکی فرە گەورە هاتە سەرتان ئەوسا ئێمەیش لەوکاتە زۆر ترسناکەدا (با)یەکی زۆر توندو ساردمان ناردە سەریان، هاوڕێ لەگەڵ کۆمەڵێ سەربازی فریشتەدا کە ئێوە نەتاندیتن وە خوا هەمووکات بینایە بەو کاروکردەوەیە ئێوە ئەنجامی ئەدەن، دوژمن لەلای سەروو، لەلای خواروتانەوە بۆتان هاتن، ئیتر گش چاوێ کلاو مۆڵەق بوو و، لە روانینی باری ئاسایی خۆی و هەموو دڵێکیش لە ترسدا گەیشتە گەروو ئێوەش گومانێ زۆری جۆراو جۆرتان بە خوا دەبرد لەو جێگاو شوێنەدا بڕوادارەکان کەوتنە ژێر تاقییکردنەوە وە تەکانێکی زۆر سەختیان خواردو کەوتنە چرکە چرك و، زۆر بە توندی حاڵیان تێکچوو و کەوتنە وەزعێکی ناهەموارەوە، بیر بێنە ئەو کاتەی دووڕووەکان و ئەوانەش دڵیان نەخۆش بوو ئەیانوت: ئەو بەڵێنەی خواو پێغەمبەرەکەی پێیانداین بە سەرکەوتن، هەر فریودان و لە خشتە بردن بوو بۆمان! ئەو کاتەش وەبیربێنە کە دەستەیەك لە دووڕازەکان وتیان ئەی خەڵکی مەدینە! ئەمە جێ و شوێنی مانەوە نیە بۆ ئێوە، ئەگەر هەر لێرە بمێننەوە، لەوانەیە هەموو تیا بچن، دەسا هەتا نەکوژراون بگەڕێنەوە دەستەیەکیشیان (هۆزی بەنی حاریسە) بۆ خۆ دزینەوە دەهاتن مۆڵەتیان لە پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) دەخواست و دەیانوت:

---

(١) الأحزاب: ٩ - ١٣.

ماڵەکانمان بێ پارێزەرەو کەسمان دانە ناوە ئاگای لێیان بێ، جا لەبەر ئەوە هەر دەبێ بگەڕێینەوە پاسەوانییان بکەین! خۆ لە ڕاستیشدا درۆیان کردو بێ پارێزگار نەبوون، بەڵکو لە جێگەی مەحکەمدا بوون هەر دەیانەوێ لە گۆڕەپانی جیهاد هەڵبێن و خۆ بدزنەوەو ڕابکەن).

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەردەوام هێزی پاسەوانی و بەرگریی دەناردەوە نێو مەدینە، لەوانە سەلەمەی کوڕی ئەسلەمی بە دووسەد کەسەوە و زەیدی کوڕی حارثەشی بە سێ سەد سەربازەوە نارد هەتا بگەڕێن بە ناو مەدینەدا و تەکبیر بکەن نەبادا جوولەکەکان دەست بوەشێنن لە ژن و منداڵی موسڵمانان و گورزی خۆیان بوەشێنن.[١]

کاتێك مەترسیەکان زیاتر بوون، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ویستی لەگەڵ غەتەفانیەکان ڕێککەوتنێك بکات بەشێ لە خورمای مەدینەیان پێ بدات لە بەرامبەر ئەوەی بەشداربن لە پاراستنی مەدینەدا، بەڵام سەعدی کوڕی موعاذ و سەعدی کوڕی عوبادە پێشنیاریان کرد بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەوە نەکات، ئەویش ڕازی بوو.[٢]

بێباوەڕەکانیش بەردەوام هەوڵیان دەدا لە خەندەقەکە بپەڕنەوە، چەند کەسێك بە هەوڵی شەخصی توانییان بپەڕنەوە، بەڵام بە دەستی موسڵمانان کوژران، لەوانە عەمری کوڕی وۆد کە بەدەستی عەلی کوڕی ئەبووتالیب کوژرا،[٣] تیرێکیش بەر سەعدی کوڕی موعاذ کەوت و بەهۆیەوە بریندار بوو و دواجار بەهۆیەوە شەهیدبوو.[٤]

موسڵمانبوونی نوعەیمی کوڕی مەسعوود خاڵی وەرچەرخان بوو لە جەنگەکەدا، لە گەرمەی جەنگەکەدا نوعەیم موسڵمان بوو و توانی نێوانی بەنی

---

(١) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٥١ – ٥٢.

(٢) المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٥٢٦٨.

(٣) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٤، ص ١٠٥.

(٤) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج١، ص ٢٨١.

قورەیظە و غەطەفانیەکان و قورەیشیەکان تێکبدات و بیانکاتە نەیاری یەك،[١] پلانەکەشی ئەوەبوو کە هەردوولا لە یەکدی بەدگومان بکات و وا نیشانی هەرکامیان بدات لایەنەکەی دی دەیەوێت ئەمان بخاتە داوەکەوە، نوعەیم توانی سەرکەوتوانە پلانەکەئەنجام بدات چونکە موسڵمانبوونی خۆی ئاشکرا نەکردبوو و هەردوو لایەنی جوولەکەو بێباوەڕەکان متمانەیان پێی بوو کە لایەنگری موسڵمانان نەبێت، بە دوای ئەوەشدا خوای گەورە رەشەبایەکی توندی نارد کە بێباوەڕانی ناچار کرد گەمارۆکە واز لێ بهێنن و بکشێنەوە،[٢] وەك خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ جَآءَتۡكُمۡ جُنُودٞ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا وَجُنُودٗا لَّمۡ تَرَوۡهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٩﴾ ﴾،

ئەم حاڵەتە وایکرد بێباوەڕان بێ ئەوەی بجەنگن پاشەکشە بکەن:

﴿ وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِغَيۡظِهِمۡ لَمۡ يَنَالُواْ خَيۡرٗاۚ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱلۡقِتَالَۚ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزٗا ﴿٢٥﴾ ﴾[٣]

(خوا دای بە پۆزەی بێباوەڕاندا و بەدڵی پڕ لەڕق و قینەوە گێڕانیەوە و هیچ بەهرەیەکیشیان دەست نەکەوت، وێڕای ئەوەش لە گۆڕەپانی جەنگدا، خوا موسڵمانەکانی پاراست و بێ نیازی کردن لە جەنگی شەڕ فرۆشان، دیارە کە خوا هەمیشە بەهێزە بۆ تۆڵە وەرگرتن لە دوژمن، زۆریش زاڵ و بە دەسەڵاتە) ئەمەش کۆتا هێرشی بێباوەڕان بوو بۆ سەر موسڵمانان و لەوە بەدوا تەنها هەڵوێستی بەرگرییان هەبوو.[٤]

---

(١) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٥، ص ٣٦٤.

(٢) دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ١٣٢٦.

(٣) الأحزاب: ٢٥.

(٤) صحيح البخاري، الرقم ٣٨٩٩.

## غەزای بەنوقورەیظە:

هۆکاری غەزاکە ئەو ناپاکیە بوو کە بەنوقورەیظە لە غەزای خەندەقدا ئەنجامیان دا، ناپاکی گەورەیان بەرامبەر بە وڵات ئەنجام دا و لە کاتی مەترسی گەورەی سەر وڵاتدا لەگەڵ هێزی دوژمندا دەستیان تێکەڵ کرد بەو نیازەی دوژمن دەست بگرێت بەسەر وڵاتدا لە کاتێکدا پێشتر رێککەوتنیان هەبووە[1] کە بەشداربن لە پاراستنی وڵاتدا.

ئەگەرچی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سەرەتا بەنیاز نەبوو سزای سەربازیی بەنوقورەیظە بدات؟ بەڵام کە گەڕایەوە نێو مەدینە، بە وەحی خوایی لە رێی جیبریلەوە فەرمانی پێ کرا سزای بەنوقورەیظە بدات،[2] پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) خێرا فەرمانی کرد بە موسڵمانان رووەو بەنوقورەیظە بەرێبکەون و نوێژ نەکەن تا خۆیان نەگەیەننە ئەوێ، موسڵمانانیش بەرێکەوتن و خۆیان گەیاند بە پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم)،[3] ئینجا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ماوەی بیست و پێنج شەو گەمارۆی خستە سەریان، ئەوانیش کە زانییان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە بڕیارەکەی پاشگەز نابێتەو تووشی بێهێوایی بوون و راجیاییەك لەنێویاندا دروست بوو، چەند پێشنیارێك خرانەڕوو، لەوانە موسڵمانبوون یان هێرش بردن، بەڵام کۆدەنگی لەسەر هیچ پێشنیارێکیان دروست نەبوو،[4] دوایین پێشنیار کە لەسەری کۆك بوون رێگەی وتوێژ بوو، سەرەتا داوایان کرد ئەبوولوبابە وەك نوێنەری موسڵمانان بچێت بۆ دانووستانەکە، ئەبوولوباشە رۆیشت و بەنوقورەیظە

---

(١) دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ١٢٨٩.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٣٩٠٧.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ٩١٨.

(٤) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٢٣٥.

توانییان نهێنی بڕیاری پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئاشکرا بکەن، ئەوکات بیریان لەوە کردەوە بڕیاری کۆتایی نێوان موسڵمانان و خۆیان بدەنە دەست سەعدی کوڕی موعاذی ئەوسیی کە هاوپەیمانی سەردەمی پێش هیجرەتیان بوو، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) بە پێشنیارەکەیان رازی بوو،[١] هیچ زۆر و رووگیرکردن و پێشنیارێکیشی بۆ سەعد نەخستەڕوو بۆ ئەوەی هیچ کاریگەریەکی نەبێت لەسەر ئەو دادوەرەی کە خودی بەنوقوڕەیظە رازی بوون حوکمیان لە بارەوە بدات،[٢] زۆر هەوڵ درا وا لە سەعد بکرێت بڕیارێکی نەرم بدات بەرامبەر بە هاوپەیمانەکانی، بەڵام سەعد نەچووە ژێربار.[٣]

پێش ئەوەی سەعد حوکم بدات پێیان وت ئەی ئەبووعەمر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تۆی راسپاردووە تا حوکم بدەیت لەسەریان، ئەویش وتی بەڵێنی خوا دەدەن کە بە حوکمەکەم رازی بن؟ وتیان بەڵێ، ئینجا وتی ئەمانەی ئەم لاش (ئەو لایەی کە پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) تێدا بوو) بەڵام لە شەرمی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) رووی نەکرد بە لاکەی پێغەمبەری خوادا (صلی الله علیه وسلم)، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی بەڵێ،[٤] سەعد وتی حوکمی من ئەوەیە جەنگاوەرەکانیان بکوژرێن و ژن و منداڵیان بە سەبی بگیرێن.[٥]

مەسەلەی رووداوی بەنوقورەیظە مشتومڕێکی زۆری لەسەرەو هەندێ بە ئەفسانەی دەزانن و هەندێکیش زێدەڕۆیی دەکەن لە وردەکاریەکانیدا، ئەو رووداوە حەقیقەتی مێژوویی هەیە و بە بەڵگەی صەحیح سەلمێنراوە، بەڵام نەك بەو جۆرەی لە سەرچاوەکانی مێژوودا باس کراوە، چونکە هەم لە کوشتاری

---

(١) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٤٥٣٨، صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٣٨، حسنه شعيب الأرناؤوط.

(٢) تاريخ الإسلام، ج٢، ص ٣١٤.

(٣) تاريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٣١٥.

(٤) تاريخ الإسلام، ج٢، ص ٣١٤.

(٥) صحيح البخاري، الرقم ٢٨٩٩ و ٣٦١٦، صحيح مسلم، الرقم ٣٤٠١.

کەسەکان و ژمارەی کوژراوەکانیشدا زێدەڕۆیی هەیە، ئەوەی دەقی صەحیحەو لە بوخاری و موسلیمدا هاتووە بڕیار دراوە تەنها جەنگاوەرەکانیان بکوژرێن و ژن و منداڵیان بە سەبی بگیرێن و سامانیان دەستی بەسەردا بگیرێت.

لە قورئانی پیرۆزدا باسی ئەم غەزایە کراوە: ﴿ وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَٰهَرُوهُم مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مِن صَيَاصِيهِمْ وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ فَرِيقًا تَقْتُلُونَ وَتَأْسِرُونَ فَرِيقًا ﴿٢٦﴾ وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ وَدِيَٰرَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُمْ وَأَرْضًا لَّمْ تَطَـُٔوهَا ﴿٢٧﴾ ﴾[1]

(ئەو خوایەی وای لە خاوەن نامەکانیش کرد کە پشتیوانی دووڕووەکان بوون لە قەڵاو بارەگاکانیان دابەزێنێتە خوارێ و ترسێکی زۆریشی خستە دڵیانەوە دەرەنجام ئێوە ئەی موسڵمانان! دەستەیەکتان لێدەکوشتن، واتە: پیاوەکانیان، دەستەیەکیشتان لێ دیل دەکردن، هەرچی زەویی و زارو ماڵ و سامانێکیان هەبوو خوا دای بە ئێوە، وە ئەو زەوییەش کە هێشتا پێتان تێنەنابوو و پێینەگەیشتبوون).

ئەوانەی لەم ئایەتانەدا باسکراون: ئەهلی کیتاب کە جوولەکەکانی بەنوقورەیظە بوون ناپاکییان نواندووە، ترس و بیمێ لایان دروست بووە، جوولەکەکان هەم لێیان کوژراوەو هەم لێیان بەدیل گیراوە، زەوی و ماڵ و حاڵ و سامانیان دەستی بەسەرداگیراوە.

سەبارەت بە ژمارەی کوژراوەکان چەند ژمارەیەك باسکراون (٣٩، ٤٠٠، ٦٠٠، ٧٠٠، ٨٠٠، ٩٠٠)، بەڵام پێویستە ئەم خاڵانە لەبەرچاو بگرین:

**یەکەم:** بڕیاری کوشتن تەنها بۆ جەنگاوەرەکان دەرچووە.

**دووەم:** ئەوانەی بڕیاری کوشتنیان بۆ دەرچووە براونەتە ماڵی رەملەی کچی حارث و هەموویان لەوێ کۆکراونەتەوە، ماڵێکیش بە تەنها (٤٠٠) کەس ناگرێت، ئەگەرچی خانووەکەی رەملە گەورە بووە و زۆربەی وەفدەکان براونەتە ئەوێ و لەوێ ماونەتەوە.[2]

---

(١) الأحزاب: ٢٦ - ٢٧.

(٢) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج١، ص ٢٢٨ و ٢٥٩ و ٢٦١.

**سێیەم:** هەموو جەنگەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ بێباوەڕاندا لە بەدرەوە هەتا تەبوك (٣٠٠) بێباوەڕی تێدا نەکوژراوە؟ ئایا ئاساییە بە رۆژێ (٩٠٠) کەس لە شارێکدا بکوژرێن؟!

بەم چەشنە لە ماوەی دوو مانگی ساڵی پێنجەمی کۆچیدا دوو دوژمنی سەرسەختی دەرەکی و ناوخۆیی لەسەر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و موسڵمانان شکستیان خوارد.

## غـەزای بەنولیحـیان:

هۆکارەکەی ناپاکی بەنولیحیان بوو لە رووداوی رەجیعدا، بۆیە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە مانگی رەبیعولئەووەلی ساڵی شەشەمی کۆچیدا ئیبن ئوم مەکتومی کرد بە بەرپرسی مەدینە و خۆی بە دووسەد هاوەڵەوە کەوتەرێ، بەنولیحیان هەواڵیان پێ گەیشت و رایانکرد، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) گەڕایەوە بەرەو مەدینە، ماوەی چوون و هاتنەوەکەش چواردە شەو بوو.[(١)]

---

(١) ابن سعد: الطبقات الکبری، ج٢، ص ٦٠ — ٦١.

# باسی یەکەم

## ڕێککەوتنی حودەیبیە

لە مانگی ذیلقەعیدەی ساڵی شەشەمی کۆچیدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە هاوەڵانی ڕاگەیاند کە بە نیازی عومرەیە[١] و موژدەی پێدان کە لە خەویدا بینیویەتی هاودەم بە هاوەڵانی بێ ترس عومرە دەکەین،[٢] هاوەڵانیش خۆیان ئامادە کرد،[٣] ئینجا خەڵکی دەوروبەری مەدینەش ئاگادار کرانەوە، بەڵام زۆرێکیان بە هۆی ترس و خۆشەویستی دنیاوە بیانوویان دەهێنایەوە،[٤] قورئانیش بە وردی ئەو بابەتەی باسکردووە:

﴿ سَيَقُولُ لَكَ ٱلْمُخَلَّفُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ شَغَلَتْنَآ أَمْوَٰلُنَا وَأَهْلُونَا فَٱسْتَغْفِرْ لَنَا ۚ يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِى قُلُوبِهِمْ ۚ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا إِنْ أَرَادَ بِكُمْ ضَرًّا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ نَفْعًۢا ۚ بَلْ كَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًۢا ﴿١١﴾ بَلْ ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَنقَلِبَ ٱلرَّسُولُ وَٱلْمُؤْمِنُونَ إِلَىٰٓ أَهْلِيهِمْ أَبَدًا وَزُيِّنَ ذَٰلِكَ فِى قُلُوبِكُمْ وَظَنَنتُمْ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ وَكُنتُمْ قَوْمًۢا بُورًا ﴿١٢﴾ ﴾،[٥]

---

(١) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٧٣.

(٢) الفتح: ٢٧.

(٣) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٧٣.

(٤) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٣٠٨.

(٥) الفتح: ١١ – ١٢.

(جا کە لە حودەیبییە گەڕایتەوە، بێگومان عەرەبە دەشتەکییەکان پێت ئەڵێن: پاراستنی ماڵ و ژن و منداڵمان، ئێمەی بە خۆیەوە سەر گەرمکرد، لە دەرچوون لە گەڵت، جا لای خوا داوای لێبوردنمان بۆ بکەیت، شتێ بە زمانیان دەڵێن، غەیری ئەوەیە لە دڵیاندایە، واتە: لە قسەکانیاندا راست ناکەن و، ئەیانەوێ فرت و فێڵت لێ بکەن، پێیان بڵێ: ئایا چ کەسێك شتێکی بە دەستە لە خواوە بۆتان، ئەگەر خوا ویستی زیانێکی پێتان بوو، یان ویستی سودێکتان پێ بگات، بەڵکو خوا بە کاروکردەوەکانتان بەئاگایە، ئەو دەزانێت هۆی راستەقینە چیبوو لە دوا کەوتنەکەتاندا؟ بەڵکو راستیەکەی ئەمەیە کە پێتان وابوو ئیتر هەرگیز پەیامبەرو بڕواداران جارێکی تر ناگەڕێنەوە نێو خێزانەکانیان ئەو گومانبردنە لە دڵتاندا لە لایەن شەیتانەوە رازێنرابووەوە گومانتان برد، گومانی نا دروست وە ئێوە لە زانینی خوادا قەومێکی تیاچوون ).

بەڵام بڕیارەکە نەوەستێنرا و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نومەیلەی کوڕی عەبدوڵای کرد بە بەرپرسی مەدینە[١] و لە رۆژی دوو شەممەی ناوەڕاستی هەمان مانگدا[٢] هاودەم بە هەزار و چوارسەد کەس[٣] لە پشتیوانان و کۆچەران و بەشێك لە خەڵکی دەوروبەری مەدینە بە شمشێر و ئاژەڵی قوربانییەوە بەڕێکەوت،[٤] لە نیوەی رێدا بوو کە هەواڵی رۆیشتنی بە قوڕەیش گەیشت و خۆیان ئامادە کرد بۆ بەرگرتن بە موسڵمانان،[٥] پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هاوەڵانی کۆکردەوەو راوێژی پێکردن و پێشنیاری ئەوەی بۆ خستنەڕوو ئایا ئەمان هێرشی پێشوەختە ببەنە سەر ئەو هێزانەی کۆبوونەتەوە بۆ پشتیوانی قوڕەیش یان نا؟ ئەبووبەکر پێشنیاری کرد شتی وا نەکەن چونکە هەر لە سەرەتاوە نیەتی عومرەیان هەبووە نەوەك جەنگ، پێغەمبەریش (صلی

---

(١) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٣٠٨.

(٢) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٧٣.

(٣) صحيح مسلم، الرقم ٣٥٣٨.

(٤) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٧٣.

(٥) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٨٥٢٥، قال شعيب الأرناؤوط إسناده حسن.

الله علیه وسلم) وایکرد، بەڵام قورەیش وازیان نەهێنا و خالیدی کوڕی وەلید بە سوپایەکەوە بەرەو ڕووی موسڵمانان هات،(١) پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) هەوڵیدا ڕێڕەوی ڕۆیشتنەکە بگۆڕێت بۆ ئەوەی تووشی جەنگ نەبن،(٢) ئینجا بودەیلی کوڕی وەرقا هەوڵی نێوەندگیری دا و هات بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چەند ڕوونکردنەوەیەکی پێدا:

**یەکەم:** موسڵمانان بۆ عومرە هاتون و نیەتی جەنگیان نیە.

**دووەم:** با قورەیش وازی لێ بهێنن و لە ئاست بانگەوازەکەیدا نە سەری بخەن و نە دژایەتی بکەن، ئەگەر براوە بوو بە دڵی خۆیانە بێنە ناو بانگەوازەکە یان نا، ئەگەریش سەرنەکەوت ئەوە لە کۆڵیان دەبێتەوە.

**سێیەم:** ئەگەر هەر وازی لێ نەهێنن و شەڕی پێ بفرۆشن، بە دڵنیاییەوە هەتا دواسات لەگەڵیان دەجەنگێت.

بودەیل بەم پەیامەوە چوو بۆ لای قورەیشیەکان، کاڵفامەکانیان ئامادە نەبوون گوێ لە ڕوونکردنەوەکە بگرن و بڕیاریان ئەوە بوو هەر دەبێت هێرش ببەن، بەڵام خاوەن ئەزموونەکانیان ڕازی بوون گوێ بگرن، بودەیلیش بە وردی مەسەلەکەی بۆ ڕوونکردنەوە، وتەکانی کاری کردە سەریان، عوروەی کوڕی مەسعوودیان وەك وەفد نارد بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، کاتێك عورەوە گەیشتە ئەوێ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەمان ئەو سێ ڕوونکردنەوەی دووبارە کردەوە، کەچی عوروە بە تۆمەت و گومان دروستکردن وەڵامی دایەوە:

**یەکەم:** ئەمەی تۆ بەرامبەر قەومەکەت دەیکەیت کەس نەیکردووە.

**دووەم:** ئەوانەی لە دەورت کۆبوونەتەوە ڕۆژێ دێت پشتت بەردەدەن.

---

(١) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٨٥٤٠ صححه شعیب الأرناؤوط، صحیح ابن حبان، الرقم ٤٩٤٩.

(٢) ابن هشام: السیرة النبویة، ج٢، ص ٣١٠.

هاوەڵان خۆیان بۆ رانەگیرا و وەڵامیان دایەوە، دەمەقاڵەیەك دروست بوو و بێ ئەنجامێکی بەرچاو دانووستانەکە کۆتایی هات، هەرچەندە عوروە بەو چەشنە موسڵمانانی دواند، بەڵام پەیامێکی بێهیوایی بردەوە بۆ قەومەکەی، پێی راگەیاندن ئەوەی هاوەڵانی موحەممەد دەیکەن بۆ موحەممەد، دەربارەکانی کیسرا و قەیسەرەکان بۆ گەورەکانی خۆیان نایکەن، ئینجا پێشنیاری کرد رێگری لە هاتنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و موسڵمانان نەکەن،[1] بەڵام ئەوان رازی نەبوون، ئینجا وەفدی دووەمیان نارد بە سەرکردایەتی میکرەزی کوڕی حەفص و بێ ئەنجام بوو،[2] وەفدی سێیەم بە سەرکردایەتی حیلسی کوڕی عەلقەمە بوو، کە حاڵی موسڵمانانی بینی زانی تەنها نیازیان عومرەیەو هیچی تر، بێ هیچ دانووستانێ گەڕایەوە و پێشنیاری کرد رێیان لێ نەگیرێت، بەڵام گوێی لێ نەگیرا،[3] لەو لاشەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چەند کەسێکی بە جیاجیا نارد بۆ لای قورەیش بۆ ئەوەی ئەو پەیامە بە قورەیش بگەیەنن کە موسڵمانان بۆ جەنگ نەهاتون، سەرەتا خیراشی کوڕی ئومەییەی نارد، کەچی قورەیشیەکان سووکایەتیەکی زۆریان پێکرد و ویستیان بیکوژن، بەڵام هەندێ لە هاوپەیمانەکانیان نەیانهێشت، ئینجا عوثمانی کوڕی عەففانی نارد، کەچی قورەیشیەکان عوثمانیان لای خۆیان دەستبەسەر کرد، ئەزموونی پێشووی خیراش دڵەراوکێی لای موسڵمانان دروست کرد و دەنگۆش بەو چەشنە گەیشتەوە لای موسڵمانان کە عوثمان کوژراوە،[4] ئەمجار پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بژاردەی سێیەمی لە سێ روونکردنەوەکەی پێشووی هێنایە پێشەوەو هاوەڵانی کۆکردەوەو بەیعەتی ریضوانی لێ وەرگرتن،[5] هەموان بەیعەتیان دا و بەر لێخۆشبوونی خواش کەوتن جگە لە یەك کەس کە بە

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٢٦٠١.

(٢) مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٣٦١٧٥.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ٢٦٠١.

(٤) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٨٥٢٥، حسن إسناده شعيب الأرناؤوط.

(٥) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٣١٥.

دوای وشترە ونبووەکەیدا دەگەڕا و لەبەر وشترەکەی ئامادە نەبوو بچێت بە دەم بانگەوازەکەوە،[١] لە قورئانیشدا باسی گرنگی بەیعەتەکە و دەرەنجامەکانی دواتری کراوە:

﴿ ۞ لَّقَدْ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِى قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾ وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٩﴾ وَعَدَكُمُ ٱللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمْ هَٰذِهِۦ وَكَفَّ أَيْدِىَ ٱلنَّاسِ عَنكُمْ وَلِتَكُونَ ءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ وَيَهْدِيَكُمْ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٢٠﴾ وَأُخْرَىٰ لَمْ تَقْدِرُوا۟ عَلَيْهَا قَدْ أَحَاطَ ٱللَّهُ بِهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرًا ﴿٢١﴾ وَلَوْ قَٰتَلَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوَلَّوُا۟ ٱلْأَدْبَٰرَ ثُمَّ لَا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٢٢﴾ ﴾[٢]

(بێگومان خوا ڕازیبوو لە ئیماندارەکان کاتێ - لە ژێر ئەو درەختەدا پەیمانیان لەگەڵ دەبەستیت جا خوا بەو ڕاستیی و وەفایەی لە دڵیاندا بوو بۆ پەیمانەکەت ئاگاداربووئینجا لەکاتی پەیمانەکەدا ئارامیی دابەزاندە سەریان و بە سەرکەوتنێکی نزیك پاداشتی دانەوە جگە لەوەیش، بە دەستکەوتێکی زۆریش بەڵێنی پێدان خوا هەمیشە خوایەکی بە دەستەڵاتی بە حیکمەتە خوا بەڵێنی بە چەند دەسکەوتێکی زۆر دانێ جا بە زوویی ئەمەیانی دەستخستن، واتە: غەنیمەتەکەی خەیبەر ڕێی لە خەڵکانی دەست درێژکەرانیشی لێگرتن وە بۆ ئەوەی دەستکەوتەکە ببێ بە نیشانەیەك لە ڕاستی بەدیهێنانی بەڵێنی خوا بۆ بڕوادارەکان هەروەها ڕێنماییشتان بکات بۆ ڕێگەیەکی ڕاست و بتانگەیەنێتە بەهەشت وە هی تر کە ئێوە تواناتان نەبوو بەسەریداکە خوا بەزانینی خۆی دەوری لێدابوو و دەیزانی ئەو دەستکەوتانە بۆ ئێوە دەبن چونکە خوا هەمیشە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە ئەگەر بێ باوەڕەکانی مەککە جەنگیان لەگەڵتان کردبا پاشەو پاش هەڵدەهاتن و لەبەر دەستاندا ئەشکان، پاشان هیچ پشتیوان و یارمەتیدەرێکیشیان دەست نە ئەکەوت لەکافرەکانی دیکەدا).

---

(١) صحيح مسلم، الرقم ٥٠٩٢.

(٢) الفتح: ١٨ - ٢٢.

**دەستکەوتی بەشداربوانی ئەم بەیعەتە بریتی بوو لە:**

**یەکەم:** ڕەزامەندی خوا وەك لە ئایەتەکەدا ئاماژەی پێ دراوە.

**دووەم:** لێخۆشبوونی خوا، وەك لە فەرموودەکەی موسلیمدا ئاماژەی پێ دراوە.

**سێیەم:** پارێزران لە دۆزەخ، وەك لە فەرموودەیەکدا هاتووە (لا يدخل النار ممن بايع تحت الشجرة)،[1] (یەك کەس لەوانەی لە ژێر درەختەکەدا بەیعەتیان داوە ناچێتە دۆزەخەوە)

**چوارەم:** بە چاکترین کەسانی سەرزەوی وەسفکران (أنتم اليوم خير أهل الأرض)،[2] (ئێوە ئەمڕۆ چاکترین کەسانی سەرزەوین).

ئەم حاڵەتە گوڕو تینی زۆری بە هاوەڵان دا و ترس و بیمێکیشی لە دڵی بێباوەڕاندا دروست کرد، کاڵفامەکانیان هەوڵیان دەدا جەنگ هەڵبگیرسێنن و خاوەن ئەزموونەکانیشیان هەوڵی ڕێککەوتنیان دەدا، دواجار بە ناردنی سوهەیلی کوڕی عەمر ڕێککەوتنی نێوان موسڵمانان و قوڕەیشیەکان سەری گرت، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) زۆر ڕەچاوی ڕەخنە و ناڕەزاییەکانی سوهەیلی کرد،[3] عەلی کوڕی ئەبوتالیبیش نووسەری ڕێککەوتنەکە بوو،[4] ڕێککەوتنەکە لەسەر ئەم خاڵانە بوو:

---

(١) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٤٤٩٠، سنن أبي داود، الرقم ٤٠٥٥، سنن الترمذي، الرقم ٣٨٧٧ و قال حسن صحيح، صحيح ابن حبان، الرقم ٤٨٧٦، صححه شعيب الأرناؤوط و قال على شرط مسلم، صححه الألباني في مشكاة المصابيح، الرقم ٣٨٦٠.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٣٩٣٨، صحيح مسلم، الرقم ٣٥٤٣ و اللفظ له.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ٢٦٠١.

(٤) صحيح مسلم، الرقم ٣٤٢٤.

**یەکەم:** لەو ساڵەدا پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) و هاوەڵانی نەچنە مەککە و بۆ ساڵی دواتر[١] بۆ ماوەی سێ رۆژ بچنە مەککەو تەنها شمشێری ناو کالانیان پێ بێت.[٢]

**دووەم:** هەرکەس لە موسـڵمانان بچێتەوە نـاو بێبـاوەڕان ناگەڕێنرێتەوە بۆ موسڵمانان.[٣]

**سێیەم:** هەر کەسێکی مەککە با موسڵمانیش بێت بچێت بۆ لای موسڵمانان دەبێت بگەڕێنرێتەوەو پاش گەڕانەوەشی هیچ پاڵپشتیەکی نەکرێت، ئەم حاڵەتە بۆ سەرجەم پیاوان جێبەجێ کرا، بەڵام بۆ ئافرەتان پەیڕەو نەکرا.[٤]

**چوارەم:** ماوەی دە ساڵ جەنگ لەنێوان هەردوولادا هەڵگیرێت.[٥]

**پێنجەم:** هەرکەس لە دەرەوەی ئەم دوو لایەنەی رێککەوتنەکە بیەوێت بچێتە نێو هاوپەیمانی لەگەڵ یەکێك لە لایەنەکانی ئەم رێککەوتنەوە ئەوە سەرپشکە، ئەم خاڵەش جێبەجێ کرا و خوزاعە لەگەڵ موسڵمانان و بەنوبەکریش لەگەڵ قورەیش چوونە نێو هاوپەیمانیەوە.[٦]

**شەشەم:** ئەم رێککەوتنە هیچ جۆرە فرت و فێڵێکی تێدا نەبێت و ئەوپەڕی وەفای تێدا بێت، هیچ جۆرە ناپاکیەکی ژێر بەژێریشی تێدا نەبێت.[٧]

---

(١) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٨٥٤٠.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٢٥٧٢، صحيح مسلم، الرقم ٣٤٢٢.

(٣) صحيح مسلم، الرقم ٣٤٢٤.

(٤) صحيح البخاري، الرقم ٣٩٦٠.

(٥) سنن أبي داود، الرقم ٢٤٠٠ حسنه الألباني، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٨٥٢٥، حسن إسناده شعيب الأرناؤوط.

(٦) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٨٥٢٥، حسن إسناده شعيب الأرناؤوط.

(٧) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٨٥٢٥، حسن إسناده شعيب الأرناؤوط، سنن أبي داود، الرقم ٢٤٠٠ حسنه الألباني.

موسڵمانان بەم ڕێککەوتنە نارازی بوون و بە شکستیان لە قەڵەم دەدا، بە تایبەت دوای ئەوەی بەیعەتی مردن یان رانەکردنیان دابوو و خۆیان بۆ جەنگ ئامادە کردبوو، نارەزایەتیەکەیان لەسەر ئەم خاڵانە بوو:

بۆچی ئەمساڵ نەچین بۆ عومرە لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووبووی عومرە دەکەین؟

بۆچی کەسێك موسڵمان بێت بگەڕێنرێتەوەو کەسێك لە موسڵمانان هەڵگەڕێتەوە نەگەڕێنرێتەوە؟! ئەمە زەلیلیە بۆ ئیسلام، هۆکاری زیاتری ئەم گلەییەش حاڵەتەکەی ئەبوجەندەل بوو کە هەر لە کاتی ڕێککەوتنەکەدا موسڵمان بوو و ویستی بێتە ناو موسڵمانان، بەڵام بە پێی ڕێککەوتنەکە گەڕێنرایەوە بۆ بێباوەڕەکان، تەنها کەسێك لە موسڵمانان توانی ئەم پرسە هەرس بکات ئەبووبەکری صدیق بوو و رۆڵیشی هەبوو لە هێورکردنەوەی نارەزایی ناو ناخی بەشێك لە هاوەڵان.[1]

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سەبارەت بە هەردوو پرسیارەکە روونکردنەوەی پێویستی پێ دان:

ئێمە دەچین و عومرەش دەکەین، کاتێ پێشتر وەعد درا عومرە دەکەین، بەڵام ئەمساڵ وەك وادەی عومرەکە دەستنیشان نەکراوە.[2]

(هەرکەس لە ئێمە بچێت بۆ لای ئەوان ئەوە با هەر خوا دووری بخاتەوە، هەرکەسیش لەوان بێت بۆ لای ئێمە، زۆر ناخایەنێت خوای گەورە کرانەوەو دەرچەیەکی بە روودا دەکاتەوە).[3]

دوای ئەوە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی کرد موسڵمانان هەستن و قوربانیەکانیان بکەن و سەریان بتاشن، بەڵام بێتاقەتی موسڵمانان زۆر

---

(١) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٨٥٤٠، صحيح البخاري، الرقم ٢٦٠١،

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٢٦٠١.

(٣) صحيح مسلم، الرقم ٣٤٢٤.

بوو و ئامادە نەبوون شتی وابکەن، ئینجا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) راوێژی ئوممسەلەمەی خێزانی وەرگرت، ئەویش روونکردنەوەی کردارییی بوو پاش ئەوەی پێشتر بە فەرمایشت روونکردنەوەی پێدابوون، راوێژەکەش ئەوەبوو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە بەرچاوی موسڵمانانەوە قوربانیەکەی بکات و سەری بتاشێت، موسڵمانانیش کە ئەوەیان بینی هەموویان فەرمانەکەیان بەجێگەیاند،[١] ئینجا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گەڕایەوە بۆ مەدینە، لە نیوەی رێدا سوورەتی فەتحی بۆ دابەزی.[٢]

ئەم رێککەوتنە چەند دەستکەوتێکی گەورەی هەبوو:

**یەکەم:** بێباوەڕان لە هێرش بردنەوە کەوتنە بەرگری کردن.

**دووەم:** بێباوەڕان بە رەسمی دانیان نا بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و دەسەڵاتەکەیدا.

**سێیەم:** رێککەوتنێ بەسترا کە بناغەیەکی بەهێز بوو بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەواز و داوێك بۆ پیلانی ناحەزانی، بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکە بریتی بوو لە نامەناردن بۆ دەرەوەی نیمچەدوورگەی عەرەبی، داوەکەش هێرشی قورەیشیەکان بوو بۆ سەر خوزاعە کە راستەوخۆ بەزاندنی خاڵێکی رێککەوتنەکە بوو.

**چوارەم:** موسڵمانانی دوای ئەو رێککەوتنەی ناچار کرد جیاواز لە هیجرەت بیر لە رێگەچارەی نوێ بکەنەوە بۆ دەربازبوون لە دەست بێباوەڕان، سەرەتای ئەم هەنگاوەش لە موسڵمانبوونی ئەبووبەصیردا بەرجەستە کرا کە لەپێناو پاراستنی رێککەوتنەکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و دەربازبوونیش لە دەستی بێباوەڕان، بنکەیەکی نوێی بۆ موسڵمانان دامەزراند کە بوو بە سەرچاوەی ترس و دڵەڕاوکێ بۆ بێباوەڕان، بە دوای ئەودا ئەبووجەندەل خۆی پەیوەست کرد بە ریزەکانی ئەبووبەصیرەوە، ئەم حاڵەتە بێباوەڕانی قورەیشی ناچار کرد یەکێك

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٢٦٠١.

(٢) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٨٠.

لە خاڵەکانی ڕێککەوتنەکە لەکاربخەن[١] (هەرکەس لە موسڵمانان بچێتەوە ناو بێباوەڕان ناگەڕێنرێتەوە بۆ موسڵمانان)، چونکە ئەگەر موسڵمانان بچوونایە بۆ مەدینە ڕاستەوخۆ دەچوونە ناو خاڵەکانی ڕێککەوتنەکەوەو ئاگربەستیان دەکرد، بەڵام ئەگەر بچوونایە بۆ لای ئەبووبەصیر مەترسییان بۆ سەر کاروانە بازرگانیەکانیان دروست دەکرد.[٢]

دوابەدوای ڕێککەوتنەکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نامەی نووسی بۆ کیسرا و قەیسەر و پادشا و سەرکردەکانی ناوچە جیاوازەکان و بانگهێشتی دەکردن بۆ ئیسلام (کیسرای فارس، قەیصەری ڕۆم، نەجاشی،[٣] ئوکەیدیر،[٤] موقەوقیس،[٥] بەرپرسی دیمەشق،[٦] پادشای یەمامە، پادشای عومان، بەرپرسی هەجەر[٧])، بۆ نامەکانیشی مۆرێکی تایبەتی دروست کرد کە لەسەری نەخشێنرابوو (محمد رسول الله)،[٨] کیسرا موسڵمان نەبوو و دژایەتی خۆی نیشان دا،[٩] قەیصەری ڕۆم موسڵمان نەبوو، بەڵام ڕێزی نامەکەی گرت،[١٠] مقوقس موسڵمان نەبوو، بەڵام ڕێزی نامەکەی گرت و بە دیاری وەڵامی دایەوە،[١١] نەجاشی موسڵمان بوو[١٢] و بە دیاریش وەڵامی نامەکەی

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٢٦٠١.

(٢) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٨٥٤٠.

(٣) صحيح مسلم، الرقم ٣٤١٠.

(٤) صحيح ابن حبان، الرقم ٦٦٤٨.

(٥) مصنف ابن أبي شيبة، الرقم ٣٥٩٤٦.

(٦) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج١، ص ٢٠٠.

(٧) المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٦٨٣٩.

(٨) صحيح البخاري، الرقم ٦٥.

(٩) صحيح البخاري، الرقم ٤١٧١.

(١٠) صحيح البخاري، الرقم ٧.

(١١) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٦٨٨٤.

(١٢) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٤٢٣٢.

دایەوە،[١] بەرپرسی دیمەشق باوەڕی نەهێنا و بە ڕەقی هەڵوێستی نواند،[٢] پادشای عومان موسڵمان بوو و بە دیاریش وەڵامی نامەکەی دایەوە، پادشای یەمامەش ڕێزی نامەکەی گرت، بەڵام موسڵمان نەبوو.[٣]

هەرچەندە بەشێکی بەرچاو لەو سەرکردانە موسڵمان نەبوون، بەڵام هەوڵەکە ئامانجی چاکی پێکا کە ئەویش بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکەو گەیاندنی بوو بە جەرگەی ناوەندەکانی دەسەڵات لە جیهانی ئەو سەردەمەدا، ململانێکەش لە مەیدانێکی بچووکی ناوخۆییەوە گوازرایەوە بۆ ململانێیەکی بەهێزی نێودەوڵەتی.

---

(١) سنن أبي داود، الرقم ٣٧١٥، حسنه الألباني.

(٢) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج١، ص ٢٠٠.

(٣) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج١، ص ٢٠١.

# باسی دووەم

## هەنگاوەکانی پاش حودەیبیە

### غـەزای غـــابە:

ئەم غەزایە لە دوای رێککەوتنی حودەیبیە و پێش غەزای خەیبەر روویدا، هۆکارەکەشی ئەوەبوو کە عەبدورەحمانی کوڕی عویەینە و تاقمەکەی هێرشیان کردە سەر رانەوڵاخێکی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کە شوانێکی غیفاری و ژنەکەی سەرپەرشتییان دەکردن، پیاوەکەیان کوشت و ژنەکەیان بەدیل گرت و رانەکەشیان برد، سەلەمەی کوڕی ئەکوەع کە لەوێوە نزیك بوو خێرا کەسێکی نارد هەتا هەواڵ ببات بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و خۆیشی چوو بۆ بەرگرتن بە تاڵانچیەکان و توانی رێ بە پێشڕەوییان بگرێت، بە بەشداری پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) هاودەم بە موسڵمانانێك و توانرا بەر بە تاڵانییەکە بگیرێت و ژمارەیەك لە تاڵانچیەکان بکوژرێن، ئینجا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و یارانی بە دەستکەوتەوە گەڕانەوە مەدینە.[١]

---

(١) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٦٢١٨، صحجه شعيب الأرناؤوط و قال على شرط مسلم.

## غـەزای خـەیبەر:

خەیبەر شارێکی گەورەی جوولەکەنشین بوو کە چەند قەڵای گەورەو پتەوی هەبوو، لە بەرێکیەوە پێنج قەڵا و لە بەرەکەی تریشیەوە سێ قەڵای هەبوو، نزیکەی (٣٨٠) میل لە شاری مەدینەوە دوور بوو، ئەم شارە جوولەکەنشینە بووبوو بە سەرچاوەی هاندان و یەکخستنی هێزەکان دژ بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و موسڵمانان، بە تایبەتی لە غەزای ئەحزاب یان خەندەقدا، هەروەها بووبوو بە بنکەیەك بۆ داڵدەدانی ئەو جوولەکانەی ناپاکییان نواندبوو بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و داخێك لە دڵیاندا مابوویەوەو بۆ دەرفەتێك دەگەڕان هەتا رووەو مەدینە هێرش ببەنەوە، بۆیە دەکرا هەر کاتێکی تر هەمان ئەزموونی خەندەق بە فراوانتر دووبارە بکەنەوە، لەم روانگەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بڕیاری دا ئەم مەترسیەش لەسەر دەوڵەتەکەی نەهێڵێت.

بیست رۆژ پاش گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە حودەیبیە و لە سەرەتای ساڵی حەوتەمی کۆچی و لە مانگی موحەڕەمدا ئامادەکاریی کرد بۆ دەرچوون بەرەو خەیبەر[1] و تەنها دەرفەتی ئەوانەی دا بەشداری بکەن کە بە تاسەی جیهادەوە دەڕۆن، بۆیە هەمان بەشداربووەکانی حودەیبیە بەشدارییان کرد کە هەزار و چوارسەد کەس بوون،[2] پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سیباعی کوڕی عورفوطەی کرد بە بەرپرسی مەدینە.[3]

---

(١) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٤، ص ٢٠٧.

(٢) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٤، ص ٢٠٨.

(٣) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٨٣٤٣، صحيح ابن خزيمة، الرقم ٥٣٨، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٢٨١ و صححه و وافقه الذهبي.

غەطەفانیەکان خۆیان ئامادە کرد بچن بۆ هاوکاری جوولەکەکانی خەیبەر، بەڵام بەهۆی شێوازی دەرچوونی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) ناچار بوون پاشەکشە بکەن و واز لە پشتیوانیکردنیان بهێنن.[١]

سوپای موسڵمانان بە سەرکردایەتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کەوتەڕێ و کاتێ گەیشتنە نزیك خەیبەر شەو بوو،[٢] سەرەتای هێرشەکە بەرگریەکی بەهێزی جوولەکەکان بەدیکرا، بە چەشنێ لە ماوەی نۆ رۆژدا هێرش کرا کەچی فەتح نەکرا، رۆژێك ئاڵای موسڵمانان بەدەست ئەبووبەکری صدیق بوو و قەڵاکە فەتح نەکرا،[٣] رۆژی دواتر پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دایە دەست عومەری کوڕی خەتتاب و بۆ ئەمیش فەتح نەکرا،[٤] دواجار ئاڵاکەی دایە دەست عەلی کوڕی ئەبووتالیب و لەسەر دەستی ئەو قەڵای یەکەم کە قەڵای ناعیم بوو فەتح کرا[٥] و مەرحەبی سەرکردەی هێزی بەرگریکاریی قەڵاکەش بەدەستی عەلی کوژرا،[٦] ئینجا هێرش برا بۆ قەڵای دووەم و ئەویش فەتح کرا،[٧] دوای ئەوە یەك یەك قەڵاکانی تری بەرەی یەکەم فەتح کران، ئینجا هێرش برا بەرەو بەری دووەمی قەڵاکان و پاش ئەوەی گەمارۆیەکی سەختیان خرایە سەر، جوولەکەکان داوای دانووستانیان کرد و لەسەر چەند خاڵێك رێککەوتن:

**یەکەم:** خوێنی ئەوانە بپارێزرێت کە لە قەڵاکەدان.[٨]

---

(١) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٤، ص ٢٠٧.

(٢) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٤، ص ٢٠٨.

(٣) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٢٨٢ و صححه و وافقه الذهبي.

(٤) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٢٨٥ و صححه و وافقه الذهبي.

(٥) صحيح البخاري، الرقم ٢٨٦٨.

(٦) صحيح مسلم، الرقم ٣٤٦٠.

(٧) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٣٣٢.

(٨) سنن أبي داود، الرقم ٢٦٣٧.

**دووەم:** واز لە منداڵەکانیان بهێنرێت و ئەوانیش بە منداڵەکانیانەوە قەڵاکە چۆڵ بکەن.

**سێیەم:** هەرچی سەرمایە و شمەکی ناو خەیبەر هەیە جێی بهێڵن تەنها هەرکەسەو هێندەی کۆڵی سەرشانی خۆی ببات، بەڵام هیچ شتێك نەشارنەوە، ئەگەرنا پەناکەیان هەڵدەوەشێتەوە.(١)

دواتر کە ویستیان شوێنەکە جێبهێڵن دانووستانێکی تریان کرد و ڕێککەوتن لەسەرئەوەی لە خەیبەر بمێننەوەو لە زەویەکانیاندا ئیش بکەن بەو مەرجەی نیوەی بەرهەم بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و موسڵمانان بێت،(٢) بەڵام هەرکات پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و موسڵمانان بیانەوێت دەتوانن لە خەیبەر دەریانبکەن،(٣) ئینجا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەستکەوتەکانی دابەش کرد، نیوەی بۆ پێویستی خۆی و میوانداری وەفدەکان و حاڵەتە تایبەتەکان، نیوەشی بۆ موسڵمانان،(٤) بە فەتحی خەیبەر موسڵمانان لە رووی داراییەوە تەواو بووژانەوە.(٥)

ژمارەی شەهیدانی موسڵمانان هەژدە موسڵمان بوو،(٦) ژمارەی کوژراوانی جوولەکەش نەوەد و سێ کوژراو بوو.

لەو سەروبەندەدا بوو کە هاوەڵانی کۆچەریی حەبەشە گەڕانەوەو هەواڵەکە گەیشت بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و ئەویش زۆر پێی دڵخۆش بوو،(٧) بەدوای ئەم سەرکەوتنەی موسڵماناندا، جوولەکەکانی فەدەکیش خێرا

---

(١) سنن أبي داود، الرقم ٢٦٢٨، حسن إسناده الألباني.

(٢) سنن أبي داود، الرقم ٢٦٢٨، حسن إسناده الألباني.

(٣) سنن أبي داود، الرقم ٢٦٣٠.

(٤) سنن أبي داود، الرقم ٢٦٣٢.

(٥) صحيح البخاري، الرقم ٤٠١٣.

(٦) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٣٩٣.

(٧) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤١٩٣ و صححه و وافقه الذهبي، السنن الكبرى

بڕیاری ڕێککەوتنیان دا و لەسەر هەمان حاڵەتی خەیبەر لەگەڵ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕێککەوتن.[١]

هەواڵی سەرکەوتنی موسڵمانان گەیشتەوە مەککە و موسڵمانەکان پێی دڵخۆش و بێباوەڕەکانیش پێی خەمبار بوون و جۆرێك لە سەربەرزی زیاتری بە موسڵمانان بەخشی.[٢]

ئینجا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەوێوە ڕۆیشت بۆ گەمارۆدانی وادیلقورا و سەرەتا رازی نەبوون خۆیان بدەن بە دەستەوەو جەنگێکی رووبەڕوو روویدا و تیایدا یانزە کەس لەوان کوژرا،[٣] موسڵمانێکیش کوژرا.[٤]

دوای شکستی جوولەکەکان، ئافرەتێکی جوولەکە بیری لە تۆڵەسەندنەوە کرد و گۆشتێکی ژەهراوی بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) برد و بەهۆیەوە هاوەڵێکی وەفاتی کرد و خۆیشی زیانی پێگەیشت و بۆ چارەسەرکردنی کەڵەشاخی گرت، لە سەرەمەرگیشیدا هەستی بە زیانی ئەو ژەهرە کرد و فەرمووی (هێشتا بە برێ دەردی ئەو خواردنەوە دەناڵێنم کە لە ڕۆژی خەیبەر خواردم، ئیتر وا هەست ئەکەم ئەو ژەهرە شاخوێبنەری بڕیبم - توانای پێ نەهێشتبم-).[٥]

---

للبيهقي، الرقم ١٢٦٩٧.

(١) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٤، ص ٢٣٠.

(٢) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٢١٦٦ و صححه شعيب الأرناؤوط، صحيح ابن حبان، الرقم ٤٦٠٠، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٣١٢٤.

(٣) دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ١٦١٦.

(٤) صحيح البخاري، الرقم ٤٠٠٦.

(٥) صحيح البخاري، الرقم ٤١٧٤.

## غـــەزای ذاتوریقـــاع :

دوو بۆچوونی جیاواز هەیە سەبارەت بە کاتی ڕوودانی ئەم غەزایە، هەندێ پێیان وایە پێش خەیبەر بووە، هەندێکیش پێیان وایە دوای خەیبەر ڕوویداوە، بۆچوونی دووەمیش دروستە، چونکە هەریەك لە ئەبووهورەیرە و ئەبوومووسای ئەشعەری کە بەشداربووی غەزاکە بوون، لە غەزای خەیبەردا بەشدار نەبوون و لە سەروبەندی غەزای خەیبەردا گەیشتنە مەدینە.[١]

هۆکاری غەزاکەش ئەوەبوو کە هەواڵ گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەشێك لە بەنوموحاریب و بەشێك لە غەطەفانیەکان خۆیان ئامادە کردووە بۆ هێرش بردنە سەر موسڵمانان،[٢] بۆیە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەبووذەری غیفاری یان عوثمانی کوڕی عەففانی کرد بە بەرپرسی مەدینە[٣] و بە چوارسەد هاوەڵەوە بەرەوڕوویان چوو، کەچی سوپای دوژمن بڵاوەیان لێکرد بەسەر شاخەکاندا[٤] بێ ئەوەی جەنگ ڕووبدات،[٥] هاوکات هەوڵی کوشتنی پێغەمبەری خوایان دا و کاتێ بە تەنها لە ژێر سێبەری درەختێکدا بوو فرسەتیان لێ هێنا، بەڵام خوای گەورە پاراستی،[٦] پاش پانزە شەو دووری لە مەدینە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گەڕایەوە.[٧]

---

(١) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٤، ص ٩٥ -٩٦.

(٢) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٤٧.

(٣) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٤، ص ٩٥.

(٤) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٤٧.

(٥) صحيح البخاري، الرقم ٣٩١٤.

(٦) صحيح مسلم، الرقم ١٤٣٦.

(٧) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٤٧.

لەم غەزایەدا یەكێك لە پشتیوانان شەهید بوو.[١]

عومرەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم):

وەك لە رێككەوتنی حودەیبیە بڕیاری لەسەر درابوو، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەبووروهمی غیفاری كرد بە بەرپرسی مەدینە و لەگەڵ بەشداربوانی حودەیبیەدا لە مانگی ذیلقەعیدەی ساڵی حەوتەمی كۆچیدا رووەو مەككە چوون بۆ عومرە و هەر جۆرە چەكێكیان برد نەبادا قورەیشیەكان ناپاكی بنوێنن، بەڵام لە دەرەوەی حەرەم چەكەكانیان دانا و پاسەوانیان بۆ دانرا، بێباوەڕانیش لەسەریان سەخت بوو عومرەی موسڵمانان ببینن، بۆیە ئەو ماوەی چەند رۆژە بڵاوەیان كرد بەسەر شاخەكاندا و بۆ شاردنەوەی ناخی خۆیان ئەگەری بڵاوبوونەوەی تا و پەتای مەدینەیان لە مەككەدا كردە بیانوو، موسڵمانان عومرەی خۆیان بەجێگەیاند و لە وادەی خۆیشیدا مەككەیان جێهێشت.[٢]

---

(١) سنن أبي داود، الرقم ١٧٢، حسنه الألباني، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٥٠٧ و صححه و وافقه الذهبي.

(٢) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٩٢ – ٩٤.

# باسی سێیەم

## غـەزای موئتــە

### غـەزای موئتە:

ئەم غەزایە لە مانگی جومادیلئوولای ساڵی هەشتەمی کۆچیدا بوو[1] و هۆکارەکەشی ناپاکی نواندن بوو بەرامبەر بە نێردراوی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم).

موئتە لە خوارووی بەلقا بوو ماوەیەك دوور بوو لە شام، لە مانگی جومادیلئوولادا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە نامەیەکەوە حارثی کوڕی عومەیری ئەزدی نارد بۆ لای پاشای بوصرا، کەچی کە گەیشتە موئتە شورەحبیلی کوڕی عەمری غەسانی رێی پێ گرت و کوشتی، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەوەی لەسەر سەخت بوو، بۆیە سوپایەکی نارد کە نزیکەی سێ هەزار کەس دەبوون، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) زانی جەنگی ئەمجارە سەختە و وردەکاری زیاتری بە موسڵمانان دا و فەرمووی (ئەمیری خەڵکەکە زەیدی کوڕی حارثەیە، ئەگەر کوژرا ئەوە جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب ئەمیرە، ئەگەر ئەویش کوژرا ئەوە عەبدوڵای کوڕی رەواحە ئەمیرە، ئەگەر ئەویش کوژرا با موسڵمانان بە رەزامەندی خۆیان لەنێو خۆیاندا کەسێك دیاری بکەن و بیکەنە ئەمیریان)، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئاڵایەکی سپی دایە دەست زەیدی کوڕی حارثەو وەسیەتی کرد بۆیان تا بچنە

---

(١) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٣٧٣.

شوێنی کوژرانەکەی حارثی کوڕی عومەیر و خەڵکی ئەوێ بانگ بکەن بۆ ئیسلام، ئەگەر موسڵمان بوون باشە، ئەگەرنا پشت بەخوا ببەستن و دژیان بجەنگن، خۆیشی بۆ بەڕێکردنیان لەگەڵیان چوو تا گەیشتە (ثنية الوداع)، دوژمنیش ئەم هەواڵەی بیست و سوپای کۆکردەوەو شورەحبیل نزیکەی سەد هەزار سەربازی کۆکردەوەو دەستەی پێشڕەوی نارد، کاتێك موسڵمانان گەیشتنە خاکی شام و هەواڵی زۆری سوپای دوژمن و هاتنی هیرەقلیشیان بە سوپایەکەوە بیست کە نزیك لەو ناوچە بوو، وتیان با نامە بنێرین بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تا بزانین فەرمان بە چی دەکات، بەڵام عەبدوڵای کوڕی رەواحە موسڵمانانی هاندا تا درێژە بدەن بە چوونەکەیان، ئەوەبوو درێژەیان دا بە چوونەکەیان تا گەیشتنە موئتە، دوژمنیش بە سوپایەکی گەورەوە هاتن و جەنگ لەنێوانیاندا روویدا، هەر سێ سەرکردەکە شەهید بوون و دواتر خالیدی کوڕی وەلید لەلایەن موسڵمانانەوە هەڵبژێردرا، ئەویش بە پلانێکی سەرکەوتوو توانی پاشەکشە بکات بە سوپای موسڵمانان،[١] وردەکاری رووداوەکانی جەنگەکە بە وەحی دەدرا بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و ئەویش دەیگێڕایەوە بۆ هاوەڵان.[٢]

کاتێك سوپاکە گەڕانەوە بەرەو مەدینە، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هاودەم بە موسڵمانان چوون بۆ پێشوازی لێکردنیان، خەڵکێك پێیان ناخۆش بوو دوای ئەو زنجیرە سەرکەوتنە یەکدوای یەکەی موسڵمانان جارێکی تر هێزی موسڵمانان بشکێت، بۆیە کەوتنە سەرکۆنەکردنیان و بە کەسانی راکردوو وەسفیان دەکردن، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەو هەڵەی بۆ راستکردنەوەو فەرمووی ئەمانە رایان نەکردووە، بەڵکو پشتیوان بە خوا جارێکی دی دەڕۆنەوە.[٣]

کۆی شەهیدانی غەزای موئتە دوانزە کەس بوو،[٤] لە هێزی بەرامبەریش ژمارەکە دیاری کراو نەبوو.

---

(١) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ١٢٨-١٢٩.

(٢) المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٣٨٤٣.

(٣) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٣٨٢.

(٤) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٣٨٨ – ٣٨٩.

# باسی چوارەم

## فەتحی مەككە

هۆكاری فەتحی مەككە شكاندنی خاڵێكی ڕێككەوتنی حودەیبیە بوو لەلایەن قوڕەیشیەكانەوە، كاتێك لە مانگی شەعبانی ساڵی هەشتەمی كۆچیدا بە هۆی كۆنە قینی نێوان دوو هۆزەكەوە، بەنی بەكری هاوپەیمانی قوڕەیشیەكان لە كتوپڕێكدا هێرشیان بردە سەر خوزاعیەكان و نزیكەی بیست كەسیان لێ كوشتن،(١) ژمارەیەك لە سەرانی قوڕەیش بێ گەڕانەوە بۆ ڕای گشتی قوڕەیش و سەربەخۆ لەم هێرشەدا بەشدارییان كرد،(٢) كاتێك ئەبووسوفیان بەمەی زانی، خێرا هەوڵی چارەسەكردنی ئەم كێشەی دا، چونكە زانی ئەمە هەڵوەشاندنەوەی ڕێككەوتنەكەی لێدەكەوێتەوە.(٣)

خوزاعەش خێرا پەنایان بردە بەر پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چونكە هاوپەیمانی لەنێوانیاندا هەبوو، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بەڵێنی پێدان سەریان بخات، بە دوایدا ئەبووسوفیان خۆی گەیاندە مەدینە بۆ ئەوەی چارەسەری كێشەكە بكات، بەڵام پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئامادە نەبوو بیبینێت،(٤) ئەمەش واتای ڕاگەیاندنی جەنگ بوو.

---

(١) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٣٨٩-٣٩٠.

(٢) السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٨٥٣٢.

(٣) تأريخ الأمم و الملوك، ج٢، ص ١٥٤.

(٤) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٣٩٤ — ٣٩٧.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئامادەکاری کرد بۆ جەنگ و موسڵمانانی ناو مەدینە و دەوروبەری مەدینەشی راسپارد خۆیان ئامادە بکەن، دواجار دە هەزار کەس کۆبوونەوە،[١] بەڵام وردەکاری دەرچوونەکەی بڵاونەکردەوە، سەریەیەکیشی رووەو ناوچەی ئیضەم[٢] نارد[٣] بۆ ئەوەی وا خەڵکی تێبگەیەنێت کە ئاڕاستەکەی بەرەو ئەوێیە.

خەریك بوو هەڵەیەکی گەورەی هاوەڵێکی پایەبەرز پلانەکە تێك بدات، حاطیبی کوڕی ئەبی بەلتەعە لە ترسی خاوخێزانی کە لە مەککە بوون، بە نهێنی نامەیەکی نارد بۆ قورەیش و زانیاری لە بارەی هێرشەکەوە تێدا نووسیبوو، بەڵام پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە ڕێی وەحیەوە ئاگادار کرایەوەو پێش ئەوەی نامەکە بگاتە دەست دوژمن دەستی بەسەردا گیرا و لەبەر پێشینەی ئەو هاوەڵەش، چاوپۆشی لەو هەڵە و لادانەی کرا.[٤]

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کولپومی کوڕی حوصەینی غیفاری کرد بە بەرپرسی مەدینە، ئینجا لە دەی رەمەزانی ساڵی هەشتەمی کۆچیدا بەرەو مەککە کەوتەڕێ،[٥] پێش ئەوەی بچێتە ناو مەککە لە مەڕوظەهران[٦] لایدا و لەوێ ئەبووسوفیان موسڵمان بوو،[٧] پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) لەسەر راوێژی هاوەڵان چەند بڕگەیەکی پەنادانی بڵاوکردەوە (هەرکەس بچێتە ماڵی ئەبووسوفیان پەنادراوە، هەرکەس دەرگای ماڵی خۆی دابخات

---

(١) مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٣٠١ بإسناد حسن.

(٢) ئەم ناوچەیە نزیکەی (١٥٠) کیلۆمەتر لە مەککەوە دوورە.

(٣) مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٣٢٤١ بإسناد حسن.

(٤) الممتحنة: ١.

(٥) مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢٣٠١ بإسناد حسن.

(٦) ناوچەیەکی نزیك لە مەککە بوو.

(٧) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٤، ص ٢٩٠.

پەنادراوە، هەرکەس لە حەرەمدا بێت پەنادراوە،[١] هەرکەس بچێتەماڵی حەکیمی کوڕی حیزام و دەست لە جەنگ هەڵگرێ ئەوە پەنادراوە[٢])، ئەم پەنادانە تەنها دە کەسی نەدەگرتەوەو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بڕیاریدا لە هەر حاڵەتێکدا خوێنیان ڕەوایە، ئەمانەش کەسانێك بوون کە دەستیان هەبوو لە شکاندنی ڕێککەوتنەکەو کوشتنی خوزاعیەکاندا.[٣]

ئەبووسوفیان گەڕایەوە مەککەو هەوڵیدا خەڵکەکە ڕازی بکات خۆیان بەدەستەوە بدەن و نەجەنگن، ئینجا سوپای موسڵمانان بە ڕێنمایی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە چەند بەرەیەکەوە چوونە نێو مەککەو تەنها لە بەرەکەی خالیدی کوڕی وەلیدەوە بەریەککەوتنێکی کەم ڕوویدا و دوو موسڵمان شەهید بوون[٤] و چەند کەسێکیش لە بێباوەڕان کوژران و زۆر بە خێرایی کۆتایی پێ هێنرا و بە کەمترین خوێن ڕژان مەککە فەتح کرا.[٥]

**پاش فەتحی مەککە ئەم هەنگاوانە گیرانەبەر:**

- پاککردنەوەی کەعبە لە بتەکان.[٦]
- پێشکەش کردنی وتارێك و پێدانی ڕێنمایی نوێ بە خەڵك.[٧]
- لێخۆشبوون لە خەڵکی مەککەو سەرجەم ئەوانەی دژایەتییان نواندبوو.[٨]

---

(١) سنن أبي داود، الرقم ٢٦٤٣، حسنه الألباني.

(٢) المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٧٠٩٤، صححه الحافظ ابن حجر في الإصابة، ج٢، ص ١١٢.

(٣) معرفة السنن والآثار للبيهقي، الرقم ٥٦٧٥.

(٤) صحيح البخاري، الرقم ٤٠٤٢.

(٥) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٤٠٧ – ٤١١.

(٦) صحيح البخاري، الرقم ٤٠٤٨.

(٧) مسند احمد بن حنبل، الرقم ٨٥٣٣، سنن أبي داود، الرقم ٤٤٧٣، سنن الترمذي، الرقم ٣٢٧٤، و قال حسن صحيح.

(٨) السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ١٦٩٩٤.

- لێخۆشبوون لەو کەسانەی بڕیاری رەسمی کوشتنیان درابوو و تا ئەو کاتە نەکوژرابوون، لەو دە کەسەی بڕیاری کوشتنیان درابوو تەنها چوار کەسیان کوژران و شەش کەسەکەی تر بەر لێبوردن کەوتن.

- بەیعەت وەرگرتن لە خەڵکی مەککە.[١]

تەزکیەی موسڵمانبوانی پاش فەتحی مەککە بۆ ئەوەی بە چاوی کەمەوە تەماشا نەکرێن:

﴿لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ ۚ أُولَٰئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ الَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا ۚ وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ ۚ (١٠)﴾[٢]

(وە ئێوە چیتانە.! کە ماڵ و سامان بەخت ناکەن لە ڕێی ئایینی خوادا؟! خۆ هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە هەر بۆ خوا دەمێنێتەوە بە میرات، چوونیەك نین ئەو کەسەتان کە پێش (فەتح) و (ئازادکردنی مەککە) ماڵ و دارایی خۆی بەخت کردووەو، لەگەڵ دوژمنانی خوادا جەنگاوە، ئا ئەوانە کە لە پێش فەتحی مەککەوە ماڵیان بەختکردووەو جەنگاون، پلەیان گەورە ترە لەوانە کە لە پاش فەتحی مەککەوە ماڵیان بەختکردووەو جەنگاون، هەریەکێ لەوانەش ماڵیان بەخت کردووەو جەنگاون، بە پێی پلەی خۆیان خوای میهرەبان بەڵێنی بەهەشتی داونەتێ).

- ڕێکخستنەوەی کارگێڕی و کاروبارەکان، بۆ نموونە عەتتابی کوڕی ئەسیدی ئومەویی کرد بە بەرپرسی مەککە.[٣]

- دڵنیاکردنەوەی پشتیوانان لە گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ مەدینە و نەمانەوەی لە مەککەدا.[٤]

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٤٠٦٥، صحيح مسلم، الرقم ٣٥٥٦.

(٢) الحديد: ١٠.

(٣) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٣، ص ٥٧٥.

(٤) صحيح مسلم، الرقم ٣٤١٨.

- پاراستن و دڵنیاکردنەوەی دەوروبەری مەککە لە نەمانی هەر مەترسیەك لە دەوروبەری، بۆ ئەمەش چەند سەریەیەکی نارد بۆ دەوروبەری مەککە، لەوانە:

* سەریەی سەعد بۆ لەناوبردنی بتی مەنات کە بە سەرکەوتوویی ئەرکەکە بەجێگەیەنرا.

* سەریەی خالیدی کوڕی وەلید بۆ لەناوبردنی بتی عوززا بە سەرکەوتوویی ئەرکەکە بەجێگەیەنرا.

* سەریەی عەمری کوڕی عاص بۆ لەناوبردنی بتی سواع بە سەرکەوتوویی ئەرکەکە بەجێگەیەنرا.

* سەریەی خالیدی کوڕی وەلید بۆ لای بەنی جەژیمە کە تیایدا خالید بە هەڵە کوشتارێکی زۆری کرد و پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) خوێن بایی سەرجەم کوژراوەکانی دا.[١]

پاش فەتحی مەککە خەڵکی ناوچەکانی تر دڵەڕاوکێی موسڵمانبوونیان نەما و بڕیاریاندا بچنە نێو بازنەی ئیسلامەوە، چونکە ئەوان پێشتر چاوەڕێ بوون بزانن پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ قەومەکەی خۆیدا بەچی دەگات، کاتێك لە فەتحی مەککەدا سەرکەوت، بڕیاریاندا موسڵمان ببن.[٢]

---

(١) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ١١١.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٤٠٦٢.

# باسی یەکەم

## غەزای حونەین و طائیف

غەزای حونەین لە مانگی شەووالی ساڵی هەشتەمی کۆچیدا روویدا،[١] نۆزدە رۆژ پاش فەتحی مەککە،[٢] هۆکاری ئەم غەزایە ئەوەبوو کە دوای فەتحی مەککە هەریەك لە ثەقیف و هەوەزانیەکان ترسان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) هێرش بکاتە سەریان و دەسەڵاتیان لەق بێت، بۆیە سوپایەکیان پێکهێنا بۆ هێرش کردنە سەر موسڵمانان و بەرێکەوتن هەتا گەیشتنە ناوچەی ئەوطاس[٣]، بەردەوام هێزی زیاتریشیان بۆ دەهات، پێغەمبەریش (صلی الله علیە وسلم) بە سوپا دە هەزاریەکەی فەتحی مەککەو دوو هەزار بەشداربووی تازە موسڵمانبوو و ناموسڵمانی ناو مەککەوە بەرەورووی سوپاکە بەرێکەوت،[٤] سەرەتا موسڵمانان کەوتنە بۆسەوەو جەنگێکی سەخت لەنێوان هەردوولادا روویدا و سەرەتا شکستێکی سەخت تووشی موسڵمانان بوو و دەوری پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) چۆڵ کرا و خەریك بوو بە یەکجارەکی موسڵمانان بشکێن،[٥] بەڵام دواتر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم) خۆی و ئەو

---

(١) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ١١٤.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٤٠٥٩.

(٣) شیوێکە دەکەوێتە نێوان شاری مەککە و شاری تائیفەوە.

(٤) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ١١٤.

(٥) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٤٧٣٦، صحيح ابن حبان، الرقم ٤٨٤٧، حسن إسناده شعيب

چەند هاوەڵەی دەوری مابوونەوە بەرەوڕووی دوژمن جەنگا،[١] فەرمانیشی کرد هاوەڵان بانگ بکرێنەوە بۆ جیهاد، بەم هۆیەوە سوپای موسڵمانان خۆیان کۆکردەوەو[٢] خوای گەورەش دڵنیایی پێ بەخشینەوەو پشتیوانیی فریشتەکانیشی پێ بەخشین و بەم هۆیەوە سەرکەوتنەکە کەوتەوە دەست موسڵمانان، ئینجا سوپای دوژمن هەڵهات و پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) سەریەیەکی نارد تا راوەدوویان بنێن.[٣]

قورئانی پیرۆزیش وردەکاری رووداوەکانی ئەم غەزایەی باسکردووە:

﴿ لَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِى مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍ ۙ وَيَوْمَ حُنَيْنٍ ۙ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْـًٔا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٢٦﴾ ﴾،[٤]

(بێگومان خوا لەگەڵێ جێگادا هاوکاریی کردن و یاریدان و سەریخستن، لەگەڵ کەم و کورتیی و ناتەواویتاندا بەتایبەتی لەڕۆژی (حونەین)دا، ئەو دەمەی کە بەزۆری خۆتان بایبوون و نازییتان کەچی ئەو حەشامەتە هیچ کەڵك و سوودی پێ نەگەیاندن و هەر تێکشکان زەویش بەو گوشادو فراوانییە لە ترساندا تەنگ بوو لێتان پاشانیش پاشە کشەتان کردو هەڵهاتن!دوایی ئارامیی و ئۆقرەی نارده سەردڵ و دەروونی پەیامبەرەکەیی و، بڕوادارەکان و لەشکرێکی زۆریشی نارد بۆ هاوکاریتان و، نەشتاندین و بێ باوەڕەکانیشی سزادا، هەر ئاوایە

---

الأرناؤوط.

(١) صحيح البخاري، الرقم ٢٧٩٣، صحيح مسلم، الرقم ٣٤١٢.

(٢) صحيح مسلم، الرقم ٣٤١١.

(٣) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٤٥٢ — ٤٥٥.

(٤) التوبة: ٢٥ - ٢٦.

سزای کافران و بێ باوەڕان).

لەم غەزایەدا چوار موسڵمان شەهید بوون،[١] حەفتا کەسیش لە هێزی دوژمن کوژران،[٢] موسڵمانان دەستکەوتێکی زۆریان بۆ مایەوە.

## غـەزای طـائیف:

لە مانگی شەووالی ساڵی هەشتەمی کۆچیدا غەزای طائیف روویدا، هۆکارەکەشی ئەوەبوو کە هەڵهاتووەکانی جەنگی حونەین روویانکردە طائیف و لەوێ لە قەڵاکانی طائیفدا سەنگەریان گرت، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) بڕیاری دا رووەو ئەوێ بچێت و نەهێڵێت هێزی دوژمن بکەوێتەوە سەرپێ، بۆیە رووەو طائیف چوو و نزیکەی بیست رۆژ گەمارۆی خستە سەریان، هێزی بەرامبەریش بەرگریەکی بەهێزیان کرد و بەهۆی بەرزی شوێنەکەیانەوە تیرباران و بەردبارانی موسڵمانانیان دەکرد،[٣] لە بەرامبەردا موسڵمانان بۆ بەرگری کردن (دەبابە[٤])[٥]و بۆ هێرش بردنیش مەنجەنیقیان بەکارهێنا،[٦] دواتر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لێبووردنی بۆ هێزی بەرامبەر راگەیاند ئەگەر هەر کەسێك موسڵمان بێت و دەست لە جەنگ هەڵگرێت، ئەوە پەنا دراوە، ژمارەیەك لە هێزی بەرامبەر هاتن بە دەم بانگەوازەکەوە، دواجار بێ ئەوەی قەڵاکە فەتح بکرێت، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بڕیاری پاشەکشەی

---

(١) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٤٥٩.

(٢) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٤٤٩.

(٣) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٤٨٢.

(٤) لە تەختە دروست دەکرا و زۆرجار رووپۆش دەکرا بۆ خۆپاراستن لە تیری دوژمن لە کاتی گەمارۆدانی ناوچە یان قەڵایەکدا.

(٥) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٤، ص ٣٩٩.

(٦) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٤٨٣.

دا،[١] بەڵام پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە جەعرانە دەربچێت، وەفدی ثەقیف هاتن و موسڵمانبوونی خۆیان راگەیاند.[٢]

ژمارەی شەهیدەکانی موسڵمانان لەم غەزایەدا دوانزە کەس بوون.[٣]

ئینجا لەوێدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەستکەوتەکانی حونەینی دابەشکرد بەسەر کۆچەران و تازەموسڵمانبواندا و بەشی پشتیوانانی نەدا، ئەم حاڵەتە گلەیی و گازندەیەکی لای پشتیوانان دروست کرد و سکاڵا برایە لای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ئەویش پشتیوانانی کۆکردەوەو وتارێکی پێشکەش کردن کە ئەم خاڵانەی لەخۆدەگرت:

**یەکەم:** خستنەڕووی منەتی ئیسلام بەسەر پشتیوانانەوە.

**دووەم:** خستنەڕووی منەتی پشتیوانان بەسەر پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم).

**سێیەم:** روونکردنەوەی شێوازی دەستکەوتەکان، تازەموسڵمانبوان سامانیان بەردەکەوێت و پشتیوانانیش پێغەمبەری خوایان بەردەکەوێت.

ئەم روونکردنەوەیە پشتیوانانی رازی کرد و بە گریانەوە پاشەکشەیان بە سکاڵاکەیان کرد.[٤]

ئینجا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هاودەم بە کۆچەران و پشتیوانان گەڕایەوە بەرەو مەدینە و لە بیست و سێی ذیلقەعیدەی ساڵی هەشتەمی کۆچیدا گەیشتەوە ناو مەدینە.[٥]

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٤٠٨٠، صحيح مسلم، الرقم ٣٤١٦.

(٢) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٤، ص ٤٠٤.

(٣) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٤، ص ٤٠٢.

(٤) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١١٥٠٧، حسنه شعيب الأرناؤوط.

(٥) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٥٠٠.

پاش گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ مەدینە و بەهۆی کاریگەری فەتحی مەککەوە، خەڵکێکی زۆر بڕیاری موسڵمانبوونیان دا و وەفد دوای وەفد روویان لە مەککە دەکرد، ژمارەی وەفدەکان لە شەست وەفد نزیك بوویەوە، ئەم حاڵەتەش لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێدراوە:

﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ﴿١﴾ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ﴿٢﴾ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ﴿٣﴾﴾

(هەرکە کۆمەکی خوا هات و، دەرگای سەرکەوتن و زاڵبوون کرایەوە و دیتت خەڵکی پۆل پۆل دێنە ناو دین و ئاییینی خواوە ئەوسا تۆیش زۆر بە دڵنیاییەوە پەروەردگاری خۆت بە پاك و بێخەوش راگرە داوای لێبوردنی لێبکە بەڕاستیی ئەو خوایە زۆر تەوبە وەرگرو چاوپۆشیکارە).

هەر وەفدێك کە دەهاتە مەدینە بەم چەشنە مامەڵەی لەگەڵ دەکرا:

**یەکەم:** پێشوازیەکی تایبەتییان دەکرا و لە شوێنی گونجاو دەحەسانەوە.

**دووەم:** ماوەیەك دەهێڵرانەوە هەتا حاڵەتی ژیانی موسڵمانان ببینن.

**سێیەم:** لە وادەو شوێنێکی تایبەتدا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە جلوبەرگی تایبەتیەوە هاودەم بە ژمارەیەك لە هاوەڵان لەگەڵیان دادەنیشت.

**چوارەم:** گفتگۆیەکی ورد دەکرا لەسەر مەرج و بنەماکانی موسڵمانبوون و شێوازی مامەڵەکردن.

**پێنجەم:** بە نووسراوێك پوختەی دانیشتنەکەو مەرج و ئەرك و مافی هەر وەفدێك و پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەستنیشان دەکرا و شایەتیش لەسەر نووسراوەکە دەگیرا.

**شەشەم:** بە چوونەوەی هەر وەفدێك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) یان کەسێکی شارەزای لەگەڵیاندا دەنارد، یان ساڵانە لە کاتی خۆیدا وەفد یان کەسی تایبەتی دەنارد بۆ بەدواداچوون بۆ خاڵەکانی نووسراوەکەو کۆکردنەوەی زەکات، لە چەند حاڵەتێکی تایبەتدا سزای ئەو کەسانە دەدرا کە بەڵێنیان دەشکاند.

## باسی دووەم

### غــەزای تەبــووك

لە ڕۆژی پێنج شەممە[١] مانگی ڕەجەبی ساڵی نۆیەمی کۆچی و لە گەرمەی سەرقاڵی موسڵمانان و چنینەوەی بەروبووم[٢] و لەوپەڕی کەشوهەوای گەرمدا لە نیوەی وەرزی پاییزدا غەزای تەبووك ڕوویدا،[٣] ئەمەش کۆتا غەزای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بوو.[٤]

هۆکاری غەزاکەش ئامادەکاریی ڕۆمەکان بوو بۆ هێرش بردنە سەر موسڵمانان، ئەم دەنگۆیەش لەنێو مەدینەدا بڵاوبووبوویەوە،[٥] بۆیە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) جیاواز لە غەزاکانی تر ئەمجار بە ئاشکرا ئامانج و ڕێڕەوی ئەم غەزایەی ئاشکرا کرد[٦] و هەموانی هاندا بەشداری تێدا بکەن و بڕیاری دا هیچ کەس دوانەکەوێت مەگەر بیانوویەکی ڕەوای بەدەستەوە بێت.[٧]

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٢٨١١.

(٢) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٥١٦.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ٢٨٠٩.

(٤) سنن الترمذي، الرقم ٣١١٠، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٦٤٤٠ و صححه و وافقه الذهبي.

(٥) صحيح البخاري، الرقم ٤٨٩٧، صحيح مسلم، الرقم ٢٧٨٥.

(٦) صحيح البخاري، الرقم ٢٨٠٩، صحيح مسلم، الرقم ٥٠٧٩.

(٧) صحيح البخاري، الرقم ٤١٦٥، صحيح مسلم، الرقم ٥٠٧٩.

خەڵکێکی زۆر پێداویستی جەنگییان نەبوو، بۆیە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) موسڵمانانی هاندا هەتا هەرکەسە و بەپێی توانا پێویستی جەنگی موسڵمانان دابین بکات، سەرەتای بەخشینەکەش لە نزیکەکانی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) دەستی پێکرد، ئەبووبەکر هەموو سامانی خۆی بەخشی و عومەریش نیوەی سامانی خۆی،(١) عوثمانی کوڕی عەففان(٢) و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفیش(٣) کە زۆر دەوڵەمەند بوون بەشداریەکی کەموێنەیان کرد، بەڵام هێشتا خەڵکێك مابوون پێداویستی جەنگییان نەبوو و کەسیش نەبوو بۆیان دابین بکات و دڵیشیان لای غەزاکە بوو،(٤) بەڵام هەرچی دووڕووەکان بوون بیانوویان دەدۆزیەوە بۆ ئەوەی نەچن بۆ غەزاکە و پێغەمبەری خوایش (صلی الله علیه وسلم) بیانووەکەی وەردەگرتن، قورئانی پیرۆزیش ئەم حاڵەتەی تۆمار کردووە:

﴿وَجَآءَ ٱلْمُعَذِّرُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ لِيُؤْذَنَ لَهُمْ وَقَعَدَ ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ۚ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٩٠﴾ لَّيْسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا۟ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩١﴾ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوا۟ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا۟ مَا يُنفِقُونَ ﴿٩٢﴾ ۞ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ وَهُمْ أَغْنِيَآءُ ۚ رَضُوا۟ بِأَن يَكُونُوا۟ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ وَطَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٩٣﴾ يَعْتَذِرُونَ إِلَيْكُمْ إِذَا رَجَعْتُمْ إِلَيْهِمْ ۚ قُل لَّا تَعْتَذِرُوا۟

---

(١) سنن الترمذي، الرقم ٣٦٩٥ وقال حسن صحيح، سنن أبي داود، الرقم ١٤٤٢.

(٢) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٠١٠٧ و حسنه شعيب الأرناؤوط، سنن الترمذي، الرقم ٣٧٢١ و قال حسن غريب.

(٣) الآحاد و المثاني لابن أبي عاصم، الرقم ٦٢٠.

(٤) دلائل النبوة للبيهقي، الرقم ١٩٧٠.

لَن نُّؤْمِنَ لَكُمْ قَدْ نَبَّأَنَا ٱللَّهُ مِنْ أَخْبَارِكُمْ ۚ وَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُۥ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٩٤﴾[1]

(وه عارەبە دەشتەکیە خاوەن ئیمان و، بیانوودارەکان هاتنە لات ئەی پێغەمبەر! هەتا مۆڵەت بدرێن و "نەچنە جیهاد" ئەو درۆزنانەشیان کە لەگەڵ خواو پەیامبەری ئەودا درۆیانکرد- لە ئیمان و باوەڕەکەیاندا-، لێیدانیشتن سەر ئەنجام سزایەکی قورس و ئێش پێگەیەنەر، هەر دووچاری بێ باوەڕەکانیان دەبێت، ئەوکەسانەی بونیەی لەش و جەستەیان لاوازو بێ هێزە، یان لەش بەبارو نەخۆشن وە ئەوانەی هیچیان دەست ناکەوێ بەختی بکەن بۆ خۆ ئامادەکردن بۆچوونە جیهاد، ئەمانە هیچ گوناهێکیان لەسەر نیە دانیشن و نەچنە خەزا بەمەرجێ راساڵ و صولحاوو دڵسۆزبن بە خواو بە پەیامبەرەکەیی خەڵکانی پۆزشدارو خێرخواز ئەگەر نەشچنە جیهاد، هیچ ڕێیەك نیە بۆ سزادانیان و خوا گوناهپۆش و لێبوردەیە، دلۆڤان و میهرەبانە، بەپێی دەسەڵات و توانا ئەرك دادەنێت وە لەسەر ئەوانەش جیهاد نیەو گوناهیان ناگات کە نەچنە خەزا: کاتێ هاتنەلات و داوایان کرد کە لەگەڵ خۆت بیانبەیت بۆ جیهادو، وڵاخی سوارییان بۆپەیدا بکەیت تۆیش گوتت: هیچ شتێك شك نابەم هەڵتانگرێ و سواری ببن ئیتر ئەوانیش بەوحاڵەوە لای تۆ گەڕانەوەو، چاویشیان- لەخەم وخەفەتا- بە لێشاو فرمێسکی دەڕشت کە شتێکیان نەبوو لەرێی خواو سەرخستنی دینی ئیسلامدا خەرجی بکەن، بەڵکو رێ گلەیی و گازندەو تۆڵە تەنها لەسەر ئەوانەیە کە داراو دەوڵەمەندن و، دێن داوای مۆڵەتت لێ دەکەن نەچنە جیهاد رازی بوون لەگەڵ بەجێماوەکان بن و، لەماڵەوە بنە بخەن و لەگەڵتان نەیەن !! ئەوساش لەبەر ئەوە خوای گەورە مۆری بەدبەختیی بەسەر دڵیاندا نا ئیتر لەپاشە ڕۆژی خراپی خۆیشیان نازانن هەر کە لە غەزای تەبووك گەڕانەوە بۆ لایان، بەپەلە دێن و دەست دەکەنە بڕوو بیانوو هێنانەوە بۆتان بڵێ: هیچ بڕووبیانوویەك مەهێننەوە چونکە چاك دەتانناسین و هەرگیز بڕواتان پێ ناکەین بەهەقیقەت خوای گەورە لە دەنگوباس و هەواڵە نهێنیەکانتانی ئاگادارکردین بۆئاییندەش بە تەئکید

---

(١) التوبة: ٩٠ - ٩٤.

خواو پەیامبەری خوا، گشت کردەوەکانتان دەبینن لە پاشان دەبرێنەوە لای ئەو زانایە کە بەهەموو نادیارو دیارێك ئەزانێ و ئاگادارە ئینجا هەرشتێکتان کردووە ئاگادارتان ئەکات لێی ).

پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی کرد بە بەرپرسی مەدینە[١] و بە زیاتر لە سی هەزار سەربازەوە کە بەشێك لە دووڕووەکانیشی تێدا بەشدار بوو رووەو تەبووك بەڕێکەوت،[٢] تەنها سێ هاوەڵی پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) بێ ئەوەی بیانوویەکی رەوایان هەبێت دواکەوتن، ئەو سیانەش دواتر سزادران تا ئەو کاتەی خوای گەورە لێیان خۆش بوو.[٣]

موسڵمانان لە رێگەدا تووشی برسێتیەکی سەخت بوون، حاڵیان گەیشتە ئەوەی بڕیاری سەربڕینی وشترەکانیان بدەن، هەتا خوای گەورە برسێتیەکەی نەهێشتن،[٤] موسڵمانان گەیشتنە ئەوێ و ماوەی بیست رۆژ لەوێ مانەوە[٥] بێ ئەوەی هیچ رووبەڕووبوونەوەیەك رووبدات، پاش ئەوە پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) لەگەڵ هەندێ دەسەڵاتی ناوچەیی ئەهلی کیتابدا رێککەوتنی بەست، چ لەگەڵ مەسیحیەکاندا[٦] و چ لەگەڵ جوولەکەکانیشدا.[٧]

ئینجا پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) خالیدی کوڕی وەلیدی نارد بۆ ئوکەیدری کوڕی عەبدولمەلیك، ئوکەیدیر بەدیلگیرا و هێنرا بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) و رێککەوتنێك لەنێوانیاندا بەسترا.[٨]

---

(١) ابن هشام: السیرة النبویة، ج٢، ص ٥١٩.

(٢) دلائل النبوة للبیهقي، الرقم ١٩٧٠.

(٣) صحیح البخاري، الرقم ٤١٦٥، صحیح مسلم، الرقم ٥٠٧٩.

(٤) صحیح مسلم، الرقم ٦٥.

(٥) مسند احمد بن حنبل، الرقم ١٣٨٥٤، صححه شعیب الأرناؤوط.

(٦) صحیح البخاري، الرقم ١٤٢٢.

(٧) دلائل النبوة للبیهقي، الرقم ١٩٩٥.

(٨) تأریخ الأمم و الملوك، ج٢، ص ١٨٥.

دوای ئەوەی هیچ جەنگ و بەرەنگاربوونەوەیەك روویندا، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بڕیاری گەڕانەوەی دا و لە نیوەی ڕێدا ژمارەیەك لە دووڕووەکان پیلانیان دانا بۆ کوشتنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، بەڵام پیلانەکەیان ئاشکرا بوو و سەری نەگرت.[1]

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پاش ئەوەی گەڕایەوە مەدینە، بۆ تەمبێ کردنی پیلانگێڕانی دووڕووان و کەمتەرخەمانی نێو موسڵمانان دوو هەنگاوی گرنگی نا:

**یەکەم:** رووخاندنی مزگەوتی ضیرار کە دووڕووەکان دروستیان کردبوو، قورئانیش ئاماژەی بەو مزگەوتە داوە:

﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًا بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِّمَنْ حَارَبَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ مِن قَبْلُ ۚ وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَا إِلَّا الْحُسْنَىٰ ۖ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿١٠٧﴾ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا ۚ لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا ۚ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾﴾،[2]

(وە لە دووڕووەکاندا کەسانێ وا هەن مزگەوتی زیراریان دروستکردووە بۆ بەهێزکردنی کوفرو بێ باوەڕیی خۆیان و، بۆ پەرتکردنی ریزەکانی کۆمەڵی باوەڕداران و دوورخستنەوەیان لە پێغەمبەر بۆ ئەوە بیکەنە (کەمین) و ڕوانگە بۆ ئەو کەسانە کەپێشتر بەر لە دروسکردنییدا دژی خواو پەیامبەرەکەی دەجەنگان، کەچی بەهەموو هێزێکیان سوێند دەخۆن کە: تەنها چاکەو خێرمان لەکردنەوەی ئەو مزگەوتەدا مەبەست بووە خۆ خوا بۆخۆی چاك بەئاگایەکە درۆزنن و دڵیشیان چی تێدایە هەرگیز تۆش - ئەی پێغەمبەر! - لە مزگەوتی وادا ڕامەوەستەو نوێژ مەکە دڵنیابە ئەو مزگەوتەیە کە هەر یەکەم ڕۆژ لەسەر بناغەی تەقوا دامەزرا بەهەقترە تۆ نوێژی تیا بکەیت هەتا مزگەوتی (زیرار)، لەم مزگەوتەدا

---

(١) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٣١٥٥، قال شعيب الأرناؤوط إسناده قوي على شرط مسلم.

(٢) التوبة: ١٠٧ - ١٠٨.

کۆمەڵە پیاوێکی تێدایە زۆر حەزیانە لەهەموو چڵك و چەپەڵیەك و، لەهەر تاوان و گوناهێك پاك ببنەوە دیارە خواش بۆخۆی پاکانی خۆش دەوێ،).

**دووەم:** سزادانی ئەو موسڵمانانەی بێ بیانوویەکی ڕەوا دواکەوتبوون، سزاکەشیان هەڵنەوەشایەوە تا ئەو کاتەی ئایەتی قورئانیان لەسەر دابەزی:

﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلۡعُسۡرَةِ مِنۢ بَعۡدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٖ مِّنۡهُمۡ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّهُۥ بِهِمۡ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ١١٧ وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ وَضَاقَتۡ عَلَيۡهِمۡ أَنفُسُهُمۡ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلۡجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيۡهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡ لِيَتُوبُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ١١٨﴾[١]،

(خوا لەو کارەی پەیامبەرەیش خۆش بوو کە مۆڵەتی دەستەیەك لەدوو ڕووەکانیدا کە: لە گەڵی نەچن بۆ جەنگی تەبووك وە لە کۆچکەران و پشتیوانانیش- کە هەندێکیان چوونە جیهادو، هەندێکیشیان خۆیان بە زەوییدا نووساند خۆشبوو ئەوانەیان کە لە جەنگە سەختەکەی (تەبووك)دا دوای پێغەمبەر کەوتن و پەیڕەوییان لێکردو چوونە تەبووك پاش ئەوە خەریکبوو هێندێکیان دڵیان لاڕێ بێت و نەچنە جیهادەکەوە! پاشان دووبارە خوا تەوبەی لێوەرگرتن چونکە بەڕاستیی خوا بەرامبەر بەوانە زۆر بەلوتفە، زۆریش لەگەڵیان بە میهرە، خوا تەوبەی لەو سێ کەسەش وەرگرت کەخۆیان لە غەزاکە گرتە دواوە تا لەخەفەتدا وای لێهات ئەم زەوییە فراوانەیان لاتەنگ بوو و لەخەم و خەفەتا لە گیانی خۆیان بێزار بوون ئیتر زانییان کە هیچ پەنایەکیان نەماوە، مەگەر هەر پەنا بەخوا بەرن لەپاشان خوا ڕێنمایی تەوبەی کردن، بۆئەوە تەوبە بکەن، ئیتر ئەوانیش تەوبەیان کردو خوا بەخشینی بەڕاستیی تەنها ئەو خوایە قەبووڵکاری تەوبەو، لێبوردە، زۆریش دلۆڤان و میهرەبانە).

---

(١) التوبة: ١١٧ – ١١٨.

**بە گشتی ئەگەر سەرنجێکی غەزا و سەریەکان بدەین تێبینی ئەم خاڵانە دەکەین:**

**یەکەم:** سەرجەم غەزا و سەریەکان بۆ پاراستنی شکۆی موسڵمانان و دەوڵەتەکەیان بووە.

**دووەم:** هیچ غەزا و سەریەیەك بێ ڕێنمایی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نەبووەو هەر هەڵەیەکیش تیایدا ڕوویدابێت ڕاستکراوەتەوە.

**سێیەم:** لە هەر غەزایەکدا موسڵمانان شکابن پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە بری سەرکۆنە و سزادان دڵنەوایی داونەتەوەو هەوڵی تیمارکردنی برینی شکستەکەی کردووە، نموونەش غەزای ئوحود و موئتە و حونەینە.

**چوارەم:** غەزاکان فلتەرێکی باش بوون بۆ جیاکردنەوەی موسڵمانان و دووڕووەکان، مەشقێکی تەواوەتی بوون بۆ بەهێزبوونی قۆناغ بەقۆناغی موسڵمانان، نموونەیەکی زیندوو بوون بۆ تێگەیشتن لەو بنەما شەرعیانەی لە ئیسلامدا هاتون.

**پێنجەم:** ئامانج لە غەزا و سەریەکان زۆریی کوشتار نەبووە، بەڵکو هەوڵ دراوە بە کەمترین کوشتار ئامانجی سەرخستنی ئیسلام بهێنرێتەدی، هەرکات ئامانجەکە بەدیهاتبێت دەستهەڵگیراوە لە کوشتن و خوێن ڕشتن.

**شەشەم:** غەزاکان لە جەنگی ناوچەییەوە گوازرانەوە بۆ جەنگی دەرەکی و بەرفراوان، سەرەتا تەنها جەنگەکە لەگەڵ قوڕەیش بوو، دواتر بەرەکانی جەنگ بەرفراوان بوون، کار گەیشتە ئەوەی چەند بەرەیەك بە یەکجار هاوپەیمانێتی جەنگییان دەبەست دژ بە موسڵمانان، دواقۆناغیش جەنگان بوو لەگەڵ ئیمپراتۆریەتێکی گەورەی ئەو سەردەمە کە ڕۆمەکان بوون.

پاش غەزای تەبووك چەند وەفدێك لە ناوچە جیاجیاکانەوە دەهاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و موسڵمانبوونی خۆیان ڕادەگەیاند، لەوانەش (وەفدی ثەقیف، وەفدی دارییەکان، وەفدی بەنی عامیر، وەفدی بەنی

حەنیفە، وەفدی بەنی نەجران) لە ساڵی نۆی کۆچیدا، ئینجا (وەفدی بەنی کیندە، وەفدی حەضرەمەوت، وەفدی مەذحیج، ) لە ساڵی دەی کۆچیدا).

هەروها پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کەسانێکی دەنارد بۆ سەرپەرشتی شوێنە جیاوازەکان یان بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام تیایاندا، لەوانەش:

عوثمانی کوڕی ئەبیلعاصی کرد بە ئەمیری ثەقیف.

موعاذی کوڕی جەبەل و ئەبوومووسای ئەشعەری نارد بۆ یەمەن.

ناردنی خالیدی کوڕی وەلید و دوای ئەوەش عەلی کوڕی ئەبووطالیب بۆ یەمەن.

# باسی سێیەم

## سەریەکان

سەریەکان ئەو سوپا سەربازی و بانگەوازیانە بوون کە بە بێ بەشداریی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و بە بڕیار و ڕێنمایی خودی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بە ئەرك و ئامانجێکی دیاریکراو دەنێردران بۆ ناوچەیەکی دیاریکراو، لە دیارترینی ئەو سەریانەش بریتی بوون لە:

| ناوی سریە | ڕێکەوتەکەی | ئامانجەکەی | ئەنجامەکەی |
| --- | --- | --- | --- |
| سەریەی حەمزەی کوڕی عەبدولموطەلیب | ڕەمەزانی ساڵی (١) | ڕێگرتن بە کاروانی بازرگانی قوڕەیش | نێوەندگیری لەنێوان هەردوولادا کرا |
| سەریەی عوبەیدەی کوڕی حارث | شەووالی ساڵی(١) | ڕێگرتن بە کاروانی بازرگانی قوڕەیش | جەنگ ڕوویینەدا |
| سەریەی سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص | زولقەعیدەی ساڵی(١) | ڕێگرتن بە کاروانی بازرگانی قوڕەیش | دەرچوونی پێشوەختەی کاروانەکە |

| ناوی سریە | ڕێکەوتەکەی | ئامانجەکەی | ئەنجامەکەی |
|---|---|---|---|
| سەریەی عەبدوڵای کوڕی جەحش | ڕەجەبی ساڵی (٢) | ئەرکی هەواڵگریی | سەرکەوتنی موسڵمانان بە دەستکەوتەوە |
| کوشتنی کەعبی کوڕی ئەشرەف | | کوشتنی کەعب | بەجێگەیاندنی ئەرکەکە |
| سەریەی زەیدی کوڕی حارثە | جومادیلئاخیرەی ساڵی (٣) | ڕێگرتن بە کاروانی بازرگانی قوڕەیش | ڕاکردنی کاروانچیەکان |
| سەریەی ئەبووسەلەمە | موحەڕەمی ساڵی(٤) | شکستهێنان بە پیلانی دوژمن | نەهێشتنی مەترسیەکە بە دەستکەوتەوە |
| سەریەی عەبدوڵای کوڕی ئونەیس | موحەڕەمی ساڵی (٤) | کوشتنی خالیدی کوڕی سوفیان | بەجێگەیاندنی ئەرکەکە |
| سەریەی ڕەجیع | صەفەری ساڵی (٤) | بڵاوکردنەوەی ئیسلام | کوژرانی ئەندامانی سەریەکە |
| سەریەی موحەممەدی کوڕی مەسلەمە | موحەڕەمی ساڵی(٦) | هێرش بردن بۆ سەر ناوچەی قورەطاء | شکاندنی دوژمن بە دەستکەوتەوە |
| سەریەی عوککاشە | ڕەبیعولئەووەلی ساڵی(٦) | هێرش بردن بۆ سەر ناوچەی غەمر | ڕاکردنی دوژمن و مانەوەی دەستکەوت |
| دوو سەریە بۆ ذیلقەصە | ڕەبیعولئاخیری ساڵی (٦) | هێرش بردن بۆ سەر ناوچەی ژیلقەصە | سەرەتا شکانی موسڵمانان و دواتر سەرکەوتنیان |

| ناوی سریە | ڕێکەوتەکەی | ئامانجەکەی | ئەنجامەکەی |
| --- | --- | --- | --- |
| سەریەی عەبدوڕەحمان بۆ دەومەتەلجەندەل | شەعبانی ساڵی(٦) | بانگهێشتی خەڵکی دەومەتەلجەندەل | موسڵمانبوونی زۆرینەی خەڵکەکەی |
| سەریەی فەدەك | شەعبانی ساڵی (٦) | هێرش بردن بۆ سەر ناوچەی فەدەك | سەرکەوتنی موسڵمانان بە دەستکەوتەوە |
| سەریەی عەبدوڵای کوڕی عەتیك | ڕەمەزانی ساڵی (٦) | کوشتنی ئیبن ئەبیلحوقەیق | بەجێگەیاندنی ئەرکەکە |
| سەریەی خەبەط | | ڕێگرتن بە کاروانی بازرگانی قوڕەیش | گەڕانەوە بە بێ زیان |
| سەریەی کورزی فەهری | شەووالی ساڵی (٦) | تۆڵەسەندنەوە لە دەستدرێژیکاران | بەجێگەیاندنی ئەرکەکە |
| سەریەی توربە | شەعبانی ساڵی (٧) | هێرش بردن بۆ سەر ناوچەی توربە | ڕاکردنی دوژمن |
| سەریەی ئەبووبەکری صدیق | شەعبانی ساڵی (٧) | هێرش بردن بۆ سەر بەنی فەزارە | سەرکەوتنی موسڵمانان |
| سەریەی بەشیری کوڕی سەعد | شەعبانی ساڵی (١) | هێرش بردنە سەر بەنی موڕە | شکستی موسڵمانان |
| سەریەی غالیب | ڕەمەزانی ساڵی(٧) | هێرش بردنە سەر ناوچەی مفیعە | سەرکەوتنی موسڵمانان بە دەستکەوتەوە |

| ناوی سریە | ڕێکەوتەکەی | ئامانجەکەی | ئەنجامەکەی |
|---|---|---|---|
| سەریەی بەشیر | شەووالی ساڵی (٧) | شکستهێنان بە پیلانی دوژمن | سەرکەوتنی موسڵمانان بە دەستکەوتەوە |
| سەریەی ئەخرەم | ذیلحیججەی ساڵی(٧) | بانگهێشتی بەنوسولەیم بۆ ئیسلام | ڕوودانی جەنگ و شەهیدبوونی زۆرینەی سەریەکە |
| سەریەکانی غالیب | صەفەری ساڵی(٨) | هێرش بۆ سەر بەنومولەوویح | سەرکەوتنی موسڵمانان بە دەستکەوتەوە |
| سەریەی شوجاع | ڕەبیعولئەووەلی ساڵی (٨) | هێرش بۆ سەر گرووپێکی هەوازین | سەرکەوتنی موسڵمانان بە دەستکەوتەوە |
| سەریەی کەعب | ڕەبیعولئەووەلی ساڵی(٨) | بانگهێشتی خەڵکی زاتوئەلواح بۆ ئیسلام | هێرش کرایە سەر سەریەکەو زۆرینەیان شەهید کران |
| سەریەی ذاتوسەلاسیل | جومادیلئاخیری ساڵی(٨) | شکستهێنان بە پیلانی قوضاعە | سەرکەوتنی موسڵمانان |
| سەریەی ئەبووقەتادە | شەعبانی ساڵی (٨) | شکستهێنان بە پیلانیغەطەفانیەکان | سەرکەوتنی موسڵمانان بە دەستکەوتەوە |

# باسی چوارەم

## حەجی ماڵئاوایی

لە ساڵی دەی کۆچیدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) یەکەم حەجی دوای هیجرەت و کۆتا حەجی ژیانی بەجێگەیاند و خەڵکێکی زۆریش لە مەدینە و دەرەوەی مەدینەش خۆیان ئامادە کرد و بەشدارییان تێدا کرد،[١] ئەم حەجەش بە حەجی ماڵئاوایی ناسراوە چونکە تیایدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ماڵئاوایی لە هاوەڵان کرد، بەڵام زوو بە حەجی ئیسلام ناسرابوو.[٢]

لە بیست و پێنجی مانگی ذیلقەعیدەی ساڵی دەیەمی کۆچی[٣] و لە وەرزی زستاندا پاش نوێژی نیوەڕۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەڕێکەوت،[٤] پیاوان و ئافرەتانیش لەگەڵیدا بەشداربوون.[٥]

لە حەجەکەدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) وتارێکی پێشکەش کرد کە چەند خاڵێکی گرنگی بۆ موسڵمانان خستەڕوو:

---

(١) صحيح مسلم، الرقم ٢٢١٢.

(٢) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ١٣٠.

(٣) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ١٣١.

(٤) صحيح البخاري، الرقم ١٤٨٥.

(٥) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٩٥٥٤، حسنه الأرناؤوط، صحيح ابن حبان، الرقم ٣٧٦٦.

**یەکەم:** هەواڵدان بە ئەگەری مردنی پێش حەجی ساڵی داهاتوو.[١]

**دووەم:** حەرامکردنی خوێن و سامانی موسڵمانان لە یەکدی.[٢]

**سێیەم:** هەڵوەشاندنەوەی یاسا و بڕیارەکانی سەردەمی نەفامی وەك خوێن بایی ئەو سەردەمەو سیستمی سووخۆریی.

**چوارەم:** دەستنیشانکردنی دیارترین ڕێڕەوە داراییەکان.

**پێنجەم:** دەستگرتن بە قورئانەوە.

**شەشەم:** وەرگرتنی ئەستۆپاکی خۆی لە سەرجەم موسڵمانان.[٣]

**حەوتەم:** دووپاتکردنەوەی نەبوونی هیچ فەزڵ و جیاکاریەکی عەرەب بەسەر عەجەم و سپی پێست بەسەر ڕەشپێستدا تەنها لەسەر بنەمای تەقوا نەبێت.[٤]

هاوەڵان لە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) وردەکاری حەجکردن فێر بوون و ئەوە بوو بە بناغەی وەگرتنی زانیاریەکان لەسەر شێوازی حەجکردن و هەتا ئەمڕۆش موسڵمانان لەسەری دەڕۆن.

پاشان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گەڕایەوە بۆ مەدینە و ئەوە کۆتا سەردانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بوو بۆ مەککە.

پاش ماوەیەکی کەم سەرەتای دەرکەوتنی درۆزنانێ بوو کە بانگەشەی پێغەمبەرایەتییان دەکرد، وەك موسەیلەمە و ئەسوەدی عەنەسی و گولەیحەی ئەسەدی، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەوڵیدا ئەمانە سەرکوت بکات و درۆکەیان کۆتایی پێ بهێنێت.

---

(١) السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٣٩٤٠.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ١٦٦٤.

(٣) صحيح مسلم، الرقم ٢٢١٢.

(٤) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٢٨٦٤، صححه شعيب الأرناؤوط.

کۆتا هەنگاوی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێش وەفاتی ئامادەکردنی سەریەیەك بوو بە سەرکردایەتی ئوسامەی کوڕی زەید بۆ هێرش بردنە سەر بەلقا، سوپاکە گەورە هاوەڵانی وەك عومەری کوڕی خەطابیشی تێدابوو،[١]

## بەڕێکردنی سوپای ئوسامە:

لە رۆژی دووشەممە بیست و شەشی مانگی صەفەری ساڵی یانزەی کۆچیدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئوسامەی راسپارد، رۆژی پێنج شەممە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەو نەخۆشیەوە کە لەسەری وەفاتی کرد خۆی چوو ئاڵاکەی دایە دەست ئوسامەی کوڕی زەید، لەنێو سوپاکەیدا ئەبووبەکری صدیق و عومەری کوڕی خەطاب و ئەبوو عوبەیدەی کوڕی جەراح و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و چەندین هاوەڵی تری گەورە هەبوون، لەسەر ئەوە کەسانێ نارەزاییان دەربڕی، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کە لەتاو ئازار سەری بەستبوو، چوویە سەر مینبەر و بۆ قەناعەت پێکردنی خەڵك وتارێکی فەرموو و پێی سەلماندن کە ئوسامەی گەنج شیاوی ئەو بەرپرسیارێتیەیە،[٢] ئوسامە زۆر دوورنەکەوتبوویەوە کە هەواڵی نەخۆشی پێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) بیست[٣] و دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و لە سەردەمی ئەبووبەکردا سوپاکە بەڕێکەوت و ئەرکەکەی خۆی بەجێگەیاند و بە سەرکەوتوویی گەڕایەوە.[٤]

---

(١) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج١، ص١٠٤.

(٢) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص١٩٠.

(٣) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٦، ص٣٠٥.

(٤) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص١٩٠-١٩١.

# باسی پێنجەم

## وەفاتی پێغەمبەری خوا
## (صلى الله عليه وسلم)

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێش ئەوەی وەفات بکات بە ئاماژە تێگەیشتبوو کە کاتی وەفاتیەتی، گرنگترین ئەو ئاماژانەش بریتی بوون لە:

**یەکەم:** دابەزینی سوورەتی نەصر وەك پێی بوترێت ئەرکت تەواو بوو.[١]

**دووەم:** دووجار موراجەعەکردنەوەی قورئان لەو رەمەزانەدا وەك خۆی فەرمووی ئەوە ئاماژەیە بە نزیکیی ئەجەلی.[٢]

**سێیەم:** ئاماژەدانی بە مەرگی خۆی لە وتاری حەجی ماڵئاواییدا.[٣]

لە کۆتاییەکانی مانگی صەفەردا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نەخۆشکەوت[٤] و ماوەی سیانزە رۆژ بەو نەخۆشیەوە مایەوە، نەخۆشیەکەی بە سەرئێشەیەکی سەخت دەستی پێکرد،[٥] مۆڵەتی لە خێزانەکانی تری وەرگرت

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٤٦٨٩.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٥٩٣٦.

(٣) السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٣٩٤٠.

(٤) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٢، ص ٦٤٢.

(٥) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٦٢٧٤، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٦٨٥٣، صحيح ابن

و لە ماڵی عائیشە مایەوە،[١] ماوەیەك خۆی بەرنوێژی بۆ موسڵمانان دەكرد، دواتر ئەبووبەكری راسپارد، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە رەسمی هیچ كەسێكی دەستنیشان نەكرد بۆ خیلافەتی پاش خۆی، بەڵام بە چەند ئاماژەیەك فەزڵ و پێشینەی ئەبووبەكری صدیقی خستەڕوو.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە ماوەی نەخۆشیەكەیدا چەند وەسیەت و راسپاردەیەكی هەبوو بۆ موسڵمانان كە ئەوانیش بریتی بوون لە:

## یەکەم: وەسیەتە تایبەتەکان:

- وەسیەتی كرد بۆ عوثمانی كوڕی عەففان كە ئەو جلەی دەكرێتەبەری داینەكەنێت[٢] -مەبەست پێی خیلافەت بوو- عوثمانیش وەسیەتەكەی بەجێگەیاند.

- چی دەرگا و خێمەیەكی خەڵك لە مزگەوتدا هەیە دابخرێت جگە لە هی ئەبووبەكر.[٣]

- ئەبووبەكر بەرنوێژی بۆ موسڵمانان بكات.[٤]

## دووەم وەسیەتە گشتیەکان:

- دەستگرتن بە نوێژەكانەوە.

---

حبان، الرقم ٦٦٩٠ بإسناد قوي.

(١) صحيح البخاري، الرقم ١٩٤، صحيح مسلم، الرقم ٦٦٠.

(٢) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٤٠١٢، صححه شعيب الأرناؤوط.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ٤٥٦.

(٤) سنن ابن ماجة، الرقم ١٢٣٠، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سن ابن ماجة، الرقم ١٢٣٤، صحيح ابن خزيمة، الرقم ١٥٢٧.

- چاکبوون لەگەڵ ئافرەتاندا.[(١)]

- گومانی باش بردن بە خوای گەورە و خۆدوورگرتن لە ڕەشبینی.[(٢)]

- چاکبوون لەگەڵ پشتیوانان و چاوپۆشیکردن لێیان.[(٣)]

- دەرکردنی موشریکەکان لە جەزیرەی عەرەبی.

- ڕێزگرتن و میوانداری و خەڵاتکردنی وەفدەکان.[(٤)]

- ڕێڕەوی جوولەکەو مەسیحیەکان نەگیرێتەبەر و گۆڕەکەی نەکرێتە پەرستگا.[(٥)]

دواجار پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە نیوەڕۆ وەختی[(٦)] ڕۆژی دوو شەممە دوانزەی مانگی ڕەبیعولئەووەلی ساڵی یانزەی کۆچی[(٧)] و لە تەمەنی شەست و سێ ساڵیدا وەفاتی کرد.

---

(١) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٥٩٠٩، صححه الأرناؤوط، سنن أبي داود، الرقم ٤٥١٠، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٤٣٣٦.

(٢) صحيح مسلم، الرقم ٥٢٣٣.

(٣) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٤٣٢، صحيح البخاري، الرقم ٣٤٤٩، ٣٦١٢، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١١٤٧١.

(٤) صحيح البخاري، الرقم ٢٩٠٨.

(٥) صحيح البخاري، الرقم ١٢٧٨.

(٦) ابن حجر: فتح الباري شرح صحيح البخاري، ج٨، ص ١٤٣ – ١٤٤.

(٧) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٢، ص ٢٠٩.

# باسی یەکەم

## پێغەمبەری خوا
(صلی الله علیه وسلم)

### شێوەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم):

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کەسێکی سپی رەنگ بوو،[١] سپێتیەکەی جۆرێك لە پرشنگ و رۆشنایی دەنواند،[٢] رۆح سووك بوو، باڵای مامناوەند بوو،[٣] مووی سەر و ریشی پڕ بوو، چاوەکانی گەورە بوون،[٤] دەتوت چاوی رشتووە،[٥] برۆکانی پڕ و درێژ بوون،[٦] چاوەکانی دەتوت سووریەکی تێدایە،[٧] دەمیشی گەورە بوو،[٨] ددانەکانی شاش بوون،[٩] گەردنێکی مامناوەندی

---

(١) صحيح مسلم، الرقم ٤٤١٨.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٣٣٧٥.

(٣) صحيح مسلم، الرقم ٤٤١٨.

(٤) صحيح مسلم، الرقم ٤٤١٦.

(٥) سنن الترمذي، الرقم ٣٦٦٥ و قال حسن غريب.

(٦) المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٨٢٦٠.

(٧) سنن الترمذي، الرقم ٣٦٦٦ و قال حسن صحيح، صحيح ابن حبان، الرقم ٦٣٧٩.

(٨) صحيح مسلم، الرقم ٤٤١٦.

(٩) المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٨٢٦٠.

هەبوو،[١] کەسێکی چوارشانە بوو و نێو شانی پان بوو،[٢] سك و سنگی ڕێکی یەك بوو، سەرسنگی پان بوو،[٣] مووی سەر سنگی درێژ بوو،[٤] جومگەکانی بەخۆ بوون،[٥] دەستەکانی زۆر نەرم[٦] و سارد بوون،[٧] ناولەپ و قاچەکانی گەورە و پان بوو،[٨] پەنجەکانی چڕ و لێك نزیك بوون،[٩] کاتێك هەنگاوی هەڵدەگرت سنگی بەرەو پێشەوە دەبرد[١٠] دەتوت لە بەرزیەکەوە بەرەو خوار هەنگاو هەڵدەنێ.[١١]

## جلوبەرگی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم):

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕێنمایی هاوەڵانی دەکرد ڕێکپۆش بن و جلوبەرگی پیس و ناشیرین نەپۆشن، بەڵکو فێری دەکردن شوێنەواری بەخششی خوا بەسەریانەوە دیار بێت،[١٢] هەروەها چەند هێڵێکی گشتی لە هەڵبژاردنی جلوبەرگ و شێوە و ئامانجی پۆشینیدا بۆ هاوەڵان دەخستەڕوو و خۆیشی پەیڕەوی دەکرد.

---

(١) دلائل النبوة للبيهقي، ا

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٣٣٧٩.

(٣) المعجم الكبير للطبراني،٦٠.

(٤) المستدرك على الصحيحين٤١٣٤ و صححه و وافقه الذهبي.

(٥) سنن الترمذي، الرقم ٣٦٦٥ و قال حسن غريب.

(٦) صحيح البخاري، الرقم ١٨٨٩.

(٧) صحيح البخاري، الرقم ٣٣٨١.

(٨) صحيح البخاري، الرقم ٥٥٧٥.

(٩) معرفة الصحابة لأبي نعيقم ٤٤١.

(١٠) المستدرك على الصحيحين٤١٣٤ و صححه و وافقه الذهبي.

(١١) سنن أبي داود، الرقم ٣.

(١٢) مسند احمد بن حنبل، الرقم ١٥٥٨١، صححه الألباني و شعيب الأرناؤوط.، سنن الترمذي، الرقم ١٩٧٨ و قال حسن صحيح.

بە شێوازێکی گشتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) جلوبەرگێکی تایبەت و جیاواز لە جلوبەرگی ناوچەکەی خۆی نەپۆشیوە، بەڵکو جلوبەرگێکی پۆشیوە کە لە ناوچەکەی خۆیدا باو بووە، ئامانجی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەوە نەبووە جلوبەرگێکی تایبەتی وا بپۆشێت لە خەڵك جیاواز بێت، بەڵکو هێندە جلوبەرگێکی ئاسایی پۆشیوە کە زۆرجار کەسی نەناسراو نەیناسیوەتەوە.[١]

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) حەزی نەدەکرد جلێ بپۆشێ پێی بناسرێتەوەو رێگریشی دەکرد لە هاوەڵان شتی لەو چەشنە بکەن.[٢]

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خەرجی زۆری لە جلوبەرگدا نەکردووەو وابەستەی یەك جۆر جلوبەرگیش نەبووە، (چنراوی لۆکە و خوری و کەتانی لەبەرکردووە، جلی دووراو و جلی نیمچەدووراویشی بەکارهێناوە کە زیاتر بەسەر شاندا دەدرا، مێزەر و جۆرە کڵاوێکی لەسەر دەکرد،، کراسی دەپۆشی، عەبای سەرشان و جبەی بەکارهێناوە، خوف و نەعلی لەپێ کردووە، جلی تایبەتی بواری سەربازیی هەبووە).

ئەگەر جلێکیشی پۆشیبێت کە تایبەت بە ناوچەکەی خۆی نەبووبێت، گرنگ ئەوەیە لە ناوچەکەی خۆیدا کەسانێکی تر پۆشیویانە و بە تایبەت بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەهێنراوە، بە نموونە پۆشینی چوخەڕانك (شاڵ) کە جلێکی کوردی بووەو لە مەدینە کەم بووە.[٣]

ئەگەر جلێکی تایبەتیشی لەبەرکردبێت جیاواز لە خەڵکی دی، زۆر لای خۆی نەیهێشتۆتەوەو بەخشیویەتی.[٤]

---

(١) سنن أبي داود، الرقم ٤٠٩٧، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم ٤٦٩٨، كما صححه شعيب الأرناؤوط.

(٢) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٥٤٨٦، حسنه الألباني و شعيب الأرناؤوط، سنن ابن ماجة، الرقم ٣٦٠٤، سنن أبي داود، الرقم ٣٥٢٩،.

(٣) سنن أبي داود، الرقم ٧٩٣، حسنه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم ٩١٥.

(٤) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص٥٠٤.

زۆرجار جلوبەرگەکەی پێویستی بە پینەکردن و چاك کردنەوە هەبووەو خۆیشی هەستاوە بە پینەکردنی جلەکانی.[١]

جاری وا هەبووە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هێندە جلوبەرگی کەم بووە کە هاوەڵان هەستیان بەوە کردووەو زانیویانە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) جلوبەرگی کەمەو پێویستی پێیەتی، بۆیە چەند جارێك وەك دیاری جلی بۆ براوە هەتا پێویستی جلوبەرگی پڕ بکرێتەوە.[٢]

هەندێ جار ناچار بووە جلوبەرگی هاوەڵان بە ئیستیعارە وەربگرێت، بۆ نموونە بۆ چوونە مزگەوت پێویستی بە جل بووەو پۆشاکێکی لە هاوەڵێك بە ئیستیعارە وەرگرتووە هەتا بەرنوێژی پێ بکات و دواتر بیباتەوە بۆ هاوەڵەکە.[٣]

هەندێ جار پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) جلوبەرگی تایبەتی خۆی بەخشیوە، جار هەبووە داوای لێکراوە و پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) داوای شتێکی لێ کرابێت نەخێری نەبووە وەك لە فەرموودەکەی سەهلی کوڕی سەعددا هاتووە،[٤] یان کەسێکی زۆر خۆشویستووەو حەزی کردووە خەڵاتی بکات وەك نموونەکەی ئوسامەی کوڕی زەید،[٥] جاریش هەبووە وەك نیشاندانی وەفایەك بۆ بەرامبەر، نموونەی ئەمەش بەخشینی جلەکەیەتی بۆ کفنکردنی سەرکردەی دووڕووەکان بەرامبەر هەڵوێستی عەبدوڵای کوڕی ئوبەی لە غەزای بەدردا کە جلەکەی خۆی بەخشی بە عەبباسی مامی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم).[٦]

---

(١) صحيح ابن حبان، الرقم ٥٧٥٤، قال شعيب الأرناؤوط إسناده صحيح.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٥٦٩٥، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٥٦٤٩.

(٣) الآحاد و المثاني لابن أبي عاصم، الرقم ٥٩٥.

(٤) صحيح البخاري، الرقم ٥٦٩٥، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٥٦٤٩

(٥) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص٥٠٤.

(٦) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٣، ص ١٦٦.

## ماڵەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم):

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە مەدینەدا بۆ هەریەك لە ژنەکانی تەنها ژوورێکی دانابوو، ئەو ژوورە رۆڵ و تایبەتمەندێتی ماڵ و خانوویەکی هەبوو، تیایاندا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و هاوسەرەکانی دەمانەوەو نانیان دەخوارد و دەخەوتن و میوانداری خەڵکیان دەکرد، نەوەك ئەوەی هەریەك لە خێزانەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) خانوویەکی گەورەی چەند ژووریی و بەرفراوانیان هەبووبێت.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سەرەتا خەمی دروستکردنی مزگەوتی هەبوو، بۆیە پێش ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە ماڵ و حاڵێ بۆ خۆی پێکەوە بنێت، هاودەم بە موسڵمانان بەشداری کرد لە بنیادنانی مزگەوتێکدا و خۆیشی ئیشی تێدا کرد و خشتی هەڵدەگرت، پاش تەواوبوونی مزگەوتی مەدینە، ئینجا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دوو خانووی دروستکرد بۆ دوو خێزانی، چونکە ئەوکات دوو خێزانی هەبوو (سەودە و عائیشە)، پێکهاتەی ئەو دوو ژوورەی بۆ ئەوانی دروستکرد لە خشت و گەڵای دارخورما بوو، ئینجا هەرکات خێزانێکی تری بەهاوسەر بگرتایە خانوویەکی بۆ دروست دەکرد، هەموو خانووەکانیشی نۆ خانوو بوون، خانووەکان لە دیوی دەرەوەی مزگەوتەوە بوون و لە هەرسێ لای باکوور و باشوور و رۆژهەڵاتەوە دەورەی مزگەوتەکەیان دابوو، بەڵام لە بەری رۆژئاواوە خانووی بۆ هیچ خێزانێکی دروست نەکرد، دەرگاکانی خانووەکانیش دەیانڕوانی بە رووی مزگەوتدا، چوار خانوویان لە خشت و گەڵای دارخورما دروست کرابوون، پێنجەکەی تریان لە قوڕ و گەڵای دارخورما دروست کرابوو، پەردەیەك بە سەر دەرگای خانووەکاندا دەدرا کە پانیەکەی یەك باڵ و درێژیەکەی سێ باڵ بوو.[١]

---

(١) الدرة الثمينة في أخبار المدينة لابن النجار، ص ٩٠.

سەقفی خانووەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەرز نەبوون، بەڵکو هێندە نزم بوون کە دەستیان پێ دەگەیشت.[١]

ئەو زەویەی کە خانووەکانی لەسەر بنیاد دەنرا، موڵکی هاوەڵێکی پشتیوانی بوو، هەرکات پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خێزانێکی بە هاوسەر دەگرت، ئەو هاوەڵە بەشێك لەو زەویەی خۆی دەدا بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆ ئەوەی خانوویەکی تێدا دروست بکات بۆ هاوسەرەکەی.[٢]

ماڵی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە پەنا مزگەوتەوە بوو، کاتێك ئیعتیکافی دەکرد، هەر لە مزگەوتەکەوە سەری دەبردە ئەودیو، عائیشەی هاوسەری لە ماڵەکەی خۆیەوە قژی بۆ دادەهێنا،[٣] هەروەها ئومموهیشامی کچی حارثەی کوڕی نوعمان دەڵێت: ماوەی ساڵ و شتێ یان دوو ساڵ تەنووری ئێمە و تەنووری ماڵی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) یەك تەنوور بوو، سوورەتی (ق و القرآن المجید) م لە زمانی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) وەرگرت، هەموو رۆژێکی هەینی کاتێ وتاری دەدا بۆ خەڵك، لەسەر مینبەر دەیخوێند.[٤]

خانووەکان بە موڵکیەت بۆ خێزانەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەمانەوەو دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەرەبەرە بۆ نوێژکردنی موسڵمانان بەکاردەهاتن و دواتریش خرانە سەر مزگەوتی مەدینە.[٥]

---

(١) شعب الإيمان للبيهقي، الرقم ١٠٢٩٣.

(٢) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٨، ص ١٦٦.

(٣) صحيح مسلم، الرقم ٤٧١، سنن أبي داود، الرقم ٢١٢٤، سنن الترمذي، الرقم ٧٦٧.

(٤) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٦٨٢٥، صحيح مسلم، الرقم ١٤٨٨.

(٥) ابن النجار: الدرة الثمينة في أخبار المدينة، ص ٩٠.

## کەلوپەلی ناوماڵی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم):

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەبەرئەوەی نۆ ماڵی هەبوو، لە هەر ماڵێکدا جۆرێ شمەکی هەبوو، واتە بەو چەشنە نەبووە لیستێك کەلوپەل و پێداویستی دەستنیشان کردبێت و بۆ هەر نۆ ماڵەکە بە سێت ئەو لیستەی کڕیبێت و دایانابێت، بەڵکو لە ماڵێکدا کەلوپەلێکی هەبووە کە لەوی تریاندا نەیبووە، هەندێ ماڵ کەلوپەلێکی زیاتر لەوی تریان هەبووە نەك لەبەرئەوەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ستەمی کردبێت و شمەکێکی بۆ ئەمیان کڕیبێت و ئەوانی تری پشتگوێ خستبێت، بەڵکو زۆرجار کەلوپەلەکە بە دیاری بۆ ئەو هاوسەرەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هاتووە، بۆیە کە لە شوێنێکدا لیستی ناوی کەلوپەلی ناوماڵی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) باس دەکرێت، دەبێت ڕەچاوی ئەوە بکرێت هەموو ئەو کەلوپەلانە لە هەموو ماڵەکانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) نەبون.

بە گشتی کەلوپەلی ناو نۆ ماڵی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەم شتانەدا خۆی دەبینیەوە:

**حەسیر:** لە چەند ماڵێکدا هەیبوو،[1] پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە ناچاریەوە خووی نەداوەتە حەسیر، بەڵکو حەزی نەکردووە کۆڵ بە دنیاوە هەڵگرێت، حەزی کردووە ژیانێکی هەژارانە بژی.[2]

**بەرماڵ:** پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەرماڵێکی هەبوو لە لە حەسیری جاران بچووکتر بوو و پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ نوێژ لەسەرکردن بەکاری دەهێنا.[3]

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٥٥٣٠، صحيح مسلم، الرقم ٢٧٨٢.

(٢) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٣٥٨٢، سنن الترمذي، الرقم ٢٣٥٦ و قال حسن صحيح، سنن ابن ماجة، الرقم ٤١٠٦.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ٣٧٥، صحيح مسلم، الرقم ٤٧٧.

**خەیمە:** پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خەیمەیەکی بچووکی لە پێستە خۆشکراوی هەبوو، دیارە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەمەی زیاتر بۆ سەفەر و غەزاکانی بەکاردەهێنا.[١]

**پەرداخ:** پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پەرداخێکی تەختەی هەبوو کە بە ئاسن توند کرابوو،[٢] هەروەها پەرداخیکی شووشەی هەبوو کە ئاوی تێدا دەخواردەوە.[٣]

**راخەری خوری:** هەروەها راخەرێکی هەبوو کە لە خوری ئاژەڵ دروستکرابوو، ئەم راخەرەی لە ماڵی حەفصە بوو.[٤]

**قیصعە:** پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) قیصعەیەکی هەبوو کە بە چوار کەسەوە هەڵدەگیرا، زیاتر لە کاتی قوربانی کردندا خوانی تێدەکرا و ئامادەبوان نانیان تێدا دەخوارد.[٥]

**تەشتی خۆشتن:** پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە ماڵی خێزانەکانیدا تەشتی خۆشتنی هەبوو کە پێی دەوترا میرکەن،[٦] زۆرجار لەگەڵ خێزانەکانیدا بۆ خۆشتن پێکەوە بەکاریان دەهێنا، ئەم حاڵەتە بۆ عائیشە[٧] و مەیموونەش[٨] باسکراوە.

---

(١) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٨٧٤١، قال الذهبي فيه انقطاع.

(٢) الشمائل المحمدية للترمذي، الرقم ١٩١.

(٣) سنن ابن ماجة، الرقم ٣٤٣٢، ضعفه الألباني.

(٤) الشمائل المحمدية للترمذي، الرقم ٣١٨.

(٥) سنن أبي داود، الرقم ٣٢٩٩، صححه الألباني.

(٦) صحيح البخاري، الرقم ٦٩٢٨.

(٧) صحيح مسلم، الرقم ٥١١.

(٨) سنن ابن ماجة، الرقم٣٧٥، صحيح ابن خزيمة، الرقم ٢٤١، صححه الألباني و شعيب الأرناؤوط.

**گۆچان:** پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گۆچانێکی هەبوو کە بۆ ڕۆژانی هەینی لە کاتی وتاردان بەکاری دەهێنا.[١]

**کلدان:** پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) شتێکی هەبوو کە کلی تێدا هەڵدەگیرا، شەوانە کلی دەکرد بۆ هەر چاوێکی سێ جار کلی بەکاردەهێنا.[٢]

**جامی قووڵ:** هەروەها جامێکی قووڵی تەختەی هەبوو کە بۆ هەندێ حاڵەتی ناساغی و ناچاری لە شەواندا لای خۆی دایدەنا هەتا میزی تێدا بکات.[٣]

**قاپ:** هەروەها پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە هەندێ لە ماڵەکانیدا ژمارەیەکی زۆر کەم قاپی هەبووە کە بۆ مەبەستی خواردن و خواردنەوەش بەکارهاتووە.[٤]

**قاپی چەرمین:** پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) قاپێکی لە چەرم دروستکراوی هەبوو کە بۆ ئاوخواردنەوە بەکاردەهات.[٥]

**پێوانە:** پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێوانەیەکی هەبوو[٦] کە بۆ جیاکردنەوەی ڕێژەی زەکات لە خواردن و شمەکدا و بۆ مەبەستی تریش بەکاری دەهێنا.

---

(١) سنن أبي داود، الرقم ٩٣٧، صحيح ابن خزيمة، الرقم ١٣٦٥، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٧٥٢٤.

(٢) سنن الترمذي، الرقم ١٧٢٤ و قال حديث حسن.

(٣) سنن أبي داود، الرقم ٢٢، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٣١، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٥٤٣ و صححه و وافقه الذهبي.

(٤) السنن الكبرى للنسائي، الرقم ١٠٩٧٢، المعجم الصغير للطبراني، الرقم ٢٢٦.

(٥) صحيح البخاري، الرقم ٦١٥٤.

(٦) سنن أبي داود، الرقم ٢٨٦٩، قال الألباني ضعيف الإسناد.

هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) شانەیەك[١] و جامێكی بەردین[٢] و شووشەیەكی رۆنی چەوركردن و بوغچەیەكی بچووكی هەبوو، جگە لەوەش شمشێر و درعێكی سەربازیی هەبوو بۆ غەزاكانی كە لە كاتی وەفاتیدا بە رەهن دایە لای جوولەكەیەك.

## خۆراکی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیە وسلم):

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە ساڵی چوارەمی كۆچیەوە ساڵانە قووتی یەك ساڵی خاوخێزانیشی دادەنا،[٣] قووتی ژیانیشیان خۆراكی زۆر و هەمەچەشنە نەبووە، بەڵكو هێندە بووە بەشی راستبوونەوەی پشتیان بكات.

بە گشتی چەند خاڵێكی بنەڕەتی لە بەرنامەی خۆراكی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بەدیدەكەین:

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە پێی پێویستی شتی خواردووەو ئەوەی زیادە و ناپێویست بووە نەیخواردووە، هەروەها شتێكی خواردووە كە بۆ لەش پێویست بووە، نەوەك مەسەلەكە تەنها حەز و چێژ بێت.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەوڵیداوە زێدەڕۆیی لە خواردندا نەكرێت و زیادەی هیچ خواردنێك نەڕژێت.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) شتێكی خواردووە كە لە هەنگاوی یەكەمەوە بۆ خۆپاراستن بووە نەوەك بۆ چارەسەر.

---

(١) السنن الكبرى للبيهقي، الرقم ٩٣.

(٢) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٤٠٠٢، صححه شعيب الأرناؤوط.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ٥٠٤٧.

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) خواردنێکی خواردووە کە حەزی لێی بووە، هەر خواردنێکی حەڵاڵیش حەزی لێی نەبووبێت بێ ئەوەی هیچ تانەیەکی لێ بدات کشاوەتەوە دواوەو لێی نەخواردووە.[١]

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) گرنگی بە هەندێ خواردن داوە کە ئاسان بەردەست دەکەون و زۆرترین سوود و زیاترین وزە دەبەخشن بە لەش.

هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) زیاتر گرنگی داوە بە خواردنە تەڕەکان، کەمتر گرنگی داوە بە خواردنی وشك.

ئەو خواردنانەی کە خواردوویەتی لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا لەلایەن پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) نەخوراون، بەڵکو لەوانەیە خواردن هەبووبێت هەفتەی جارێك دووبارە نەبووبێتەوە، خواردن هەبووبێت بە مانگێك جارێ نەیخواردبێت.

خواردنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هاوسەنگ بووە، خووی نەداوەتە یەك جۆر خواردن و خۆی لە هەندێ خواردنی تر بێبەش بکات.

گرنگترین ئەو خواردنانەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) خواردوویەتی بریتین لە: (خورما کە زۆرترین ژەمی خواردن بوو،[٢] شیر،[٣] زەیتی زەیتوون، حەڵوا، هەنگوین،[٤] سرکە،[٥] نانی جۆ،[٦] گۆشتی سوور،[٧]

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٣٣٩١، صحيح مسلم، الرقم ٣٩٣٧.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٦٤٥٥.

(٣) صحيح مسلم، الرقم ٣٩٢٤.

(٤) صحيح البخاري، الرقم ٥١٢٠، صحيح مسلم، الرقم ٢٧٧٣.

(٥) سنن الترمذي، الرقم ١٨١١ و قال حسن غريب من هذا الوجه.

(٦) رواه البخاري وابن ماجة و غيرهما.

(٧) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٢٠٠١، صحيح مسلم، الرم ٣٨٩١.

گۆشتی مریشك،[١] گۆشتی ماسی،[٢] شلەی کوولەکە،[٣] شووتی،[٤] خەربزە،[٥] ترۆزی،[٦] شەربەتی مێوژ[٧]).[٨]

## داهاتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم):

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە مەدینەدا داهاتێکی ئەوتۆی نەبوو، بەڵکو هەتا چوار ساڵی سەرەتا هەرجارەو موسڵمانێ یان زیاتر بەرهەمی چەند دارخورمایەکی خۆیان بە دیاری پێ دەبەخشی، دواتر پاش غەزای بەنونەضیر[٩] پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە دەستکەوتەکانی ئەو غەزایە خەرجی ساڵێکی خێزانەکانی لێ جیادەکردەوە[١٠]و قەرزەکانی ئەو ساڵانەی پێشووی لێ دەدایەوە.[١١]

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٤١٣٣، صحيح مسلم، الرقم ٣١٩٦.

(٢) سنن أبي داود، الرقم ٣٣٦١، صححه الألباني في صحيح و ضعيف سنن أبي داود، الرقم ٣٨٤٠.

(٣) رواه أحمد و حسنه شعيب الأرناؤوط.

(٤) سنن أبي داود، الرقم ٣٣٥٧، قال شعيب الأرناؤوط إسناده جيد

(٥) مسند الطيالسي، الرقم ١٨٦٠.

(٦) صحيح مسلم، الرقم ٣٨٩٩، سنن أبي داود، الرقم ٣٣٥٦.

(٧) سنن أبي داود، الرقم ٣٢٤١، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٥١٠٠، قال الألباني حسن صحيح، صححه شعيب الأرناؤوط.

(٨) خوێنەری ئازیز، بۆ شارەزایی زیاتر لەم بارەیەوە، دەتوانیت بگەڕێیتەوە سەر کتێبی (بەرنامەی خۆراکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)) لە نووسینی: دکتۆر عەبدولواحید موحەممەد صالح.

(٩) صحيح البخاري، الرقم ٢٩٧٧، صحيح مسلم، الرقم ٣٤٠٦.

(١٠) صحيح البخاري، الرقم ٢٧٦٩.

(١١) صحيح البخاري، الرقم ٢٩٧٧، صحيح مسلم، الرقم ٣٤٠٦.

هەروەها لە دەستکەوتەکانی خەیبەر[١] و فەدەکیشدا بە هەمان شێوە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پشکی تایبەتی هەبوو، لەو پشکەی خۆی جگە لە خەرجی ساڵێکی خێزانەکانی، بۆ خەرجی پێشوازی وەفدەکان و خەڵاتکردنیان، خەرجیە پێویستەکانی دیکە، یارمەتی و دەستگرۆیی لێقەوماوان بەکاری دەهێنا.[٢]

لەو بەشەی خۆی و خێزانەکانیشی هێندە کەمی بۆ خۆیان بەکاردەهێنا، ئەوپەڕی برسێتی و هەژاری بە خۆی و خێزانەکانیەوە دیاربوو، جارێك فاطیمەی کچی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بڕێ هەویری شێلا و نانی کرد، پارچەیەك لە نانەکەی برد بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی ئەمە چیە؟ ئەویش وتی: ئەم نانەم کرد دڵم ئۆقرەی نەگرت هەتا ئەم پارچەیم لێ هێنا بۆ تۆ، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی (هَذَا أَوَّلُ طَعَامٍ أَكَلَهُ أَبُوكِ مِنْ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ)[٣] (ماوەی سێ رۆژە ئەمە یەکەم خواردنە باوکت ئەیخوات).

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت لەو کاتەوەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) چوویە مەدینە تا ئەو کاتەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وەفاتی کرد، خاوخێزانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەرگیز سێ شەو بەسەر یەکەوە تێر نان نەبوون،[٤] هەروەها دەیفەرموو: ئێمە -خێزانەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)- جار هەبوو سێ هیلالمان لە دوو مانگدا دەژمارد، کەچی لە ماڵەکانی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) ئاگر نەدەکرایەوە، تەنها ئاو و خورمامان دەخوارد، بەڵام دراوسێیەکی ئەنصاریمان هەبوو کە هەندێ جار

(١) سنن أبي داود، الرقم ٢٦٣٢، قال الألباني حسن صحيح.

(٢) سنن ابن ماجة، الرقم ٢٦٣٣، صححه الألباني.

(٣) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٢٩٦٩، حسنه شعيب الأرناؤوط، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ٧٤٩.

(٤) صحيح البخاري، الرقم ٥٠٦٤.

شیریان دەهێنا بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و ئەویش دەرخواردی ئێمەی دەدا.[١]

پێش وەفاتیشی سەرمایە و داهاتێکی دوای خۆی بەجێنەهێشت و میراتیشی لە خاوخێزان و منداڵەکانی قەدەغەکرد، عەمری ژنبرای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەڵێت: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە کاتی وەفاتیدا هیچ دینار و درهەم و کۆیلە و کەنیزەك و هیچ شتێکی جێنەهێشت، تەنها شتێ لێی جێما هێسترە سپیەکەی بوو لەگەڵ چەکەکەی و پارچەیەك زەوی کە کردی بە خێر و صەدەقە.[٢]

## پەرستشی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم):

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گرنگیەکی زۆری دەدا بە پەرستش و ئەو پەرستشەی فەرمانی دەکرد بە موسڵمانان بەجێی بگەیەن، خۆی زۆر بە زیاتر بەجێی دەگەیاند، هەموو نوێژە فەڕزەکان بەرنوێژی بۆ موسڵمانان دەکرد، سوننەتەکانی پێش نوێژ و هەندێ سوننەتی پاش نوێژیشی هەبوو، شەونوێژێکی زۆری هەبوو تا ئاستێ ئازار بە قاچەکانی دەگەیشت،[٣] نوێژی چێشتەنگا و نوێژی خۆرگیران[٤] و مانگ گیران و نوێژی تەراویح[٥] و نوێژەکانی جەژنەکانی بەجێدەگەیاند،[٦] کاتێك بەرنوێژی بۆ موسڵمانان دەکرد

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٢٤٤٨، صحيح مسلم، الرقم ٥٣٩٣.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٢٦٠٧.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ١٠٩١، صحيح مسلم، الرقم ٥١٥١.

(٤) صحيح البخاري، الرقم ١٠١٠، صحيح مسلم، الرقم ١٥٤٧.

(٥) صحيح البخاري، الرقم ١٠٩٠، صحيح مسلم، الرقم ١٣١٠.

(٦) صحيح البخاري، الرقم ٩٢٧.

ڕەچاوی حاڵی هەموانی دەکرد،[١] بەڵام لە نوێژە تایبەتیەکاندا زۆر دەمایەوەو قورئانی زۆری دەخوێند،[٢] هاوەڵانیشی وافێرکردبوو،[٣] ئەگەر بە گشتی ڕۆژووگرتنی ساڵێکی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەژمار بکەین نزیك دەبێتەوە لە نیوەی ساڵەکە، لە بەخشینیشدا نموونەی نەبوو بەتایبەت لە مانگی ڕەمەزاندا،[٤] لە مانگی ڕەمەزاندا خەتمێکی قورئانی دەکرد و لە کۆتا ساڵیشیدا دوو خەتمی کرد،[٥] هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان لە مزگەوت ئیعتیکافی دەکرد و لە ساڵی کۆتایی ژیانیدا بیست شەوی کۆتایی ئیعتیکافی کرد، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە قۆناغی مەدینەدا یەك جار فەڕزی حەجی بەجێگەیاند،[٦] هەروەها دوو جار عومرەی بەجێگەیاند، پاش حودەیبیە و ئەو ساڵەش کە حەجی کرد، لە جەژنی قورباندا قوربانی دەکرد.[٧]

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٩٠.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ١٠٩٦.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ٦٨٢.

(٤) صحيح البخاري، الرقم ١٨١٤.

(٥) صحيح البخاري، الرقم ٥٩٣٦.

(٦) صحيح مسلم، الرقم ٢٢١٢.

(٧) صحيح البخاري، الرقم ٩٣٦، صحيح مسلم، الرقم ٣٧١٩.

## پەیوەندیەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم):

**لەگەڵ موسڵماناندا:** پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ موسڵماناندا پەیوەندیەکی بەتینی هەبوو، سەردانیماڵی هاوەڵانی دەکرد[١] و دەستگرۆیی هەژارانی دەکرد،[٢] میوانداری هاوەڵانی دەکرد[٣] و بەدەم کێشە و نەخۆشیەکانیانەوە دەچوو، لە مەجلیسی سوعبەتیاندا بەشداری دەکرد،[٤] هەڵەکانی بۆ راست دەکردنەوەو لە هەنگاوی راستشیدا پشتیوانی دەکردن،[٥] تەنها لەسەر بنەمای تەقوا جیاوازی دەکرد.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پەیوەندی لەگەڵ هاوەڵە ناعەرەبەکانیشدا هەبوو، بۆ نموونە:

**لەگەڵ فارسەکاندا:** دراوسێیەکی فارسی هەبوو و بە خاوخێزانیشەوە سەردانی ماڵی دەکرد،[٦] هەروەها خۆشەویستیەکی تایبەتی هەبوو بۆ سەلمانی فارسی و راوێژی پێ دەکرد.

**لەگەڵ کورددا:** جابانی کوردی زیاتر لە چەند جارێك چووەتە خزمەتی و فەرموودەی لێوە گێڕاوەتەوە.[٧]

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٤٢٩٩.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ١٨١٤.

(٣) صحيح مسلم، الرقم ٣٩٢٤.

(٤) صحيح مسلم، الرقم ١١٠٩.

(٥) صحيح ابن حبان، الرقم ٧٢٠٠، المعجم الصغير للطبراني، الرقم ٥٨١، صححه شعيب الأرناؤوط.

(٦) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٢٠٠١، صحيح مسلم، الرم ٣٨٩١،

(٧) المعجم الأوسط للطبراني، الرقم ١٨٧٥، صححه الألباني في صحيح الترغيب و الترهيب، الرقم ١٩٢١.

**لەگەڵ حەبەشیەکاندا:** پەیوەندیەکی زۆر بەتینی لەگەڵ بیلالی حەبەشیدا هەبوو،[١] جگە لە بیلال چەندین کەسی تری حەبەشی لە مەدینەدا دەژیان و جیاوازی چینایەتییان بەسەردا نەدەسەپێنرا، بەڵکو لە مزگەوتی پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) یارییان دەکرد و پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) هاودەم بە عائیشەی خێزانی تەماشای دەکردن،[٢] هەروەها پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پەیوەندی پتەوی لەگەڵ نەجاشیدا هەبوو، پەیوەندیەکەش خۆی لەم خاڵانەدا دەبینینەوە:

شایەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ دادپەروەریی نەجاشی.

داڵدەدانی موسڵمانان لەلایەن نەجاشیەوە.

موسڵمانبوونی نەجاشی.

پەیوەندی بەردەوامی پەیام و نامەگۆڕینەوە لەنێوان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و نەجاشیدا.

نزای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ نەجاشی و نوێژی غیاب لەسەر تەرمەکەی.

**لەگەڵ بەنوئیسرائیلدا:** ڕێزی زۆری ئەو جوولەکانەی دەگرت کە موسڵمان بون و سوودی لە توانا و بەهرەکانیان وەردەگرت، بەتایبەت بۆ بانگەوازکردنی هاوئایینەکانی پێشوویان.[٣]

هەرچی پەیوەندی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ جوولەکەکاندا لەسەر بنەمای ڕێککەوتن خۆی دەبینیەوە، بەڵام عادەتی جوولەکەکان لە

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ١١١١، صحيح مسلم، الرقم ٤٦٠١

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٤٤٥، صحيح مسلم، الرقم ١٥٢٩.

(٣) مسند احمد بن حنبل، الرقم ١٠٥٤٧، صحيح البخاري، الرقم ٣١٦٦، السنن الكبرى لنسائي، الرقم ٧٩٨١.

کۆنیشەوە ئەوەبوو دژەپێغەمبەر بوون و هەوڵی کوشتنی پێغەمبەرانیان دەدا، هەمان ئەزموونیشیان بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) گرتەبەر، بۆیە پەیوەندی رێز و یەکترخوێندنەوە زۆری نەخایاند و رق بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە مەیدانی شەخصیەوە برایە مەیدانی سیاسی و سەربازی و ئابووری و کۆمەڵایەتیش، بۆیە لەگەڵ هەر قۆناغێکی ناپاکی دەستەیەك لە جوولەکەکان، لەسەر شکاندنی بەندەکانی رێککەوتنەکە سزا دەدران و جەنگیان بەرامبەر رادەگەیەنرا.

**لەگەڵ مونافیقەکاندا:** هەروەها پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ مونافیقەکانیشدا پەیوەندی هەبوو، هەرچەندە زۆر لێیان نارازی بوو، بەڵام لە سەرەتا هاتنی بۆ مەدینە تا کاتی وەفاتی بە رەسمی مونافیق بوونی یەك کەسیانی رانەگەیاند، بەڵکو لە پرسە هەستیارەکاندا بەشداری و راوێژیشی پێ دەکردن،[١] لە مافە شەخصیەکاندا بەرگەی تانە و تەشەری مونافیقانی دەگرت،[٢] نەیدەهێشت بارەکە بگاتە ئەوەی راستەوخۆ بچنە نێو بەرەی دوژمنەوە.

**لەگەڵ ئافرەتاندا:** هەروەها پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ ئافرەتانیشدا پەیوەندی نەدەپچڕاند و وانەی تایبەتی بۆ دانابوون،[٣] گوێی لە کێشەکانیان دەگرت و هەوڵی چارەسەرکردنی بۆ دەدان،[٤] دروستترین رێی ژیانی فێردەکردن،[٥] دەرفەتی بەشداریکردن لە غەزاکانی پێ دەدان،[٦] لە زۆر

---

(١) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٢٩.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٤٢٩٩.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ١٠١.

(٤) المجادلة: ١.

(٥) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٥٩٩، صحيح ابن حبان، الرقم ٤٢٢٤، صححه شعيب الأرناؤوط.

(٦) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٦، ص١٤٠.

پرسی هەستیاردا راوبۆچوونی وەردەگرتن،[١] لە کۆتا وەسیەتیشی بۆ موسڵمانان ئاماژەی بەوەدا وریای ئافرەتان بن و مافەکانیان بپارێزن و لەگەڵیان چاك بن.[٢]

**لەگەڵ منداڵاندا:** پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خۆشەویستیەکی تایبەتی بۆ منداڵان هەبوو و تەزکیەی پاکیی منداڵانی دەکرد، قسەی خۆش[٣] و لەباوەش گرتن و نازپێدانی هەبوو بۆیان،[٤] ئامۆژگاری گەورەکانی دەکرد سۆز و میهرەبانییان هەبێت بۆ منداڵان، بەدەم خەمی منداڵانەوە بوو، بۆ لەدەستدانی باڵندەی منداڵێك دڵنەوایی منداڵەکەی دەکرد.[٥]

## ژیانی شەوانەڕۆژی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم):

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە حاڵەتی ئاساییدا کە لە مەدینە دەمایەوە، بەیانی زوو دەچوو بۆ مزگەوت و بەرنوێژی بۆ موسڵمانان دەکرد، پاشان لەگەڵ هاوەڵان دەمایەوەو خەوپەرژێنی بۆ دەکردن،[٦] ئینجا گوێی لە قسە و سوعبەتی هاوەڵان دەگرت،[٧] پاشان هەر لەوێ دەمایەوە هەتا خۆر هەڵدەهات،[٨] ئینجا نوێژی چێشتەنگای دەکرد،[٩] ئەو کاتانەی بەڕۆژوو نەبوو بۆ ژەمەکانی نانخواردن دەرۆیشتەوە ماڵەوە، لە ماوەی نوێژی چێشتەنگاوە هەتا

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٢٦٠١.

(٢) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٥٩٠٩، صححه الأرناؤوط، سنن أبي داود، الرقم ٤٥١٠،.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ٥٧٨٣، صحيح مسلم، الرقم ٤٠٩٧.

(٤) صحيح البخاري، الرقم ٥٥٥٢، صحيح مسلم، الرقم ٤٥٥٠.

(٥) صحيح البخاري، الرقم ٥٧٨٣، صحيح مسلم، الرقم ٤٠٩٧.

(٦) صحيح البخاري، الرقم ٦٦٥٨.

(٧) صحيح مسلم، الرقم ١١٠٩.

(٨) صحيح مسلم، الرقم ١١١٠.

(٩) صحيح مسلم، الرقم ١٢١٠.

پێش نوێژی نیوەڕۆ هەرجارەو ئەرکێکی رادەپەڕاند، چ بە سەردانی موسڵمانان، یان راپەڕاندنی کارەکانیان، پێش نیوەڕۆ بە قەیلوولە سەرخەوێکی دەشکاند، جاری واهەبوو لە ماڵی خۆیدا و جاری واش هەبوو لە ماڵی هاوەڵێکدا،[١] ژەمی نیوەڕوان هەندێ جار بانگهێشت دەکرا و لەگەڵ خێزانێکیدا یان لەگەڵ هاوەڵێکیدا دەچوو بۆ بانگهێشتەکە،[٢] دوای نیوەڕۆش تا عەسر و پاش نوێژی عەسریش تا ئێوارە هەرجارەو بە ئەرکێکەوە سەرقاڵ دەبوو، پاش نوێژی ئێوارەش ژەمی نانخواردن دەڕۆیشتەوە ماڵەوە، دوای نوێژی عیشاش زۆر نەدەمایەوەو هاوەڵانیشی وافێرکردبوو مەجلیس ساز نەدەن،[٣] دەخەوت و دواتر هەڵدەستا بۆ شەونوێژ،[٤] ئەگەر بەڕۆژوو بوایە پارشێوی دەکرد.[٥]

ئەو کاتانەی دەچوویەوە ماڵەوە هاوکاری خێزانەکانی دەکرد تا کاتی بانگ دەهات، ئەوکات دەچوو بۆ نوێژەکەی.[٦]

بەڵام لە کاتی غەزاکاندا بارودۆخەکە جیاواز بوو، هەرجارەو خێزانێکی لەگەڵ خۆیدا دەبرد،[٧] خۆی لە هاوەڵان جیانەدەکردەوەو وەك ئەوان ئەرکەکانی بەجێدەگەیاند،[٨] جار هەبوو بە پیادە دەڕۆیشت،[٩] لە غەزاکاندا بەشداری دەکرد.[١٠]

---

(١) سنن أبي داود، الرقم ٢١٤٤، صححه الألباني.

(٢) صحيح مسلم، الرم ٣٨٩١، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٢٠٠١.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ٥٣٢.

(٤) صحيح البخاري، الرقم ١٠٩١، صحيح مسلم، الرقم ٥١٥١.

(٥) صحيح البخاري، الرقم ٥٥٩.

(٦) صحيح البخاري، الرقم ٦٥٥.

(٧) صحيح البخاري، الرقم ٢٥٣٩، صحيح ابن حبان، الرقم ٧٢٠٨.

(٨) صحيح البخاري، الرقم ٢٧٠٢.

(٩) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٢٣٩٠ و صححه و وافقه الذهبي.

(١٠) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٣١٩٧ و صححه و وافقه الذهبي.

## باسی دووەم

### ئەهلوبەیتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)

وشەی ئەهلوبەیت لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، لە نێوەندی ئەو ئایەتانەدا هاتووە کە باسی خێزانەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەکات، واتە ئەگەر تەنها لەو دەقەی قورئانەوە پێناسەی ئەهلوبەیت وەربگرین ئەوە خێزانەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەگرێتەوە:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٢٩﴾ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ مَن يَأْتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ يُضَٰعَفْ لَهَا ٱلْعَذَابُ ضِعْفَيْنِ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿٣٠﴾ ۞ وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتَعْمَلْ صَٰلِحًا نُّؤْتِهَآ أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقًا كَرِيمًا ﴿٣١﴾ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ۚ إِنِ ٱتَّقَيْتُنَّ فَلَا تَخْضَعْنَ بِٱلْقَوْلِ فَيَطْمَعَ ٱلَّذِى فِى قَلْبِهِۦ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٣٢﴾ وَقَرْنَ فِى بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ ۖ وَأَقِمْنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ

تَطْهِيرًا ﴿٣٣﴾ وَٱذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِى بُيُوتِكُنَّ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلْحِكْمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ﴿٣٤﴾ ﴾[1]

(ئەی پەیامبەر! بە ژنەکانت بڵێ ئەر ئێوە ژین و جوانی ئەم دنیایەتان دەوێ، دەسا وەرنە پێش، با مارەیی و هەندێ شتومەکتان بدەمێ و بە خوا پەسەندانەو جوانی دەستتان لێبەر بدەم و بەرێتانکەم، واتە: بێ هیچ ڕەنجە دڵ و گازندەو دەردی سەرییەك وە ئەگەر خواو پەیامبەرەکەیی و، پاداشی دوا ڕۆژتان دەوێ و، ڕازی دەبن بەو ژیانەی ئێستاتان ئەوە بەڕاستی خوا بۆ چاکە کارانتان -ئەوانەتان ڕازی دەبن بەم ژیانە- پاداشتێکی گەورەی ئامادە کردووە، ئەی ژنانی پەیامبەر! هەرکامێکتان کارێکی دزێوی ئاشکرای لێ ڕووبدا، واتە: کارێکی وابێت دڵی پەیامبەر زویربکات و بێ فەرمانی ئەو بێت، با چاك بزانێت دوو بەرابەر سزاو جەزرەبە دەدرێ ئەوەیش بۆ خوا ئاسانە هەرکامێکیشتان بەر فەرمان و ملکەچی بۆ خواو پەیامبەرەکەی بکاو، کاروکردەوەی چاکیش ئەنجام بدا ئەوە پاداشتی دوو بەرامبەری ئەدەینەوە و ڕۆزییەکی باش و بە نرخی لە بەهەشتدا بۆ ئامادە دەکەین ئەی ژنانی پەیامبەر! هەرگیز ئێوە وەك هیچ یەکێ لە ژنانی تر نین ئەگەر ئێوە لە خوا بترسن، بێ شك حیساب و پاداشتان زۆرو فراوانە دەسا لەگەڵ نامەحرەمدا قسە بە نەرمیی و ناسکیی و نازەوە مەکەن نە وەکو ئەو کەسەی کە دڵی نەخۆشە (خراپ و بەد ڕەوشتی).

بەڵام پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە فەرمووده ڕوونکردنەوەی زیاتری بە هاوەڵان دا و تێیگەیاندن کە ئەهلوبەیت تەنها خێزانەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نین، کەچی خەڵکێك هاتووە ئەم بەڵگەی فەرموودەی وا لێکداوەتەوە کە ئەهلوبەیت تەنها ئەو کەسانەن کە لە فەرموودەکەدا ناویان هاتووە، لەکاتێکدا دانانی خێزانەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێشتر بە دەقی قورئان چەسپاوە، ئەوانی دی بە فەرموودە ئەندامبوونیان وەك ئەهلوبەیت چەسپاوە.

---

(١) الأحزاب: ٢٨ — ٣٤.

عائیشەی دایکی باوەڕداران دەڵێت: بەیانیەك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چوویە دەرەوەو جلێکی خوری لەبەر بوو کە لە مووی رەش دروستکرابوو، ئینجا حەسەنی کوڕی عەلی هات و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هێنایە ژوورەوە، دوای ماوەیەکی تر حوسەین هات و لەگەڵی هاتە ژوورەوە، دواتر فاتیمە هات و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەویشی هێنایەژوورەوە، ئینجا عەلیش هات و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەویشی هێنایە ژوورەوە، ئینجا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەم ئایەتەی خوێندەوە (إنما یرید الله لیذهب عنکم الرجس أهل البیت و یطهرکم تطهیرا).[1]

ئەم کەسانە وەك ناو لە فەرموودەدا دەستنیشان کران، بەڵام وەك یاسایەکی تایبەت بە ناسینەوەی ئەهلوبەیت لە فەرموودەدا بازنەیەکی فراوانتر دەستنیشان کراوە، ئەویش بریتیە لەوەی هەرکەسێك وەرگرتنی صەدەقەی لێ حەرام کرابێت ئەوە لە ئەهلوبەیتە.

جارێك رەبیعە هاودەم بە عەبباسی مامی پێکەوە قسەیان دەکرد، وتیان خۆزگە ئەم دوو کوڕەی خۆمان دەنارد، واتە (عەبدوڵای کوڕی عەبباس و عەبدولموطەلیبی کوڕی رەبیعە) بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تا سەرپەرشتی کۆکردنەوەی ئەو زەکاتەی بسپاردایە بەوان، ئیتر خەڵکی چی دەستکەوتایە ئەوانیش دەستیان دەکەوت و خەڵکی چی ببەخشیایە ئەوانیش دەیانبەخشی لەو کاتەدا عەلی کوڕی ئەبوو طالیب هات و ئەوانیش مەسەلەکەیان بۆ باس کرد، عەلی وتی شتی وا مەکەن چونکە سوێند بەخوا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەوە ناکات، بەڵام رەبیعە کەناری گرت لێی و پێی وت بەخوا لە حەسوودیتەوەیە وا دەڵێیت، تۆ بوویت بە زاوای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئێمە حەسوودیمان پێ نەبردیت، عەلی وتی دەی بیاننێرن، ئینجا عەلی راکشا، ئەوەبوو ئەو دوانە چوون، دوای

---

(١) صحیح مسلم، الرقم ٤٥٥٤، السنن الکبری للبیهقي، الرقم ٢٦٦٢.

ئەوەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نوێژی نیوەڕۆی کرد عەبباس و هاوڕێکەی چوون بۆ ژوورەکەی، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (ئەوەی لە ناختاندایە دەریبڕن)، ئەوکات پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە ماڵی زەینەبی کچی جەحش بوو، عەبدولموطەلیب دەڵێت: هەریەکەمان چاوەڕێ بووین ئەوی ترمان قسە بکات، دواجار یەکێکمان قسەی کرد و وتی ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تۆ چاکترین و خزم دۆستترین کەسیت، بیستوومانە هاوسەرگیریت کردووە، جا هاتوین تا هەندێ لە کۆکردنەوەی زەکات بسپێریتە دەستمان، ئیتر ئێمەش وەك ئەو خەڵکە ماف و ئەرکەکان بەجێ دەگەیەنین، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوو و لەولاشەوە زەینەبی خێزانی بە ئاماژەی چاو پێی دەوتین هیچی پێ مەڵێنەوە، دواتر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: (إن الصدقة لا تنبغي لآل محمد إنما هي اوساخ الناس)،[1] (زەکات بۆ بنەماڵەی موحەممەد ڕەوا نیە، بەڵکو زەکات پاشماوەی چڵکی دەستی خەڵکە).

مەرجی ئەندامبوونی ئەو کەسانەش لە ئەهلوبەیت ئەوەیە کە موسڵمان بووبن نەوەك کەسە بێباوەڕەکان، واتە ئەبوولەهەب هیچکات وەك ئەهلوبەیت حساب ناکرێت.

---

(١) صحیح مسلم، الرقم ١٨٤٩.

## خێزانەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم):

به دەقی قورئانی پیرۆز خێزانەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وەك دایکانی باوەڕداران ناسێنران و بڕێك حوکمی تایبەتییان لەسەر دانرا:

﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْ ۗ ﴿٦﴾ ﴾

به کورتی زانیاری لەسەر هەریەك لە خێزانەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەخەینەڕوو:

**یەکەم: خەدیجەی کچی خوەیلید:** خەدیجەی کچی خوەیلیدی کوڕی عەبدولعوززای قوڕەیشی ئەسەدی[١] ئافرەتێکی بێوەژنی دەوڵەمەندی ناو مەککە بوو و داواکاری زۆری هەبوو، بەڵام پاش ئەوەی ئەرکێکی بازرگانی بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سپارد[٢] و ئەویش بە سەرکەوتووی ئەرکەکەی بەجێگەیاند،[٣] خۆی دڵی چوویە سەر پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و پێشنیاری هاوسەرگیری بۆ کرد،[٤] دواجار خەدیجەی بیست و هەشت ساڵ[٥] و موحەممەدی بیست و پێنج ساڵ[٦] پێکەوە هاوسەرگیرییان کرد، ماوەی پێکەوە ژیانیشیان نزیکەی بیست و پێنج ساڵ بوو.

خەدیجە ئەم منداڵانەی لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بوو: (قاسم کە کوڕە گەورەی بوو، عەبدوڵا ناسراو بە طەیب و طاهیر، روقییە

---

(١) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٠.

(٢) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٧، ص ٩٠.

(٣) دلائل النبوة لأبي نعيم الأصبهاني، الرقم ١٠٦.

(٤) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١١٤.

(٥) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١١١.

(٦) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٧، ص ٩٠.

کە کچە گەورەی بوو، زەینەب، ئوممومکلثوم، فاتیمە)،[١] هەموو کوڕەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە خەدیجەوە پێش دابەزینی سروش وەفاتیان کرد، بەڵام کچەکانی مانەوە تا ئیسلام هات و باوەڕیان هێنا بە ئیسلام و کۆچیان کرد بۆ مەدینە.[٢]

خەدیجە یەکەم کەس بوو باوەڕی هێنا بە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)،[٣] ئەمەش کۆدەنگی هەموو موسڵمانانی لەسەرە،[٤] ئەم ئافرەتە پشتیوانێکی گەورە بوو بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، بەڵکو هەرکات پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە دەرەوە بە دەست بێباوەڕانەوە قسەی ناخۆشی بەرامبەر بکرایە، کە دەگەڕایەوەماڵەوە خەدیجە دڵی هێور دەکردەوەو خەفەتی سەر شانی لادەبرد،[٥] لەسەر چاکەکانی موژدەی بەهەشتی پێ درا،[٦] پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) هێندە خۆشی دەویست کە دوای مردنی خەدیجەش بەردەوام وەسفی دەکرد.[٧]

سەبارەت بە کاتی مردنی خەدیجە دەوترێت پێش فەرزبوونی نوێژ وەفاتی کردووە، دەوترێت لە مانگی ڕەمەزاندا کۆچی دوایی کردووە، ڕایەك دەڵێت: سێ ساڵ پێش کۆچی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ مەدینە کۆچی دوایی کردووە.[٨]

---

(١) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٢، ص ٢٩٤.

(٢) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٧، ص ٩١.

(٣) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٠٩.

(٤) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٧، ص ٨٩.

(٥) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٠.

(٦) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٠٣-٦٠٤.

(٧) صحيح البخاري، الرقم ٣٦٢٩.

(٨) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١١٧.

**دووەم: سەودەی کچی زەمعە:** سەودەی کچی زەمعەی کوڕی قەیسی قوڕەیشی[١] ئافرەتێکی بێوەژنی موسڵمان بوو،[٢] دوای وەفاتی خەدیجە پێغەمبەری خوا ((صلى الله عليه وسلم)) سەودەی بەهاوسەر گرت و ماوەیەك تەنها سەودە خێزانی بوو.[٣]

سەودە پاش کۆچکردنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کۆچی کرد بۆ مەدینە[٤] و لەوێ مایەوەو دوای وەفاتی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ژیا، رایەك دەڵێت لە سەردەمی خیلافەتی عومەری کوڕی خەططابدا کۆچی دوایی کردووە، رایەکی تریش دەڵێت لە شەووالیساڵی پەنجاو چواری کۆچیدا لە مەدینە وەفاتی کرد.[٥]

**سێیەم: عائیشەی کچی ئەبووبەکر:** عائیشە کچی ئەبووبەکری صدیقە، باوکی یەکێکە لە نزیکترین هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و موژدەپێدراوی بەهەشت و یەکەم خەلیفەی موسڵمانان، عائیشە هەر بە منداڵی ئیسلامی پێ گەیشت،[٦] هاوسەرگیری پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ عائیشە پێش کۆچی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بوو بۆ مەدینە، نزیکەی ساڵ و نیوێك یان دوو ساڵ پێش هیجرەت بوو کە عائیشەی مارە کرد، دواتر لە مانگی شەووالی ساڵی دووەمی کۆچی و پاش گەڕانەوەی لە غەزای بەدر ئینجا گواستیەوە.[٧]

---

(١) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢،ص ٢٦٥.

(٢) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٢، ص ٤٨٢.

(٣) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٦٥.

(٤) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٦٩.

(٥) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٦٧.

(٦) صحيح البخاري، الرقم ٤٦٦.

(٧) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٣٥.

کاتێ پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) عائیشەی بەهاوسەر گرتووە تەمەنی عائیشە کەم بووە، چونکە هەموو فەرموودەکان صەحیحن و لە صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتون.[١]

پاش کۆچی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) عائیشەش کۆچی کرد بۆ مەدینە،[٢] لەوێ مایەوەو لە پاش غەزای موەریسیع تۆمەتی داوێنپیسی درایە پاڵ و فیتنەیەکی گەورەی لێکەوتەوە هەتا خوای گەورە بە ئایەتی قورئان پاکی عائیشەی سەلماند و سزای تۆمەتسازانیش درا.[٣]

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خۆشەویستیەکی تایبەتی هەبوو بۆ عائیشە،[٤] هاوەڵان و خەڵکی مەدینەش هەستیان بەوە کردبوو،[٥] پێشبڕکێی لەگەڵ دەکرد،[٦] هەندێ جار بۆ میوانداریی لەگەڵ خۆی دەیبرد،[٧] باسی فەزڵ و گەورەیی عائیشەی دەکرد.[٨]

کاتێك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەخۆش کەوت و ئازاری زیادی کرد، مۆڵەتی لە هاوسەرەکانی تری خواست تا لە ماڵی عائیشە بمێنێتەوە، ئەوانیش رازی بوون،[٩] ئەوەبوو لە ماڵی عائیشە مایەوە تا وەفاتی کرد.[١٠]

---

(١) صحيح البخاري، الرقم ٢٥١٥ و ٥٧٨٤، صحيح مسلم، الرقم ٢٦٢٥ و ٤٥٧٤.

(٢) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٦٧٥٥.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ٢٥٣٩، صحيح مسلم، الرقم ٥٠٨٠.

(٤) صحيح ابن حبان، الرقم ٧١٠٨، صححه شعيب الأرناؤوط.

(٥) صحيح البخاري، الرقم ٢٤٦٢، سنن الترمذي، الرقم ٣٨٩٦، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٦٢٤.

(٦) سنن أبي داود، الرقم ٢٢٧، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٦٦٩، صححه الألباني و شعيب الأرناؤوط.

(٧) صحيح مسلم، الرقم ٣٨٩١، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٢٠٠١.

(٨) صحيح ابن حبان، الرقم ٧٢٠٤، صححه شعيب الارناؤوط، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٦٧٧١ و صححه ووافقه الذهبي.

(٩) صحيح البخاري، الرقم ١٩٤.

(١٠) صحيح البخاري، الرقم ٤١٩٤.

دوای وەفاتی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ژیا و لە سەردەمی خیلافەتی عەلی کوڕی ئەبووتالیبدا ئیجتیهادێکی کرد و نەیپێکا، دواتر دەستبەرداری بواری سیاسی بوو هەتا لە شەوی سێ شەممە حەڤدەی مانگی رەمەزانی ساڵی پەنجاو حەوت یان پەنجاو هەشتی کۆچی[١] و لە تەمەنی شەست و سێ ساڵیدا لە مەدینە وەفاتی کرد.[٢]

**چوارەم: حەفصەی کچی عومەر:** حەفصەی کچی عومەری کوڕی خەططاب[٣] پێنج ساڵ پێش پێغەمبەرایەتی لەدایك بوو،[٤] بێوەژنێکی موسڵمان بوو کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) حەفصەی بەهاوسەر گرت،[٥] ئەمەش لەسەر پێشنیاری عومەری باوکی.[٦]

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە ساڵی سێیەمی کۆچیدا حەفصەی بەهاوسەرگرت،[٧] ئەوکات تەمەنی نزیکەی بیست ساڵێك دەبوو،[٨] حەفصە تا دوای وەفاتی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ژیا و سەردەمی خیلافەتی راشیدینیشی تێپەڕاند و لە شەعبانی ساڵی چل و پێنجی کۆچیدا وەفاتی کرد[٩] و لە گۆرستانی بەقیع لە مەدینە ئەسپەردە کرا.[١٠]

---

(١) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٧، ص ٢٠٨.

(٢) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٩٣.

(٣) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٨، ص ٨١.

(٤) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٨، ص ٨١.

(٥) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٢، ص ١٨١.

(٦) مسند احمد بن حنبل، الرقم ٤٦٤٧، صحيح البخاري، الرقم ٣٨٠٢.

(٧) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٢٧.

(٨) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٢٧

(٩) البدايةو النهاية لابن كثير، ج٨، ص ٣٠.

(١٠) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٢٩.

**پێنجەم: زەینەبی کچی خوزەیمە:** زەینەبی کچی خوزەیمەی هیلالی ئافرەتێکی بێوەژنی موسڵمان بوو کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بە هاوسەری گرت،[١] زیاتر بە ئوممولمەساکین (دایکی هەژاران) ناسرابوو چونکە زۆر دەستگرۆ و هاریکاری هەژاران بوو.[٢]

هاوسەرگیری پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ زەینەبی کچی خوزەیمەدا دوای هاوسەرگیری بوو لەگەڵ حەفصەی کچی عومەردا، ئەمەش لە مانگی رەمەزاندا بوو، بەڵام تەنها دوو یان سێ مانگ هاوسەری پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بوو و دوای ئەوە وەفاتی کرد، یان دەوترێت نزیکەی هەشت مانگێك لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) مایەوە ئینجا وەفاتی کرد، کاتی مردنەکەشی لە مانگی رەبیعولئاخیری ساڵی چوارەمی کۆچیدا بوو، ئەوکات تەمەنی نزیکەی سی ساڵ دەبوو.[٣]

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تا لە ژیاندا بوو تەنها مەرگی دوو هاوسەری خۆی بینی کە ئەوانیش بریتی بوون لە خەدیجەی کچی خوەیلید و زەینەبی کچی خوزەیمە.[٤]

**شەشەم: هیندی کچی ئەبی ئومەییە (ئومموسەلەمە):** هیندی کچی ئەبی ئومەییە کە بە ئوممسەلەمە ناسراوە، ئافرەتێکی موسڵمانی بێوەژن بوو، سەرەتا هاوسەری ئەبووسەلەمە بوو و پێکەوە کۆچیانکرد بۆ مەدینە،[٥] دوای غەزای ئوحود ئەبووسەلەمەی مێردی وەفاتی کرد[٦] و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه

---

(١) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٧٢.

(٢) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٧، ص ١٤٢.

(٣) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٧٢.

(٤) الإستيعاب في معرفة الأصحاب، ج١، ص ٤٥.

(٥) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨، ص١٥٠.

(٦) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص ١٥٤.

وسلم) ئوممومسەلەمەی خواست[١] و بەهاوسەری گرت و لە ساڵی چوارەمی کۆچیدا گواستیەوە، ئەوکات ئافرەتێکی زۆر جوان بوو.[٢]

ئوممومسەلەمە یەکێك بوو لە ئافرەتە زاناکانی ناو هاوەڵان،[٣] جیبریلی لە شێوەی دیحیەی کەلبیدا بینیوە،[٤] هەتا دوای وەفاتی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) ژیا و کۆتا خێزانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بوو کە وەفاتی کرد، لە ساڵی شەست و یەکی کۆچی و ماوەیەکی کەم پاش شەهیدبوونی حوسەینی کوڕی عەلی لە تەمەنی نەوەد ساڵیدا وەفاتی کرد و لە بەقیع ئەسپەردە کرا.[٥]

**حەوتەم: جوەیریەی کچی حارث:** جوەیریەی کچی حارثی خوزاعی ئافرەتێکی جوولەکە بوو،[٦] ئافرەتێکی زۆر جوان و خوێن شیرین بوو،[٧] سەرەتا هاوسەری موسافیعی کوڕی صەفوان بوو کە لە غەزای مورەیسیعدا کوژرا، کاتێك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە غەزای مورەیسیعدا هێرشی بردە سەر بەنیلموصطەلەق جوەیریە بە کەنیزەك گیرا،[٨] دواتر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێشنیاری هاوسەرگیری بۆ کرد و بە هاوسەری گرت و بەو هۆیەوە هەموو بەندکراوەکانی هۆزەکەی جوەیریەی ئازاد کرد،[٩] تەمەنی جوەیریە ئەوکات بیست ساڵان بوو.[١٠]

---

(١) صحيح مسلم، الرقم ١٥٧٦.

(٢) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٠٢.

(٣) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٠٣.

(٤) صحيح البخاري، الرقم ٣٤٥٥.

(٥) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٠٢ — ٢١٠.

(٦) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٦٥.

(٧) الطبقات الكبرى، ج٨، ص ١١٦.

(٨) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٦٥-٥٦٦.

(٩) تأريخ الإسلام للذهبي، ج٢، ص ٢٦٣.

(١٠) تأريخ الإسلام للذهبي، ج٤، ص ١٩٠.

جوەیریە کە موسڵمان بوو، زۆر سەرقاڵی پەرستش و خواپەرستی دەبوو و لە پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم) فێری چاکترین پەرستش دەکرا،[١] ئەم ئافرەتە دوای وەفاتی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ژیا، رایەك دەڵێت لە ساڵی پەنجای کۆچیدا لە مەدینە وەفاتی کردووە، رایەکی تریش دەڵێت لە مانگی رەبیعولئەوەلی ساڵی پەنجاو شەش کۆچیدا وەفاتی کرد، دەوترێت کاتێك وەفاتی کردووە تەمەنی شەست و پێنج ساڵ بوو.[٢]

**هەشتەم: زەینەبی کچی جەحش:** زەینەبی کچی جەحشی ئەسەدی پوورزای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)[٣] و ئافرەتێکی موسڵمانی بێوەژن بوو کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بە هاوسەری گرت، یەکێك بوو لە دەستەی یەکەمی موسڵمانبوان[٤] و پێشتر هاوسەری زەیدی خۆشەویستی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بوو، دواتر پێکەوە نەگونجان و جیابوونەوەو پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بەهاوسەری گرت.[٥]

لە مانگی زیلقەعدەی ساڵی پێنجەمی کۆچیدا[٦] کە ئەو کات تەمەنی زەینەب بیست و پێنج ساڵان[٧] یان سی و پێنج ساڵان[٨] پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) زەینەبی بەهاوسەرگرت و کەمتر لە حەوت ساڵ پێکەوە ژیان.

زەینەب دوای وەفاتی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ژیا و لە خیلافەتی عومەری کوڕی خەططاب و لە ساڵی بیستی کۆچیدا وەفاتی

---

(١) صحيح مسلم، الرقم ٥٠١١، سنن ابن ماجة، الرقم ٣٨٠٥، سنن أبي داود، الرقم ١٢٩٨.

(٢) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٥٦٦.

(٣) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٧، ص ١٣٨.

(٤) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٧، ص ١٣٨.

(٥) صحيح البخاري، الرقم ٧٠٠٥.

(٦) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٤، ص ١٤٥.

(٧) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢١٧.

(٨) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٦٩.

کرد،[١] بەوەش یەکەم هاوسەری پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بوو دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) کۆچی دوایی کرد[٢] و لە گۆڕستانی بەقیع ئەسپەردە کرا.[٣]

**نۆیەم: ڕەملەی کچی ئەبووسوفیان:** ڕەملەی کچی ئەبوسوفیانی ئومەوی کە بە ئومموحەبیبە ناسراوە،[٤] بیست و سێ ساڵ لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بچووکتر بوو، یەکێك بوو لە دەستەی یەکەمی موسڵمانبوان و هاودەم بە عەبدوڵای کوڕی جەحشی هاوسەری کۆچی کرد بۆ حەبەشە و لەوێ عەبدوڵا مرد،[٥] ئینجا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) عەمری کوڕی ئومەییەی نارد بۆ حەبەشە و داوای ڕەملەی بۆ کرد[٦] و بە ئامادەبوونی نەجاشی بە وەکالەت مارەکرا لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)،[٧] نەجاشی مارەییەکەی ئومموحەبیبەی لەخۆگرت، مارەییەکەی ئومموحەبیبە زیاترین مارەیی ناو هەمو خێزانەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بوو.[٨]

کاتێك ئومموحەبیبە گەیشتەوە مەدینە تەمەنی نزیکەی سی و ئەوەندە ساڵ بوو،[٩] لە مەدینە مایەوەو دوای وەفاتی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ژیا، سەبارەت بە کاتی وەفاتی ڕاجیایی هەیە، ڕایەك دەڵێت: لە ساڵی چل و

---

(١) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢١٢.

(٢) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٦، ص ٢٠١.

(٣) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٤، ص ١٤٩.

(٤) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٥١.

(٥) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٨، ص ٩٦.

(٦) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٤، ص٦٠٢.

(٧) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٥٢.

(٨) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢١٩.

(٩) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٨، ص ٩٩.

دووی کۆچی بووە، رایەك دەڵێت: ساڵی چل و چوار بووە، رایەك دەڵێت: ساڵی پەنجاو نۆی کۆچی بووە کە ئەم رایەیان دوورە لە راستیەوە.(١)

**دەیەم: مەیموونەی کچی حارث:** مەیموونەی کچی حارثی کوڕی حەزەنی هیلالی ئافرەتێکی موسڵمانی بێوەژن بوو، پێشتر هاوسەری ئەبی روهمی کوڕی عەبدولعوززا بوو، لە مانگی ذیلقەعیدەی ساڵی حەوتی کۆچی و لە عومرەی دوای حودەیبیەدا پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەهاوسەری گرت و لەگەڵ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چوو بۆ مەدینە.(٢)

مەیموونە دەڵێت جێی خەوی من لەپاڵ شوێنی نوێژی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بوو، جار هەبوو جلەکەی دەکەوت بە سەرمدا و منیش لەناو جێگەکەمدا بووم.(٣)

مەیموونە پاش وەفاتی پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) ژیا و دواجار لە ساڵی پەنجاو یەکی کۆچیدا وەفاتی کرد.(٤)

**یانزەیەم: صەفییەی کچی حویەی:** صەفییەی کچی حویەی کوڕی ئەخطەب ئافرەتێکی بێوەژنی جوولەکە بوو،(٥) لە ساڵی حەوتەمی کۆچی و لە غەزای خەیبەردا بەدیل گیرا و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هێشتیەوە بۆ خۆی و لەسەر بژاردەی خودی صەفییە بەهاوسەری گرت و(٦) هەر لە رێی گەڕانەوەیدا گواستیەوە.(٧)

---

(١) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٥٣.

(٢) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨، ص ١٢٦-١٢٨.

(٣) صحيح البخاري، الرقم ٥٠٤.

(٤) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٨، ص ١٢٨.

(٥) ابن الأثير: أسد الغابة في معرفة الصحابة،ج٧، ص ١٨٤.

(٦) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٨، ص ١٢٣.

(٧) صحيح البخاري، الرقم ٢١٤٢.

صەفییە ئافرەتێکی ژیرو جوان و ئاییندار بوو،[١] پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) شایەتی راستگۆیی بۆ دەدا،[٢] دوای وەفاتی پێغەمبەریش (صلی اللە علیە وسلم) ژیا و لە سەردەمی فیتنەی نێو خیلافەتی عوثمانی کوڕی عەففاندا پاڵپشتی عوثمان بوو،[٣] دەوترێت صەفییە لە ساڵی سی و شەشی کۆچی وەفاتی کردووە، رایەکیش دەڵێت لە ساڵی پەنجای کۆچیدا وەفاتی کردووە،[٤] رایەکیش دەڵێت لە سەردەمی خیلافەتی موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیان و لە ساڵی پەنجاو دووی کۆچیدا وەفاتی کردووە.[٥]

---

(١) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٣٢.

(٢) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٣١٣، حسنه ابن حجر في الإصابة، ج٧، ص ٧٤١.

(٣) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٧٤١.

(٤) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٣٥.

(٥) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٧٤١.

## کچەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم):

**زەینـــەب:** کچە گەورەی پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) بووە، خێزانی ئەبولعاصی کوڕی ڕەبیعی پوورزای خۆی بوو کە کەسێکی بێباوەڕ بوو و لە کاتی کۆچی پێغەمبەر و موسڵمانانندا بۆ مەدینە، ئەبولعاص نەیهێشت زەینەب کۆچ بکات، لە جەنگی بەدردا ئەبولعاص بە بێباوەڕیی بەدیل گیرا و پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) مەرجی دانا ڕێ بدات زەینەب کۆچ بکات[١] بێ ئەوەی پێویست بکات تەڵاقی بدات، ئەویش ڕازی بوو و بەڵێنەکەشی بردەسەر،[٢] لەکاتی کۆچەکەیدا هێندە ئازار درا کە پێغەمبەر ((صلى الله علیه وسلم)) دەیفەرموو (ئەمە چاکترین کچمە کە لەبەر من تووشی نارەحەتی بوو).[٣]

لە ساڵی شەشەمی کۆچیدا ئەبولعاصی مێردیشی موسڵمان بوو و کۆچی کرد بۆ مەدینە،[٤] زەینەب لە سەرەتای ساڵی هەشتەمی کۆچیدا وەفاتی کرد،[٥] زۆری نەخایاند کە ئەبولعاصی مێردیشی کۆچی دوایی کرد.[٦]

**ڕوقـــیـــە:** ڕوقییە دەستگیرانداری کوڕێکی ئەبوو لەهەب بوو بە ناوی عوتبە، کاتێك پێغەمبەری خوا (صلى الله علیه وسلم) سروشی بۆ هات و ئەبوولەهەب دژایەتی کرد، فەرمانی کرد بە کوڕەکەی تا ڕوقییە تەڵاق بدات، ئەویش تەڵاقی دا، دواتر عوثمانی کوڕی عەففان ڕوقییەی بەهاوسەر گرت و لەگەڵیدا

---

(١) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٤٨ و ٦٦٥.

(٢) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٤، ص ١٧٨.

(٣) المستدرك على الصحيحين، الرقم ٢٧٤٤، المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٨٨٥٨، صححه الألباني في سلسلة الاحاديث الصحيحة، الرقم ٣٠٧١.

(٤) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٦٥.

(٥) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٥٠.

(٦) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٦٥.

خۆشی و ناخۆشیەکانی بەشکرد، پێکەوە کۆچیان کرد بۆ حەبەشەو پێکەوە گەڕانەوەو کۆچیان کرد بۆ مەدینەو لە مەدینەش تا وەفاتی روقییە عوثمان هەر لە لای روقییە بوو.[١]

کاتێك عوثمان و روقییە کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (إن عثمان أول من هاجر إلى الله بأهله بعد لوط)،[٢] ( عوثمان یەکەم کەسە دوای پێغەمبەر لووگ لەپێناو خوادا بە خۆی و ژنیەوە کۆچی کردبێت).

دوای ئەوەش گەڕانەوە مەککە و لەوێشەوە کۆچیان کرد بۆ مەدینە، زۆری نەخایاند لە مەدینە روقییە نەخۆشکەوت، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی کرد عوسمان لای روقییە بمێنێتەوەو نەچێت بۆ غەزای بەدر،[٣] هەتا پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە غەزای بەدر گەڕایەوە روقییە وەفاتی کردبوو.[٤]

**ئوممو کولثـــوم:** دەستگیرانداری کوڕێکی ئەبوو لەهەب بوو بە ناوی عوتەیبە، کاتێك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سروشی بۆ هات و ئەبوولەهەب دژایەتی کرد، فەرمانی کرد بە کوڕەکەی تا ئوممو کولثوم تەڵاق بدات، ئەویش تەڵاقی دا، دوای کۆچی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ مەدینە ئەمیش کۆچی کرد، لەوێ مایەوە هەتا دوای وەفاتی روقییەی خوشکی، لە ساڵی سێیەمی کۆچیدا شووی کرد بە عوثمانی کوڕی عەففان، لە مانگی شەعبانی ساڵی نۆیەمی کۆچیدا وەفاتی کرد و پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆی گریا.[٥]

---

(١) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٤٨-٦٤٩.

(٢) المعجم الكبير للطبراني، الرقم ١٤١.

(٣) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٣، ص ٣٤٧.

(٤) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج٧، ص ٦٤٩.

(٥) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ٢٥٢ — ٢٥٣.

**فاطیمە:** فاطیمە پێش دابەزینی سروش لەدایك بوو،[١] پێش کۆچکردنی بۆ مەدینە، هاوشێوەی خوشکەکانی تری مەرگی خەدیجەی دایکی بینی، دواتر کۆچی کرد بۆ مەدینە و ماوەیەك دوای غەزای بەدر لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبووتالیبی ئامۆزای پێغەمبەردا (صلی الله علیه وسلم) هاوسەرگیری کرد،[٢] لە عەلی دوو کوڕی بوو بە ناوەکانی حەسەن و حوسەین کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) زۆر خۆشی دەویستن، فاطیمە تاکە منداڵی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بوو کە مەرگی باوکی خۆی بینی، بەڵام زۆری نەخایاند دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەمیش وەفاتی کرد.[٣]

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەیفەرموو (إن أفضل نساء أهل الجنة خديجة بنت خويلد و فاطمة بنت محمد و مريم بنت عمران و آسية بنت مزاحم إمراة فرعون)،[٤] واتە (چاکترین ئافرەتانی بەهەشت بریتین لە خەدیجەی کچی خوەیلید و فاتیمەی کچی موحەممەد و مەریەمی کچی عیمران و ئاسیەی کچی موزاحیم کە ژنی فیرعەون بوو).

ئەهلوبەیتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە هەموو نارەحەتیەکانی موسڵمانان‌دا پشکی گەورەیان بەرکەوت و پارێزبەندی و تایبەتمەندییان پێ نەدرابوو، لە سەرەتاوە دوو کچی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تەڵاق دران، روقییە و عوثمان و جەعفەر کۆچیان کرد بۆ حەبەشە، هەموویان بەشدار بوون لە کۆچی مەدینەدا، عوبەیدە و حەمزە و جەعفەر لە غەزاکاندا شەهید بوون، ئەمەش بەڵگەی دروستی بانگەوازەکەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بوو.

---

(١) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١١٩.

(٢) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١١٩.

(٣) الذهبي: سير أعلام النبلاء، ج٢، ص ١٢١.

(٤) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢٧٨٧، السنن الكبرى للنسائي، الرقم ٨٠٨٠، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٣٧٧١ و صححه ووافقه الذهبي، صححه الألباني و شعيب الأرناؤوط.

# باسی سێیەم

## هاوەڵانی پێغەمبەری خوا
## (صلى الله عليه وسلم)

هاوەڵی پێغەمبەر ((صلى الله عليه وسلم)) بریتیە لە (هەر کەسێکی موسڵمان کە بە موسڵمانی لەواقیعدا گەیشتبێت بە پێغەمبەر ((صلى الله عليه وسلم)) و لەسەر باوەرداری مردبێت).

**ماوەی هاوەڵان:** زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کە هەرکەس دوای سەدساڵ لە وەفاتی پێغەمبەر ((صلى الله عليه وسلم)) بانگەشەی هاوەڵبوونی کردبێت بڕوای پێ نەکەن،[١] ئەوەش لەبەر ئەو فەرموودەی پێغەمبەر((صلى الله عليه وسلم)) کە مانگێ بەر لە مردنی فەرمووی (أرأيتكم ليلتكم هذه فإن على رأس مائة سنة منها لا يبقى على وجه الأرض ممن هو اليوم عليها أحد)،[٢] واتە(ئەمشەوتان ئەبینن، لەمشەوەوە تا سەد ساڵی تر لەم سەرزەویەدا یەك کەس نامێنێ کە ئەمڕۆ لەسەریەتی).

**ژمــارەی هاوەڵان:** سەبارەت بە ژمارەی هاوەڵان راجیایی هەیە، راستیش ئەوەیە کە بە وردی ژمارەی هاوەڵان نازانرێت، چونکە ژمارەیەکی زۆر بووەو لەو

---

(١) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٨-٩.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ١١٥ و ٥٤٩ و ٥٨٥، صحيح مسلم ٤٧٠٩.

سەردەمەشدا سەرژمێری ورد نەبووە، ژمارەیەکی زۆر لە هاوەڵان لە دووری مەککە و مەدینەوە هاتون و وەك وەفد هاتون و دواتر چوونەتەوە بۆ ناوچەی خۆیان.

هاوەڵانی بەشداربوو لە غەزای بەدردا **٣١٣** کەس بوون،[١] هاوەڵان لە رۆژی بەیعەتی ریضواندا ژمارەیان ١٤٠٠ کەس بوو،[٢] هاوەڵانی بەشداربوو لەساڵی دەی کۆچیدا کە لەگەڵ پێغەمبەر((صلی الله علیه وسلم)) بەشدار بوون بۆ چوون بۆ مەککە لە سەروو دە هەزار کەسەوە دەبوون.[٣]

ئیبن حەجەر گێڕانەوەیەکی پهوری هێناوە کە دەڵێت کاتێ پێغەمبەر ((صلی الله علیه وسلم)) وەفاتی کرد دوانزە هەزار هاوەڵ هەبوون کە پێغەمبەری خوا ((صلی الله علیه وسلم)) لێیان رازی بوو.[٤]

هەروەها دەقێکی ئەبووزەرعەی رازی هێناوە کە دەڵێت:(پێغەمبەری خوا((صلی الله علیه وسلم)) کە وەفاتی کرد ئەوانەی دیبوویان و فەرموودەیان لێوەگێڕابوویەوە لەسەروو سەد هەزار کەسەوە دەبوون لە ژن و پیاو کە هەموویان فەرموودەیان لێوەگێڕاوەتەوە ئایا فەرموودەی بیستراو بێت یان بینراو).[٥]

دەکرێت بوترێت ژمارەی هاوەڵان ئەوەندە بووبێ کە باسکراوە یان شتێ کەم و زیادی هەبووبێت، فەرموودەشیان لە پێغەمبەری خواوە(صلی الله علیه وسلم) بیستبێت و گێڕابێتەوە بۆ خەڵکی دەوروبەریان، بەڵام ئەو گێڕانەوانە هەموویان تۆمار نەکرابن و نەگەیشتبنە نەوەکانی داهاتوو، وەك ئەوەی چەندین کەس بە جیاجیا یان وەك وەفد هاتبن و لەو ماوە کەمەی بینینی پێغەمبەردا(صلی الله

---

(١) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ٢١٥٠، مصنف ابن أبي شيبة، الرقم **٣٦٠٣٥**.

(٢) صحيح مسلم، الرقم **٣٥٣٨**.

(٣) صحيح البخاري، الرقم **٤٠٣٩**.

(٤) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٣.

(٥) ابن حجر العسقلاني: الإصابة في تمييز الصحابة، ج١، ص٢.

علیه وسلم) بڕێك فەرمودەیان وەرگرتبێت و دواتر چووبنەوە بۆ وڵاتی خۆیان و لەوێ ئەو فەرموودانەیان گێڕابنەوە، بەڵام دواتر ئەو فەرموودانە تۆمار نەکرابن.

**چینەکانی هاوەڵان:** شێوەی دابەشکردنی چینەکانی هاوەڵان بە چەند شێوە هاتووە، هەندێکیان بەپێی پێشینە، هەندێ بە پێی فەزڵ و گەورەییان، هەندێ بەپێی بەشداری غەزاکان، دەکرێت دیارترین شێواز لە سێ دەستەدا دەستنیشان بکەین (کۆچەران، پشتیوانان، موسڵمانبوانی پاش فەتح).

خوای تاك و تەنها وەسفی هەر سێ دەستەی کۆچەران و پشیوانان و ئەوانەی دوای ئەوانیش دەکات و دەفەرموێت:

﴿لِلْفُقَرَاءِ الْمُهَاجِرِينَ الَّذِينَ أُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَأَمْوَالِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا وَيَنصُرُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ ﴿٨﴾ وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾ وَالَّذِينَ جَاءُوا مِن بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِّلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾﴾.[(١)]

واتە: (هەروەها لەو دەستکەوتانە بەشی کۆچبەرانی هەژار دەبێت بدرێت، ئەوانەی لە شوێنەوار و سامانیان دوورخراونەتەوە و دەرکراون، ئەوانەی بەتەمای بەخششی خوا و ڕەزامەندی ئەون و بەبێ هیچ تەماعێك پشتیوانی لە خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن و هەوڵی سەرخستنی بەرنامەکەیان دەدەن، هەر ئائەوانە راستگۆو ڕاستانن، ئەوانەی کە پێشتر ماڵ و شوێنی خۆیان ئامادە کرد بۆ پێشوازیی لە کۆچبەران و دڵ و دەروونی خۆیان ڕازاندەوە بە ئیمان، ئەوانەشیان خۆش دەوێت کە کۆچیان کردووە بۆ لایان و لە دڵ و دەرونیاندا جێی هیچ جۆرە

---

(١) الحشر: ٨-١٠.

حەسوودی و بەخیلیەك نابێتەوە (لەسەر ئەوەی کە بەشی کۆچبەران دراوە و بەشی ئەوان نەدراوە)، حەز بە بەخشینی دەستکەوتەکان بەوان دەکەن، فەزڵی ئەوان دەدەن بەسەر خۆیاندا هەرچەندە هەژارو نەداریشن، جا ئەوەی خۆی لە نەفسی ڕەزیلی بپارێزێت و زاڵ بێت بەسەریدا، ئا ئەوانە هەر سەرفرازن، ئەوانەش کە بە شوێن کۆچبەران و پشتیواناندا هاتن (تا کۆتایی دنیا ئەمە دۆعا و نزایانە و بەردەوام) دەڵێن: پەروەردگارا لە ئێمەو لە و برایانەشمان خۆش ببە کە پێش ئێمە ڕێبازی ئیمانیان گرتەبەر و لە دڵەکانماندا هیچ جۆرە بوغزو کینەیەك مەخەرە دڵمانەوە لە ئاستی ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، پەروەردگارا تۆ بەڕاستی بەسۆزو بەخشندەو میهرەبانیت.

﴿لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ ۚ أُولَٰئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ الَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا ۚ وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ ۚ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١٠﴾﴾.[١]

واتە:(یەکسان نین لە ئێوە ئەوانەتان کە پێش فەتحی مەککە بەخشیتان و جەنگتان کرد، ئەوانەپاداشتیان زۆر گەورەترە لەوانەی دوای فەتحی مەککە بەخشییان و جەنگیان کرد، وە هەمووشیان -هەموو هاوەڵان- خوا بەڵێنی چاکەی پێداون، خواش زانا و ئاگادارە بەوەی دەیکەن).

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سەبارەت بە هاوەڵانی دەوری دەفەرموێت:

(خير الناس قرني، ثم الذين يلونهم، ثم الذين يلونهم)[٢] واتە:(چاکترینی خەڵك سەدەی منن، دواتر ئەوانەی دوای ئەوان، دواتر ئەوانەی دوای ئەوان).

عن أبي بريدة عن أبيه قال: صلينا المغرب مع رسول الله ( ثم قلنا : لو جلسنا حتى نصلى معه العشاء قال: فجلسنا فخرج علينا فقال: "ما زلتم ههنا؟" قلنا: يا رسول الله صلينا معك المغرب ثم قلنا نجلس حتى نصلى معك العشاء قال : "أحسنتم أو أصبتم" قال: فرفع رأسه إلى السماء وكان كثيراً ما يرفع رأسه إلى السماء فقال

---

(١) الحديد: ١٠.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ٢٥٣٠ و ٣٤٧٢ و ٦٠٧٣، صحيح مسلم، الرقم ٤٧٠٥.

ئەبووبورەیدە لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت لەگەڵ پێغەمبەر((صلی الله علیه وسلم)) نوێژی ئێوارەمان کرد، دواتر وتمان بەڵکو دابنیشین تا نوێژی خەوتنانیشی لەگەڵ بکەین، دانیشتین تا پێغەمبەر((صلی الله علیه وسلم)) هات بۆ لامان، فەرمووی ئێوە هێشتا لێرەن؟ وتمان ئەی پێغەمبەری خوا((صلی الله علیه وسلم)) نوێژی ئێوارەمان کرد لەگەڵتدا، دواتر وتمان با دابنیشین تا نوێژی خەوتنانیشت لەگەڵ بکەین، فەرمووی(باشتان کرد و راستتان پێکا)، ئینجا سەری بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە و زۆر جاریش پێغەمبەر((صلی الله علیه وسلم)) سەری بەرەو ئاسمان بەرز دەکردەوە، ئینجا فەرمووی (النجوم أمنة للسماء، فإذا ذهبت النجوم أتى السماء ما توعد، وأنا امنة لأصحابي فإذا ذهبت أتى أصحابي ما يوعدون، وأصحابي أمنة لأمتي فإذا ذهب أصحابي أتى أمتي ما يوعدون)،[1] (ئەستێرەکان پارێزەری ئاسمانن، هەرکات ئەستێرەکان نەمان ئاسمان تووشی ئەوە دەبێت کە وادەی دراوە، منیش پارێزەری هاوەڵانم هەرکات من نەمام ئەوە وادە دراوە بۆ هاوەڵانم تووشیان دەبێت، هاوەڵانیشم پارێزەری ئوممەتەکەمن هەرکات هاوەڵانم نەمان ئەوەی وادەیان پێ دراوە تووشی ئوممەتەکەم دەبێت).

**سیفەتی هاوەڵان:** گرنگترین سیفەتە گشتگیرەکانی هاوەڵان بریتی بوون لە:

- نیەت: هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی رەزامەندی خوا ﴿يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗا وَيَنصُرُونَ ﴿٨﴾﴾، (ئەوانەی بەتەمای بەخششی خوا و رەزامەندی ئەون).

- پێشرەو: خۆشەویستییان بۆ پێغەمبەری خوا ((صلی الله علیه وسلم)) و پێشەنگی کردن پێیەوە و شوێنکەوتنی:

﴿لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلۡعُسۡرَةِ مِنۢ بَعۡدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٖ مِّنۡهُمۡ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّهُۥ بِهِمۡ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿١١٧﴾﴾.

---

(١) صحيح مسلم، الرقم ٤٧٠٠، ١٩٤٤١، مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١٩١٣١.

(خوا لەوکارەی پەیامبەرەیش خۆش بوو کە: مۆڵەتی دەستەیەك لەدوو ڕووەکانیدا کە: لە گەڵی نەچن بۆ جەنگی تەبووك وە لە کۆچکەران و پشتیوانانیش- کە هەندێکیان چوونە جیهادو، هەندێکیشیان خۆیان بە زەوییدا نووساند خۆشبوو ئەوانەیان کە لە جەنگە سەختەکەی (تەبووك)دا دوای پێغەمبەر کەوتن و پەیڕەوییان لێکردو چوونە تەبووك پاش ئەوە خەریکبوو هێندێکیان دڵیان لاڕێ بێت و نەچنە جیهادەکەوە! پاشان دووبارە خوا تەوبەی لێوەرگرتن چونکە بەڕاستیی خوا بەرامبەر بەوانە زۆر بەلوتفە، زۆریش لەگەڵیان بە میهرە).

- یەکڕیزی: خۆشەویستی نێوان خۆیان و توندبوونیان بەرامبەر نەیارانی ئیسلام: ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡ ۝٢٩﴾

(موحەممەد ڕەوانەکراوی خوایە، ئەوانەش کە لە خزمەتیدان و شوێنی کەوتوون توند و تیژن بەرامبەر بێباوەڕان و بە بەزەیی و میهرەبانن لە نێوان خۆیاندا).

- نەوەستان: ﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدۡ جَمَعُواْ لَكُمۡ فَٱخۡشَوۡهُمۡ فَزَادَهُمۡ إِيمَٰنٗا وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ ۝١٧٣﴾

(ئەوانەی کە خەڵکی پێیان دەوتن بەراستی خەڵکی بێباوەر و خوانەناس خۆیان بۆ ئێوە کۆکردوەتەوە و خۆیان بۆ ئێوە مەڵاس داوە،لێیان بترسن، بەڵام ئەوان باوەریان دامەزرا و وتیان خوامان بەسە کە یاریدەر و یارمەتیدەرێکی زۆر چاکە).

## چۆن بڕوانینە هاوەڵان (رضي الله عنهما) :

### یەکەم: هاوەڵان دەستەی بنەڕەتی پەیوەست بە دینی ئیسلامن:

چونکە ئەوان خوێندکاری خزمەت پێغەمبەری خوا((صلی الله علیه وسلم)) و دەستەگوڵی پەروەردەی نێردراوی خوان، هەروەها ئەوان نووسەرەوەی قورئان بوون، هەروەها هاوەڵان گەیەنەری دین و روونکردنەوەی وردەکاریەکانی ئیسلام بون، ئەوان چ بە فەتحی خاك و ناوچەکان و چ بە فەتحی دڵان ئیسلامیان بە سەر زەویدا بڵاوکردەوەو گەیاندیان بە مرۆڤایەتی، بۆیە ئەگەر بوترێت پۆلی هاوەڵان کەوتوون و لە تاقیکردنەوەدا دەرنەچون، دروستکردنی نیشانەی پرسیارە لەسەر خودی کەسێتی و توانا و گەیاندنی پەیامی پێغەمبەرێتی پێغەمبەری خوا.

### دووەم: هاوەڵان دەستەی شایەتی بۆ دراون:

هاوەڵان ئەو دەستەیەن کە خوای گەورە لە چەندین شوێنی قورئاندا شایەتی بۆ داون، لێیان رازی بووە، وەسفی کردون، ئایەتی لەبارەوە دابەزاندون، بە هاودەمی پێغەمبەری خوا((صلی الله علیه وسلم)) باسی کردون، ئەوانەن کە بەڵێنی چاکەو بەهەشتی پێداون، پێغەمبەری خواش((صلی الله علیه وسلم)) لە فەرموودەدا دەیان جار وەسفی کردون و لێیان رازی بووەو شایەتی راستگۆیی و چاکەی بۆ داون.

### سێیەم: هاوەڵانی پێغەمبەر((صلی الله علیه وسلم)) مرۆڤ بون:

ئەوان نە لە مرۆڤ زیاتر بون، نە لە مرۆڤ کەمتر بون، مرۆڤبوونیش واتای کەمی و نزمی ئاستی ئەو کەسە ناگەیەنێت، بەڵکو مرۆڤبوون لە ئیسلامدا پلەیەکی بەرزەو سەرجەم پێغەمبەران شانازییان پێوە کردووە:

﴿قَالَتۡ لَهُمۡ رُسُلُهُمۡ إِن نَّحۡنُ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ ١١﴾[1]

(پێغەمبەرەکانیان پێیان وتن ئێمە هەر ئادەمیەکین وەکو ئێوە).

### چوارەم: هاوەڵان کەسانی سەردەمی خۆیان بون:

دەبێت ئەوە لەیاد نەکەین کە هاوەڵان لە سەدەی یەکەمی کۆچیدا ژیاون، واتە چواردە سەدە پێش ئێستا، ئەوان لەمڕۆدا ناژین، بۆیە هەڵەیە حوکمی ئەمڕۆ بدەین بەسەر هاوەڵاندا، بۆیە دەبێت کاریگەری ژینگەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و زانستی ئەوکات لەبەرچاو بگرین.

### پێنجەم: هاوەڵان لەنێو خۆیاندا ئاستیان جیاواز بووە:

وەك چۆن پلەبەندی لە ئاستی مرۆڤەکاندا هەیە، لەنێو دەستەیەکی مرۆڤەکانیشدا ئاستی جیاواز هەیە، جا ئاستەکە بەپێی بیر و ئایدۆلۆژیاکان جیاوازن، لە دیدی ماددیگەراکانەوە ئاستی مرۆڤەکان بە پێوەری مادده دیاری دەکرێت، لە دیدی دەمارگیرەکانەوە ئاستی مرۆڤەکان بەپێی رەنگی پێست یان باڵا یان هەر پێوەرێکی دی دیاری دەکرێت، لە ئیسلامیشدا ئاستی مرۆڤەکان بە پێی ئاستی گوێڕایەڵییان بۆ خوا (تەقوا) دیاری دەکرێت، بۆیە دەبینین لە نێو هاوەڵاندا ئەو ئاست جیاوازیە هەبووە، نەك وەك فەوتانی مافی کەسەکانی دی، نا وەك ئەوەی هەرکەسەو مافی خۆی دیاریکراو بێت.

---

(١) الرعد: ١١.

## خشتەی زانیاری لەسەر دیارترین هاوەڵانی پێغەمبەر ((صلى الله عليه وسلم))

| هاوەڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) | دەستە | موسڵمانبوون | ڕۆڵ وپلەوپایە |
|---|---|---|---|
| ئەبووبەکری صدیق | کۆچەری | لە نێو پیاواندا یەکەم کەس بوو موسڵمان بوو | موژدەپێدراوی بەهەشت، نزیکترین هاوەڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، بەشداربووی سەرجەم غەزاکان، دەوڵەمەندێکی پشتیوانی بانگەوازی ئیسلامی |
| عومەری کوڕی خەططاب | کۆچەری | لە ساڵی شەشەمی پێغەمبەرایەتیدا موسڵمان بوو | موسڵمانبوونی بوویە مایەی شکۆ بۆ موسڵمانان، موژدەپێدراوی بەهەشت، ڕاوێژکاری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، بەشداری سەرجەم غەزاکان، هاوەڵی زۆر نزیکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) |
| عوثمانی کوڕی عەففان | کۆچەری | چوارەم پیاو بوو کە موسڵمان بوو | موژدەپێدراوی بەهەشت، دوو جار زاوای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بوو، بەشداربووی زۆرێك لە غەزاکان، دەوڵەمەندێکی پشتیوان بۆ بانگەوازی ئیسلامی، هاوەڵی زۆر نزیکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم). |

| هاوەڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) | دەستە | موسڵمانبوون | رۆڵ وپلەوپایە |
|---|---|---|---|
| عەلی کوڕی ئەبووطالیب | کۆچەری | یەکەم منداڵ بوو کە موسڵمان بوو | موژدەپێدراوی بەهەشت، ئامۆزای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، بەشداربووی زۆربەی غەزاکان، زاوای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، سەرکردەیەکی سەربازیی چاونەترس. |
| ئەرقەمی کوڕی ئەبی ئەرقەمی مەخزوومی | کۆچەری | پێش ئاشکرابوونی بانگەواز موسڵمان بوو | خانووەکەی لە مەککەدا بنکەی بانگەوازی ئیسلامی بوو، بەشداربووی سەرجەم غەزاکان، نووسەری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و کۆکەرەوەی زەکات. |
| ئەسعەدی کوڕی زورارە | پشتیوانی | لە پێش بەیعەتی عەقەبەدا موسڵمان بوو | یەکەم موسڵمانبووی پشتیوانان، بەشداربووی بەیعەتەکانی عەقەبە، یەکێك لە دوانزە نەقیبەکە، هۆکاری موسڵمانبوونی بەشێك لە پشتیوانان. |
| ئەنەسی کوڕی مالیك | پشتیوانی | پێش کۆچی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) موسڵمان بوو | بەردەوام خزمەتی پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) کردووە، فەرموودەیەکی زۆری گێڕاوەتەوە، بەشداری سەرجەم غەزاکانی کردووە. |

| هاوەڵی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) | دەستە | موسڵمانبوون | ڕۆڵ وپلەوپایە |
|---|---|---|---|
| ئوسامەی کوڕی زەید | کۆچەری | هەر لە منداڵیەوە بە موسڵمانی پێگەیشت | خۆشەویستی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، سەرکردەیەکی هەڵکەوتەی سەربازی، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شایەتی شیاوبوونی ئوسامەی دەدا بۆ ئەمیرایەتی. |
| ئوسەیدی کوڕی حوضەیر | پشتیوانی | پێش کۆچی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) موسڵمان بوو | بەشداربووی بەیعەتی عەقەبە، یەکێك لە دوانزە نەقیبەکە، بەشداربووی غەزاکان، پێشنوێژی بەشێك لە موسڵمانان لەسەردەمی پێغەمبەردا. |
| ئەسمائی کچی ئەبووبەکر | کۆچەری | پێش ئاشکرابوونی بانگەواز موسڵمان بوو | خاوەنی نازناوی (ژات النگاقین)، بەشداربووی هیجرەت، هاوسەری عەبدوڵای کوڕی زوبەیر و دایکی عەبدوڵای کوڕی زوبەیر. |
| بیشری کوڕی بەراء | پشتیوانی | پێش کۆچی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) موسڵمان بوو | بەشداربووی بەیعەتی عەقەبە، تیرهاوێژێکی دیار، بەشداربووی غەزاکان، پاش خەیبەر بە ژەهری ئافرەتێکی جوولەکە وەفاتی کرد. |

| هاوەڵی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) | دەستە | موسڵمانبوون | ڕۆڵ وپلەوپایە |
|---|---|---|---|
| بیلالی کوڕی ڕەباحی حەبەشی | کۆچەری | دەستەی یەکەمی موسڵمانبوان | لەسەر ئیسلام زۆر ئەشکەنجە درا، بانگبێژی هەمیشەیی و خۆشەویست و هاوەڵی زۆر نزیکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، بەشداربووی سەرجەم غەزاکان. |
| سابتی کوڕی قەیس | پشتیوانی | پێش کۆچی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) موسڵمان بوو | بەشداربووی سەرجەم غەزاکان، نووسەری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، وتاربێژی تایبەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە کاتی هاتنی وەفدەکاندا |
| جابیری کوڕی عەبدوڵای کوڕی عەمر | پشتیوانی | پێش کۆچی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) موسڵمان بوو | کەمتەمەنترین بەشداربووی بەیعەتی دووەمی عەقەبە، بەشداربووی زۆربەی غەزاکان، ژمارەیەکی بەرچاو فەرموودەی گێڕاوەتەوە. |
| جەعفەری کوڕی ئەبووطالیب | کۆچەری | دەستەی یەکەمی موسڵمانبوان | دەستگرۆی هەژاران، بەشداربووی کۆچی حەبەشە، ئەمیری موسڵمانان لە حەبەشە، ئەمیری موسڵمانان لە جەنگی موئتە کە تیایدا شەهید بوو. |

| هاوەڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) | دەستە | موسڵمانبوون | ڕۆڵ وپلەوپایە |
|---|---|---|---|
| جوبەیری کوڕی موطعیم | پاش فەتح | پاش فەتحی مەککە | پێش موسڵمانبوونیشی دژایەتیەکی ئەوتۆی موسڵمانانی نەدەکرد. |
| ئەبووژەری غیفاری | کۆچەری | دەستەی یەکەمی موسڵمانبوان | هاوەڵێکی زاهید و دنیانەویست، هۆکاری موسڵمانبوونی هۆزەکەی، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) شایەتی ڕاستگۆیی بۆ دەدا. |
| حەسسانی کوڕی پابت | پشتیوانی | پێش کۆچی پێغەمبەر | شاعیری تایبەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە خوای گەورە سەری دەخست |
| حەمزەی کوڕی عەبدولموطەلیب | کۆچەری | لە قۆناغی بانگەوازی ئاشکرا لە مەککە | مامی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، سەرکردەیەکی بەهێزی سەربازی، بەشداربووی بەدر و ئوحود و خاوەن نازناوی (سيد الشهداْ). |
| حەمنەی کچی جەحش | کۆچەری | پێش کۆچی حەبەشە | بەشداربووی کۆچی حەبەشە، بەشداربووی چەند غەزایەك، پەرستشێکی زۆر هەبوو بەتایبەت نوێژکردن لە مزگەوتەکەی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم). |

| هاوەڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) | دەستە | موسڵمانبوون | ڕۆڵ وپلەوپایە |
|---|---|---|---|
| حەنڤهلەی کوڕی ئەبی عامیر | پشتیوانی | پاش هیجرەت | کوڕی سەرکردەیەکی دووڕووەکان، زاوای سەرکردەی دووڕووەکان، هاوەڵی دڵسۆوی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، شەهیدی ناو غەزای ئوحود، خاوەنی نازناوی غەسیلوئمەلائیکە. |
| حوذەیفەی کوڕی یەمان | | پێش هیجرەت | نهێنی پارێز و هەواڵگری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، بەشداربووی غەزاکان. |
| خالیدی کوڕی زەید (ئەبوئەییوبی ئەنصاری) | پشتیوانی | پێش هیجرەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) | پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە کۆچی کرد بۆ مەدینە لەوێ مایەوە، بەشداربووی غەزاکان، پاسەوانی کاتیی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) |
| خالیدی کوڕی وەلید | کۆچەری | پاش ڕێککەوتنی حودەیبیە | بەشداربووی بەشێك لە غەزاکان، خاوەنی نازناوی (شمشێری خوا)، ئەمیری چەند سەریەیەك، سەرکردەیەکی بەهێزی سەربازیی. |

| هاوەڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) | دەستە | موسڵمانبوون | ڕۆڵ وپلەوپایە |
| --- | --- | --- | --- |
| خەبابی کوڕی ئەرەت | کۆچەری | دەستەی یەکەمی موسڵمانبوان | یەکێك بوو لەو حەوت کەسەی موسڵمانبوونی خۆیان ئاشکراکرد، ئازارچەشتن لەپێناو ئیسلامدا، بەشداربوون لە سەرجەم غەزاکاندا. |
| زەیدی کوڕی پابت | پشتیوانی | پێش هیجرەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) | نووسینەوەی وەحی، لەبەرکردن و خوێندنەوەی قورئان، بەشداریکردن لە زۆربەی غەزاکاندا. |
| زەیدی کوڕی حارثە | کۆچەری | یەکەم مەولا بوو موسڵمان بوو | مەولا و خۆشەویستی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، کەسێکی شیاو بە ئەمیرایەتی و سەرکردایەتی، شەهیدی ناو موئتە. |
| زەیدی کوڕی سەهل (ئەبووطەلحەی ئەنصاری) | پشتیوانی | پێش هیجرەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) | بەشداربووی عەقەبە، یەکێك لە دوانزە نەقیبەکە، بەشداربووی سەرجەم غەزاکان. |
| زوبەیری کوڕی عەووام | کۆچەری | دەستەی یەکەمی موسڵمانبوان | پوورزا و حەواری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، یەکەم کەس بوو لە پێناو خوادا شمشێری هەڵکرد، بەشداربووی غەزاکان. |

| هاوەڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) | دەستە | موسڵمانبوون | ڕۆڵ وپلەوپایە |
|---|---|---|---|
| زینیرەی ڕۆمی | کۆچەری | قۆناغی بانگەوازی نهێنی | ئافرەتێکی خۆڕاگر، بەرگەگرتنی ئازار و ئەشکەنجە لە پێناو ئیسلامدا |
| سەعدی کوڕی عوبادە | پشتیوانی | پێش هیجرەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) | بەشداربووی بەیعەتی عەقەبە، یەکێك لە دوانزە نەقیبەکە، ئەمیری مەدینە لە دەرچوونێکی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)، بەشداربووی غەزاکان. |
| سەعدی کوڕی موعاذ | پشتیوانی | پێش هیجرەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) | هۆکاری موسڵمانبوونی بەشێك لە پشتیوانان، بەشداربووی غەزاکان، دادوەر لە مەسەلەی بەنوقورەیظەدا. |
| سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص | کۆچەری | دەستەی یەکەمی موسڵمانبوان | یەکەم تیرهاوێژی ناو ئیسلام، بەشداربووی کۆچی مەدینە، بەشداربووی غەزاکان، موژدەپێدراوی بەهەشت. |
| سەلمانی فارسی | فارس | پاش کۆچی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) | هەواداری حەق، بەشداربووی غەزاکان، ڕاوێژکاری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) |

| هاوەڵی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) | دەستە | موسڵمانبوون | ڕۆڵ وپلەوپایە |
|---|---|---|---|
| طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵا | کۆچەری | دەستەی یەکەمی موسڵمانبوان | بەشداربووی غەزاکان، خاوەنی نازناوی شەهیدی زیندوو، موژەپێدراوی بەهەشت. |
| عامیری کوڕی عەبدوڵا (ئەبووعوبەیدەی کوڕی جەڕاح) | کۆچەری | دەستەی یەکەمی موسڵمانبوان | بەشداربووی هیجرەتی یەکەمی حەبەشە و هیجرەتی مەدینە، بەشداربووی غەزاکان، موژدەپێدراوی بەهەشت، خاوەنی نازناوی (ئەمینی ئوممەت). |
| عەبباسی کوڕی عەبدولموطەلیب | پێش کۆچ | پێش هیجرەت بە نهێنی موسڵمان بوو | مامی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، چاو و هەواڵگری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە مەککە، دڵنەوای موسڵمانانی مەککە پاش هیجرەت هەتا پێش فەتحی مەککە. |
| عەبدوڕەحمانی کوڕی صەخر (ئەبووهوڕەیرە) | کۆچەری | سەروبەندی فەتحی خەیبەر | یەکلابوونەوەی بۆ وەرگرتن و لەبەرکردنی فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ئەندامی ناو ئەهلی صوففە. |

| هاوەڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) | دەستە | موسڵمانبوون | ڕۆڵ وپلەوپایە |
|---|---|---|---|
| عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە | پشتیوانی | پێش هیجرەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) | بەشداربووی عەقەبە، یەکێك لە دوانزە نەقیبەکە، بەشداربووی غەزاکان، گوێڕایەڵیی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، بەشداربوو و شەهیدی ناو موئتە. |
| عەبدوڵای کوڕی سەلام | جوولەکە | پاش کۆچی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) | زانایەی گەورەی ناو بەنوئیسرائیل کە موسڵمان بوو و لەنێو جوولەکەکاندا شایەتی پێغەمبەربوونی پێغەمبەری خوای دەدا. |
| عەبدوڵای کوڕی عەبباس | | پێش هیجرەت بە نهێنی موسڵمان بوو | زانایەکی گەنجی نێو هاوەڵان، شارەزا لە تەفسیری قورئاندا، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نزای بۆ کردبوو خوا زانستی پێ ببەخشێت. |
| عەبدوڵای کوڕی عومەر | کۆچەری | پێش هیجرەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) | بەشداربووی هەندێك لە غەزاکان، زانایەکی گەنجی نێو هاوەڵان، فەرموودەیەکی زۆری لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) گێڕاوەتەوە. |

| هاوەڵی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) | دەستە | موسڵمانبوون | رۆڵ وپلەوپایە |
|---|---|---|---|
| عەبدوڵای کوڕی مەسعوود | کۆچەری | دەستەی یەکەمی موسڵمانبوان | یەکێك لەو حەوت کەسەی موسڵمانبوونی خۆیان ئاشکرا کرد، بەشداربووی هیجرەت و غەزاکان، زانایەکی گەنجی نێو هاوەڵان، خاوەن شارەزاییەکی زۆر لە قورئاندا، فەرموودەیەکی زۆری لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) گێڕاوەتەوە. |
| عەمری کوڕی عاص | کۆچەری | پاش رێککەوتنی حودەیبیە | سەرکردەیەکی دیاری سیاسی و سەربازیی، بەشداربووی بەشێك لە غەزاکان، نێردراوی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ لای سەرکردەکان. |
| موصعەبی کوڕی عومەیر | کۆچەری | دەستەی یەکەمی موسڵمانبوان | نێردراوی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ مەدینە بۆ ئەوەی شارەزایان بکات لە ئیسلامدا، بەشداربووی غەزای بەدر و شەهیدی ناوی غەزای ئوحود. |

| هاوەڵی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) | دەستە | موسڵمانبوون | ڕۆڵ وپلەوپایە |
|---|---|---|---|
| موعاذی کوڕی جەبەل | پشتیوانی | پێش هیجرەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) | بەشداربووی بەیعەتی عەقەبە، هۆکاری موسڵمانبوونی بەشێك لە پشتیوانان، بەشداربووی غەزاکان، نێردراوی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ یەمەن، شارەزاترین کەسی ئوممەت بە حەڵاڵ و حەرام. |
| موعاویەی کوڕی ئەبووسوفیان | پاش فەتحی مەککە | لە سەروبەندی فەتحی مەککەدا موسڵمان بوو | نووسەرەوەی وەحی، بەشداربووی غەزاکانی پاش فەتحی مەککە. |

# باسی چوارەم

## دووڕووەکان

دووڕووەکان ئەو کەسانەی سەردەمی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بوون کە بە رووکەش موسڵمانبوونی خۆیان راگەیاندبوو و لە ریزەوی گشتیدا لەگەڵ موسڵماناندا هەنگاویان دەنا، بەڵام لە نیەت و وردەکاری هەنگاوەکاندا پێچەوانەی موسڵمانان بوون، وردەکاری ناخ و بیرکردنەوەی بێباوەڕان لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەدا باسکراوە، مونافیقەکان لە ریزی هاوەڵانی پشتیوانان و جوولەکە موسڵمانبووەکان و موسڵمانبوانی پاش فەتحی مەککەدا خۆیان حەشار دابوو.

**لێرەدا چەند هێڵێکی گشتی بۆ سیفەت و رەفتاریان دەخەینەڕوو:**

**یەکەم: جیاوازی نیەت:** نیەتیان جیا بوو لە نیەتی موسڵمانان، لە سەرەتاوە تا کۆتا نیەت و ئاواتیشیان رووخانی موسڵمانان بوو.

**دووەم: گومان و گاڵتە:** بۆ سەرخستنی نیەتە شاراوەکەیان بنەمای گومان دروستکردن و گاڵتەکردنیان بەرامبەر بە پەیامەکەو پێشەوا و شوێنکەوتووەکانی دەگرتەبەر.

**سێیەم: پەرتکردن:** هەوڵیان دەدا نێوانی موسڵمانان پەرت بکەن، تەنانەت ئامادەبوون بۆ تێکدانی یەکڕیزی موسڵمانان مزگەوتیش دروست بکەن.

**چوارەم: پشتهەڵکردن:** بۆ هەر بوارێکی گرنگ لەگەڵ موسڵمانان چەند هەنگاوێك دەڕۆیشتن، لە نیوەی ڕێدا پشتیان هەڵدەکرد و دەستیان بەردەدا.

**پێنجەم: ناپاکی نهێنی:** تەنها بەو هەنگاوانەی پێشووشەوە نەدەوەستان، بەڵکو لە بوارە جیاجیاکاندا لەگەڵ دوژمندا دەستیان تێکەڵ دەکرد بۆ لێدانی موسڵمانان.

## هەڵوێستی موونافیقەکان لە غەزاکاندا:

**یەکەم:** لە سەرەتاوە گومان دروست کردن لەسەر ڕاستی و دروستی جەنگەکە وەك گومان خستنە سەر جەنگی تەبووك.

**دووەم:** لە نیوەی ڕێدا پاشەکشە کردن وەك لە ئوحوددا ڕوویدا.

**سێیەم:** لە گەرمەی ڕێدا وورەشکاندن وەك گاڵتەکردن بە ونبوونی وشترەکەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە غەزای تەبووکدا.

**چوارەم:** لە جەرگەی جەنگدا دەست تێکەڵ کردن لەگەڵ دوژمن وەك لە غەزای بەنونەضیر ڕوویدا.

**پێنجەم:** لە کاتی سەرکەوتندا هەوڵی شکاندنی سەرکەوتنەکە وەك بوهتانی ئیفك لە پاش مورەیسیع.

**شەشەم:** فرسەت هێنان بۆ لێدانی موسڵمانان وەك هەوڵی کوشتنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) پاش غەزای تەبووك.

## مامەڵەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و موسڵمانان لەگەڵیاندا:

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) مامەڵەیەکی تایبەتی لەگەڵ مونافیقەکاندا دەکرد و شێوازی ئەو مامەڵەکردنەش شۆڕبووبوویەوە بۆ نێو هاوەڵان:

**یەکەم:** قبووڵکردنی ئەندامێتییان لەنێو موسڵماناندا بێ ئەوەی هیچ پشتیان پێ ببەسترێت.

**دووەم:** بەشداری پێکردنیان لە گرنگترین پرس و رووداوەکاندا و لەبەرچاوگرتنی پێشوەختەی هەر ئەگەرێك.

**سێیەم:** پاراستنی خوێن و ناوبانگیان، هەم لە کوشتن پارێزراو بوون، هەم ناوەکانیان ئاشکرا نەدەکرا بۆ ئەوەی ناوبانگیان لەکەدار بکرێت.

## ئامانجی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەم هەڵسوکەوتە بریتی بوو لە:

**یەکەم:** پاراستنی ناوبانگی موسڵمانان نەبادا لە شوێنان بوترێت موحەممەد هاوەڵانی خۆی دەکوژێت.

**دووەم:** هەتا دووڕووەکان راستەوخۆ نەچنە نێو ریزی دوژمنەوەو هیوایەکیش بمێنێتەوە بۆ پەشیمان بوونەوەیان لەو هەڵوێستانەیان.

# باسی پێنجەم

## جوولەکەکان

جوولەکەکانی مەدینە بریتی بوون لە (بەنوقەینوقاع، بەنونەضیر، بەنوقورەیظە)، جگە لەوەش لە دووری مەدینە لە خەیبەر و فەدەکیش جوولەکەکان نیشتەجێ بوون، ئەمانە بە شێوەیەکی گشتی سەرقاڵی بواری ئابووری بوون و پشکی شێریان لەو بوارەدا بۆ خۆیان بردبوو، دەربڕینەکەی ئیبن عومەر بە جوانی ئەمە روون دەکاتەوە کاتێك دەڵێت (ما شبعنا حتى فتحنا خيبر)،[1] (تێری سکمان نانمان نەدەخوارد تا ئەو کاتەی خەیبەرمان فەتح کرد).

جوولەکەکان لەو ناوچانەدا جیتۆیان بەکاردەهێنا و جوگرافیای نیشتەجێبوون و تێکەڵی کۆمەڵایەتی و زمانی سەرەکی خۆیان دەپاراست، دەبینین هەرکام لەوانە لە قەڵایەکدا کۆدەبوونەوە، هاوسەرگیریی و ژن و ژنخوازی تەنها لەنێو خۆیاندا هەبوو، بازاڕی تایبەت بە خۆیان هەبوو، هەروەها زمانەکەی خۆیان هێندە بە بەهێزی هێشتبوویەوە کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) زەیدی کوڕی پابتی راسپارد خۆی فێری زمانەکەیان بکات بۆ ئەوەی لە نووسین و دەقەکانی لەگەڵ جوولەکەکاندا تێنەکەوێت.[2]

------------------------------

(١) صحيح البخاري، الرقم ٤٠١٣.

(٢) مسند احمد بن حنبل، الرقم ٢١٠٦٥، سنن أبي داود، الرقم ٣١٧٨، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٢٣٠ و صححه و وافقه الذهبي.

زۆرینەی جوولەکەکان هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی باوەڕیان نەهێنا بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ژمارەیەکی زۆر کەمیشیان موسڵمان بوون وەك عەبدوڵای کوڕی سەلام و زەیدی کوڕی سەعنە و صەفییەی هاوسەری پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، ژمارەیەکی کەمیشیان چوونە نێو ریزی مونافیقەکانەوە وەك سەعدی کوڕی حنیف و زەیدی کوڕی لصیت.

جوولەکەکان لەگەڵ هاتنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆ مەدینە، چوونە نێو پەیماننامەی مەدینەوەو تیایدا چەند مەرج و مافێکی جوولەکەکان دیاری کرا، بەڵام زۆری نەخایاند قۆناغ بە قۆناغ هەریەك لەو سیانە بە نۆرە پەیمانەکەیان شکاند، سەرەتا بە ناپاکی بچووك دەستیان پێکرد هەتا گەیشتنە ناپاکی گەورە، بەنوقەینوقاع بە شکاندنی شکۆی موسڵمانان و سووکایەتی کردن بە ئافرەتێکی موسڵمان دەستیانپێکرد و دەرکران،[١] بەنونەضیر هەوڵی تیرۆرکردنی پێغەمبەری خوایان دا[٢] کە سەرۆکی دەوڵەتی مەدینە بوو، ئەمانیش سزا دران و دەرکران،[٣] بەنوقورەیظەش لەگەرمەی هێرشی دوژمندا ناپاکییان نواند و لەگەڵ دوژمندا دەستیان تێکەڵ کرد بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی مەدینە، ئەمانیش سزا دران.

هەریەك لەمانە کە سزا دەدران روویاندەکردە خەیبەر و لەوێ خۆیان کۆدەکردەوەو لەگەڵ لایەنەکانی تردا دەستیان تێکەڵ دەکرد و سوپایان کۆدەکردەوە بۆ هێرش بردنە سەر مەدینە، بۆیە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بڕیاری دا ئەو بنکە سەرەکیەشیان نەهێڵێت و کۆتایی بە مەترسییان بهێنێت و بە فەتحی خەیبەر[٤] مەترسی جوولەکەی لە ناوچەکەدا نەهێشت، ئینجا بێ روودانی هیچ کوشتارێك رێککەوتنی لەگەڵ جوولەکەکانی فەدەکیش ئەنجامدا و هەمان مەرجەکانی خەیبەری لەسەر ئەوانیش دانا.[٥]

---

(١) ابن هشام: السيرة النبوية، ج٣، ص ٣١٤-٣١٥.

(٢) سنن أبي داود، الرقم ٢٦٢٦، صححه الألباني.

(٣) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ٤٤.

(٤) سنن أبي داود، الرقم ٢٦٢٨، حسن إسناده الألباني.

(٥) ابن كثير: البداية والنهاية، ج٤، ص ٢٣٠.

# باسی شەشەم

## ژیانی کۆمەڵایەتی
## لە کۆمەڵگەی مەدینەدا

لە کۆمەڵگەی مەدینە بە شێوەیەکی گشتی بەشداری کۆمەڵایەتی لە رەگەز و تەمەن و زمان و ئایینێکی دیاریکراودا بەرتەسك نەکرابوویەوە، بەڵکو بەشداریی کارای رەگەزی نێر و مێ، منداڵ و گەنج و گەورە، عەرەب و فارس و عیبریەکان، جوولەکە و مونافیق و موسڵمانەکان لە بواری کۆمەڵایەتیدا بەرچاو دەکەوێت.

هاتنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) سەرەتای چاکسازیەکی گەورەی کۆمەڵایەتی بوو، کاتێك دوژمنایەتی نێوان ئەوس و خەزرەجیەکانی گۆڕی بە برایەتی و خۆشەویستی، نامۆبوونی کۆچەری و پشتیوانانی گۆڕی بۆ برایەتی و گیرفانی هاوبەش، بەدەمەوەچوونی کۆمەڵایەتی بە پەرستش ناساند و هەر ئەگەرێکی بڵاوکردنەوەی رق و دووبەرەکیشی بە تاوان و سەرپێچی پێناسە کرد، ناوزڕاندنی هەر کەسێك ئەوپەڕی تاوان بوو و بە هیچ چەشنێ رێگەی پێ نەدەدرا، تەنانەت ئەو رێژە مونافیقەی لە مەدینەدا بوون، هەتا دوای وەفاتی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) تەنها جارێکیش بە رەسمی وشەی مونافیقیان بەرامبەر بەکارنەدەهات، بەڵکو تێکەڵی کۆمەڵایەتیش لەنێوانیاندا هەبوو، کچی سەرکردەی دووڕووەکان هاوسەری هاوەڵێکی موسڵمان و خۆشەویستی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بوو.

پەیوەندی ئەندامانی خێزان لەسەر بنەمای ڕێز و یەکترقبووڵ کردن و پشتگرتنی یەکدی ڕێکخرایەوە، حاشاکردن لە باوك و بنەماڵە بە تاوان ئەژمار کرا، دڵشکاندنی دایك و باوك بە تاوانی گەورە ناسێنرا با تەنانەت دایك و باوکەکە بێباوەڕیش بن، پاراستنی مافی منداڵ بە واجب دانرا و بۆ بچووکترین ناعەدالەتیی باوك و دایك بەرامبەر بە منداڵەکانیان بەڵێ نەدەکرا.

ئافرەت ڕێزێکی تایبەتی لە کۆمەڵگەدا بۆ دانرا، لە سەرەتای لەدایکبوونیەوە بە مایەی خێر پێناسە کرا، بەخێوکردنی لە منداڵیەوە هەتا گەورە بوون وەك هۆکارێکی سەرەکیی چوونە بەهەشت ناسێنرا، بۆ پڕۆسەی هاوسەرگیریش مافی تەواوی پێدرا سەرپشك بێت لە هەڵبژاردنی هاوبەشی ژیانیدا، کاتێکیش دەبوو بە دایك بە چاکترین و لەپێشینەترین کەس دانرا بۆ هەڵسوکەوت کردن لەگەڵی، دەرفەتی بەشداریکردنی ئابووریی و ئایینی و کۆمەڵایەتی و سەربازیش بە ئافرەتان درا، ناوزڕاندنی هەر ئافرەتێك سزای سەختی بەدواوە بوو، ئەمانە و دەیان وردەکاری تر کە هەمووی لە بازنەی نەهێشتنی ستەم لە ئافرەتان و زیادکردنی مافەکانیان خۆی دەبینیەوە.

لە سەرۆکی وڵاتەوە بۆ کەسێکی ئاسایی ڕێزی منداڵی دەگرت، ڕێزنەگرتنی منداڵ بە دەرچوون لە ریزی رەوشتی موسڵمان پێناسە دەکرا، تەنانەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەدەم خەم و خۆشی منداڵانەوە بوو، گەنجانیش گرنگیەکی زۆر تایبەتیان پێ دەدرا و لە کایەکانی ژیاندا زۆرترین پشکی بەشداریکردنیان پێ درا، گەنجان ئەرك و بەرپرسیارێتی گەورەیان پێ دەسپێردرا، هەوڵ دەدرا بەربەستەکانی بەردەم پێگەیشتن و پێشڕەوییان لاببرێن و دەستیان بگیرێت بۆ سەرکەوتن، هاوکات ئەرکی گەورەشیان پێ دەسپێردرا و فێرکرابوون دەبێت خەمی دوو توێژی منداڵانی خواروو خۆیان و بەتەمەنانی سەروو خۆیان بخۆن، کەسانی بە تەمەنیش هێندە ڕێزدار کران کە هەرکەس ڕێزیان نەگرێت بە دەرچوو لە ریزیی موسڵمانان هەژمار دەکرا.

ڕێزگرتن و خزمەتکردنی خاوەن پێداویستیە تایبەتەکانیش بە هەمان شێوە بە واجبێکی شەرعی دانرا و ئەرکیان لەسەر کەمکرایەوەو مافیان زیاد کرا، کەنار نەخران و لە کایە گرنگەکانی ژیاندا بەشدارییان پێ کرا، دڵنەواییەکی زۆری ئەم توێژە دەکرا و هیوایان پێ دەبەخشرا کە لای خوا پاداشتی گەورەیان بۆ دانراوە.

# باسی حەوتەم

## ژیانی ئابووریی لە کۆمەڵگەی مەدینەدا

بە شێوەیەکی گشتی سەرچاوە داراییەکانی موسڵمانان لە مەدینەدا بریتی بوون لە کشتوکاڵ و بازرگانی و بەخێوکردنی مەڕو ماڵات و راوچێتی و پیشەگەری و دەستکەوتەکانی غەزاکان، هەرچی مونافیقەکانیش بوون لە هەموو ئەم سەرچاوانەدا هاوبەش بوون، بەڵام جوولەکەکان لە دەستکەوتەکانی جەنگدا هاوبەش نەبوون چونکە لە هیچ جەنگ و غەزایەکدا بۆ بەرگری لە شاری مەدینە بەشدارییان نەکرد.

ژیانی ئابووریی موسڵمانان لە سەرەتادا زۆر سەخت بوو، برسێتی و نەبوونی کۆچەران و لێشاوی هاتنی ئەو هەموو کۆچەریە و دابەشکردنی داهاتی پشتیوانان لەگەڵ برا کۆچەریەکانیان وایکرد پشتیوانانیش وەك کۆچەریەکان هەژاری و برسێتییان تووش بێت، بەڵام جوولەکەکان کە پێشتریش زۆر خۆیان بە بوارە سیاسی و کارگێڕیەکەوە سەرقاڵ نەکردبوو و خۆیان یەکلاکردبوویەوە بۆ بواری ئابووریی، تا رادەیەکی زۆر دەستیان گرتبوو بەسەر ئابووریی شارەکە و دەوروبەریدا، هەرچەندە جوولەکەکان لە مەیدانە ئابووریەکەدا زۆر بەهێز بوون، بەڵام نەشارەزایی سیاسییان وایکرد خۆیان تووشی جەنگ و ئاوارەبوون بکەن و بەشێکی زۆری ئەو داهاتەی کۆیان کردبوویەوە ببێت بە دەستکەوت بۆ موسڵمانان و بەهۆیەوە بووژانەوەیەکی بەهێزی ئابووریی روویکردە موسڵمانان و خاڵی وەرچەرخانی ئابووریی بوو بۆیان.

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەو تەشریعاتەوە کە بۆی دابەزیبوو، چاکسازیی گەورەی لە بواری ئابووریدا راگەیاند، هەریەك لە بنەماکانی صەدەقە و زەکات و سزای ماددی بڕێك سەرپێچی و تاوان، چەند هۆکارێك بوون بۆ کەمکردنەوەی باری سەرشانی هەژاران و راهێنانی دەوڵەمەندان بەوەی قۆرخی بوارە ئابووریەکە نەکەن.

دواتر پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەوڵیدا مۆدێلی مشەخۆری نەهێڵێت و ئیشکردنی رەوای وەك پەرستش ناساند، دەستی بەخشەری بە چاکتر لە دەستی وەرگر پێناسە کرد، سواڵکردنی لە چەند حاڵەتێکی زۆر پێویست و تایبەتدا سنووردار کرد، سزای سەختی بۆ مەسەلەی دزیکردن راگەیاند، فرو فێڵی ئابووریی بە هۆکاری چوونەدۆزەخی ئەنجامدەرەکەی دانا، هەموانی لەسەر ئەوە راهێنا، ئەگەر توانییان لە چاودێری جەماوەر و دەسەڵات دەرباز بن بۆ ئەنجامدانی تاوانێك، ئەوە ناتوانن لە چاودێری خوا دەرباز بن، ئەم حاڵەتە زۆر حاڵەتی گەندەڵیی ئابووریی بە کەمترین ماوە و تێچوو چارەسەر کرد.

**واتە بە شێوەیەکی گشتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە مەیدانی ئابووریدا چەند هەنگاوێکی نا، لەوانە:**

**یەکەم:** هەوڵدان بۆ وەرگرتنەوەی جڵەوی ئابووریی لە دەست جوولەکەکان.

**دووەم:** دارشتنەوەی سیستمی ئابووریی بەو چەشنەی بە وەحی بۆی دادەبەزی.

**سێیەم:** برەودان بە جووڵەی ئابووریی و نەهێشتنی دەستی تەمبەڵی.

**چوارەم:** چارەسەرکردنی گرفتە ئابوورییەکان و زیادکردنی سەرچاوە داراییەکان.

**پێنجەم:** کەمکردنەوەی جیاوازی چینایەتی لە رووی ئابووریەوە.

**شەشەم:** چەسپاندنی چاودێری خوایی لە سەروو چاودێری جەماوەر و دەسەڵاتەوە.

**حەوتەم:** سزادانی سەرپێچیکارانی بواری ئابووریی بەتایبەت دزەکان.

# باسی هەشتەم

## واجب بوونی پەرستشەکان

**نــــوێــژ:** لە مەککە و لە قۆناغی بانگەوازی نهێنیدا نوێژکردن فەرز بوو، بەڵام لە شەو و ڕۆژێکدا دوو جار بوو، پێش خۆرهەڵاتن و پێش خۆرئاوابوون،[١] ماوەیەکیش شەونوێژ تیایدا واجب بوو، پاش ماوەیەك شەونوێژ بوو بە سوننەت،[٢] لە شەوی ئیسرائدا خوای گەورە پێنج نوێژی فەرز کرد لەسەر موسڵمانان.[٣]

قیبلەی موسڵمانان لە قۆناغی مەککەدا بەیتولمەقدیس بوو، لە مەدینەش ماوەی شانزە یان حەڤدە مانگ بەردەوام بوو، ئینجا خوای گەورە قیبلەی گۆڕی رووەو مەسجیدولحەرام،[٤] وەك لە قورئاندا هاتووە:

﴿ قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِ ۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا ۚ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ ﴿١٤٤﴾ ﴾[٥]

---

(١) تفسير ابن كثير، ج٤، ص ٢٣٠.

(٢) صحيح مسلم، الرقم ١٢٧١، صحيح ابن خزيمة، الرقم ١٠٥٧.

(٣) تفسير ابن كثير، ج٤، ص ٢٣٠.

(٤) صحيح البخاري، الرقم ٤٢٢٥، صحيح مسلم، الرقم ٨٥٠.

(٥) البقرة: ١٤٤.

(بێ شك دیتمانی ئەی پێغەمبەر! کە بەرەو ئاسمان چاو دەگێڕیی ودەڕوانییی، دەسا دڵنیابە، ڕووت بەرەو رووگەیەك وەردەگێڕین کە خۆت پێتخۆشە، جا تۆش رووت بەرەو (مزگەوت)ی (حرام) وەرگێڕە).

لە ساڵی دووەمی کۆچیشەوە نوێژی جەژنی رەمەزان و جەژنی قوربان و قوربانی کردن ئەنجام درا.[١]

**رۆژوو:** سەرەتای رۆژووگرتن لە مەککەدا بریتی بوو لە رۆژووگرتنی رۆژی عاشوورا،[٢] ئینجا لە مانگی شەعبانی ساڵی دووەمی کۆچی و لە مەدینە رۆژووی رەمەزان فەرز بوو،[٣] سەرەتا رۆژووگر سەرپشك دەکرا فیدیە بدات یان رۆژوو بگرێت، دواتر رۆژووی رەمەزان واجب کرا، خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ أَيَّامٗا مَّعۡدُودَٰتٖۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٖ فَعِدَّةٞ مِّنۡ أَيَّامٍ أُخَرَۚ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدۡيَةٞ طَعَامُ مِسۡكِينٖۖ فَمَن تَطَوَّعَ خَيۡرٗا فَهُوَ خَيۡرٞ لَّهُۥۚ وَأَن تَصُومُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿١٨٤﴾ شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ هُدٗى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٖ مِّنَ ٱلۡهُدَىٰ وَٱلۡفُرۡقَانِۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٖ فَعِدَّةٞ مِّنۡ أَيَّامٍ أُخَرَۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ وَلِتُكۡمِلُواْ ٱلۡعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمۡ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿١٨٥﴾ ﴾،[٤]

(ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! بزانن رۆژووی مانگی رەمەزانتان لەسەر نووسراوەو فەرز کراوەتە سەرتان هەر وەکو لەسەر ئەوانەی لە پێشتانەوە بوون

---

(١) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج١، ص ١٩١.

(٢) صحيح البخاري، الرقم ١٩١٥.

(٣) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج١، ص ١٩١.

(٤) البقرة: ١٨٣ - ١٨٥.

بڕیاردراو نووسرا بەڵکو بە تەقوا بن و، سنوورەکانی خوا بپارێزن چەند رۆژێکی ژمێرراوو دیاریکراوە، زۆر نیە ئینجا هەر کەسێکتان نەخۆش بوو، ئەگەر رۆژووی گرتبا نەخۆشیەکەی زیادی دەکرد، وە یان درەنگ چاك دەبوویەوە، وە یان زۆری بۆ دەهات و تەنگەتاو دەبوو، یان چووە سەفەر ئەوجا رۆژووەکەیان شکاند، وەیان هەر لە بنە رۆژەوە نەیانگرت، دەبێ لە رۆژانی تردا، چەند رۆژێ تر بە رۆژوو بنەوە و ئەو کەسانەش ناتوانن بە ئاسانی بەرۆژوو بنء، زۆر بەسەختی بۆیان دەگیرێ ئەوە پێویستە لە باتی هەر رۆژەی لە رۆژووەکە، خواردنی ژەمێ خۆراك، یا نرخەکەی بدەنە هەژارێ ئەگەر کەسێك بە پێخۆشبوونی خۆی خۆراکی زیاتریدا ئەوە بۆخۆی باشەو قازانجی بۆ خۆیەتیی، خۆ لەگەڵ ئەوەشدا، ئەر بەرۆژوو بن گەلێ چاکترە بۆتان ئەگەر بتانزانییباو بتوانن مانگی رەمەزان، ئەو مانگەیە کە قورئانی تێدا نێردراوەتە خوارێ رێنمایی مەردم دەکا بۆ گشت کارێکی چاك و چەندین بەڵگەو نیشانەی زۆر روونی تێدایە بۆ شارەزای رێی هەق و، جیاکردنەوەی راست و ناڕاست ئینجا هەرکەسێکتان مانگی رەمەزانی بەسەرهات دەبێ بەرۆژوو بێت ئینجا ئەو کەسەشتان نەخۆش و لەش بەبارە، یا لەسەفەرەو رێبوارەو، رۆژووەکەشی دەشکێنێ دەبێ لە رۆژانی دیکەدا، چەند رۆژێکی تر بەقەزا بگرێتەوە خوا ئاسوودەیی و کار ئاسانی ئێوەی دەوێ و نایەوێ بکەونە تەنگیی و ناڕەحەتیی و دەیەوێ بەئاسانی رۆژووی ئەو ماوە تەواو بکەن و بەگەورەیی خوا بزانن و قایل بن، کە ئێوەی رێنماکرد پێویستە سوپاسی بکەن).

**زەکـات:** یەکەمجار لە مانگی شەعبانی ساڵی دووەمی کۆچیدا زەکاتی سەرفیترە واجب بوو، دواتر زەکاتەکانی تریش واجب بوون،[١] پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هاوەڵانێکی تایبەت دەکرد بە کۆکردنەوەی زەکات لە ناوچەکاندا[٢] و دواتر بەو چەشنەی خوای گەورە بڕیاری لەسەر دابوو دابەش دەکرا.

---

(١) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج١، ص ١٩١.

(٢) صحيح مسلم، الرقم ١٨٤٩.

**حـــەج:** لە ساڵی نۆیەمی کۆچیدا حەج واجب بوو و پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەو ساڵە ئەبووبەکری صدیقی کرد بە سەرپەرشتیاری حەج،[1] ئینجا لە سالی دەی کۆچیدا خۆی حەجی بەجێگەیاند.[2]

خوای گەورە دەفەرمویێت: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ﴿٩٧﴾﴾،[3]

(خوا حەجی کەعبەی بڕیارداوە لەسەر مەردم، لەسەر ئەوەی توانای ڕێگای هەبێ).

جیهاد: پاش کۆچکردنی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بۆ مەدینە خوای گەورە مۆڵەتی جیهادی دا بە موسڵمانان و لەو بارەوە ئایەت دابەزی[4]:

﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾﴾،[5]

(بڕیارو مۆڵەتی تۆڵەکردنەوە دراوە بەرامبەر بەو ئیماندارانەی شەڕیان بەسەردا سەپێنراوەو جەنگیان لەگەڵکراوە، بەڕاستی خواش بۆ کۆمەك و یارمەتیدانیان زۆر بەتواناو بەهێزە).

بەدەر لەمانە کۆمەڵێك پەرستشی تر وەك سوننەت دانران کە موسڵمانانی هاندەدران بۆ ئەنجامدانی بۆ ئەوەی هەمیشە کێبڕکێ لە کاری چاکەدا بکەن، ئەوەی زۆر تەمبەڵی نواند و بەشداری کێبڕکێی چاکەی نەکرد، لە کەمترین حاڵەتدا دەبوو چاکە بنەڕەتیەکانی لەدەست نەچێت کە فەڕزەکان بوون.

---

(١) ابن سعد: الطبقات الكبرى، ج٢، ص ١٦٨.

(٢) صحيح مسلم، الرقم ٢٢١٢.

(٣) آل عمران: ٩٧.

(٤) سنن الترمذي، الرقم ٣١٧٨ و قال حديث حسن، المستدرك على الصحيحين، الرقم ٢٣١٨ و صححه و وافقه الذهبي.

(٥) الحج: ٣٩.

هاوکات زنجیرەیەکی بەردەوامی قەدەغەکراوەکانیش هاوشان بە فەرز و سوننەتەکان ئاڕاستەی موسڵمانان دەکرا، وەك قەدەغەکردنی مەیخواردن و دزی و داوێنپیسی و کوشتنی بەناحەق و خۆدانەپۆشینی ئافرەتان و فێڵکردن لە کڕین و فرۆش و ..هتد.

## دەرەنجام

- پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) رەچەڵەك و ناوبانگێکی پاکی هەبوو و ماوەی چل ساڵ ئەزموون و شایەتی ناو کۆمەڵگەکەی وەك ئەستۆپاکیەك بەدەستەوە بوو.

- ماوەی پێش پێغەمبەرایەتی چەند وێستگەیەکی گرنگی تێدابوون کە هەریەك لەوانە پێشەکی و ئامادەکاریەك بوون بۆ پێغەمبەرایەتی بێ ئەوەی خودی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هەست بەم ئامادەکاریە بکات.

- پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە کات و شوێنێکی دیاریکراوی پێویستدا وەك پێغەمبەر نێردرا بۆ هەموو مرۆڤایەتی لە هەموو کاتێکدا، بۆیە پەیامەکەی بەپێی بارودۆخی سەردەمەکەی دانەڕێژرا، ئەمە هۆکارێکی سەرەکی ئەو هەموو دژایەتیە بوو کە بەرامبەری نیشان دەدرا.

- هەوڵی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە مەککەدا بنیادی بیروباوەڕیی بوو لە دڵەکاندا و دانانی بناغەیەکی پتەو بوو بۆ دەیان سەدە نەك تەنها بۆ قۆناغی مەدینە، قۆناغی ئامادەکاریەکەش سیانزە ساڵی خایاند.

- بێباوەڕان کۆگایەکی پڕ لە تۆمەتیان لە پێشینانیانەوە بۆ بەجێمابوو و سەرجەم ئەو تۆمەتانە و دەیان شێوازی دژایەتییان بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و پەیامەکەی و شوێنکەوتوانی بەکارهێنا.

- پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە قۆناغی مەدینەدا هەر لە سەرەتاوە بە بەهێزیی و ئەوپەڕی وردەکاری هەڵسوکەوتی نواند و پێشبینیەکی

زۆر وردی هەبوو لە هەنگاوەکانیدا، ئەم وردەکاریەی سەرەتا زۆر کێشەی داهاتووی بۆ یەکلاکردەوە.

- پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە ماوەی دەساڵدا بە ئامانجی دیاریکراو و لە کاتی جیاجیادا بە کەمترین کوشتار لە مەیدانی جیهاددا هێزە شاڵاوهێن و ناپاکاکەکانی شکاند و شکۆی دەوڵەتی ئیسلامیی پاراست.

- پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ نەتەوە جیاوازەکاندا پەیوەندی هەبووەو لەگەڵ هیچ نەتەوەیەك دژایەتی نەنواندووە هەتا ئەوان دەستپێشخەرییان نەکردبێت لە دوژمنایەتیدا.

- ژیانی شەخصیی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و بنەماڵەکەی هیچ جۆرە دەسەڵاتداریی و سەرمایەداریی و خۆشگوزەرانیی و پارێزبەندیەکی لێ بەدی ناکرێت.

## سەرچاوەکان

القرآن الكريم

ابن إسحاق: محمد بن إسحاق بن يسار المطلبي: (ت: ١٥١)

١- السيرة النبوية، تحقيق: سهيل زكار، الطبعة الأولى، دار الفكر (بيروت – ١٩٧٨).

الطيالسي: سليمان بن داود بن الجارود: (ت: ٢٠٤)

٢- مسند الطيالسي، برنامج الجامع للحديث النبوي.

ابن هشام: عبدالملك بن هشام بن أيوب الحميري: (ت: ٢١٣)

٣- السيرة النبوية، تحقيق: مصطفى السقا و آخرون، الطبعة الثانية، السنة ١٩٥٥.

ابن سعد: أبوعبدالله محمد بن سعد بن منيع الهاشمي: (ت: ٢٣٠)

٤- الطبقات الكبرى، تحقيق: محمد عبدالقادر عطا، الطبعة الأولى، دار الكتب العلمية (بيروت – ١٩٩٠).

ابن أبي شيبة: عبدالله بن محمد بن إبراهيم العبسي: (ت: ٢٣٥)

٥- مصنف ابن أبي شيبة، برنامج الجامع للحديث النبوي.

أحمد بن حنبل: أحمد بن محمد بن حنبل: (ت: ٢٤١)

٦- مسند أحمد بن حنبل، برنامج الجامع للحديث النبوي.

٧- فضائل الصحابة، برنامج الجامع للحديث النبوي.

البخاري: محمد ن إسماعيل بن إبراهيم الجعفي: (ت: ٢٥٦)

٨- صحيح البخاري، برنامج الجامع للحديث النبوي.

مسلم: مسلم بن الحجاج بن مسلم القشيري النيسابوري: (ت: ٢٦١)

٩- صحيح مسلم، برنامج الجامع للحديث النبوي.

ابن ماجة: محمد بن يزيد الربعي القزويني: (ت: ٢٧٣)

١٠- سنن ابن ماجة، برنامج الجامع للحديث النبوي.

أبوداود: سليمان بن الأشعث بن إسحاق الأزدي السجستاني: (٢٧٥)

١١- سنن أبوداود، برنامج الجامع للحديث النبوي.

الفاكهي: أبوعبدالله محمد بن إسحاق بن العباس المكي: (ت: ٢٧٥)

١٢- أخبار مكة في قديم الدهر و حديثه، تحقيق: د. عبدالملك عبدالله دهيش، الطبعة الثانية، در خضر (بيروت – ١٤١٤ هجرية).

الترمذي: أبو عيسى محمد بن عيسى بن سورة: (ت: ٢٧٩)

١٣- سنن الترمذي، برنامج الجامع للحديث النبوي.

١٤- الشمائل المحمدية، برنامج الجامع للحديث النبوي.

ابن أبي عاصم: أحمد بن عمرو بن الضحاك الشيباني: (ت: ٢٨٧)

١٥- الآحاد و المثاني، برنامج الجامع للحديث النبوي.

النسائي: أحمد بن شعيب بن علي بن سنان: (ت: ٣٠٣)

١٦- السنن الكبرى، برنامج الجامع للحديث النبوي.

الطبري: محمد بن جرير بن يزيد الآملي الطبري: (ت: ٣١٠)

١٧- تأريخ الأمم و الملوك، الطبعة الثانية، دار التراث، (بيروت - ١٣٨٧ هجرية).

ابن خزيمة: محمد بن إسحاق النيسابوري: (ت: ٣١١)

١٨- صحيح ابن خزيمة، برنامج الجامع للحديث النبوي.

ابن حبان: أبوحاتم محمد البستي: (ت: ٣٥٤)

١٩- صحيح ابن حبان، برنامج الجامع للحديث النبوي.

الطبراني: سليمان بن أحمد بن أيوب الشامي: (ت: ٣٦٠)

٢٠- المعجم الكبير، برنامج الجامع للحديث النبوي.

٢١- المعجم الصغير، برنامج الجامع للحديث النبوي.

الحاكم: أبوعبدالله محمد بن عبدالله بن محمد النيسابوري: (ت: ٤٠٥)

٢٢- المستدرك على الصحيحين، برنامج الجامع للحديث النبوي.

أبونعيم: أحمد بن عبدالله بن أحمد المهراني الأصبهاني: (ت: ٤٣٠)

٢٣- دلائل النبوة، برنامج الجامع للحديث النبوي.

٢٤- معرفة الصحابة، برنامج الجامع للحديث النبوي.

البيهقي: أحم بن الحسين بن علي: (ت: ٤٥٨)

٢٥- دلائل النبوة، برنامج الجامع للحديث النبوي.

٢٦- شعب الإيمان، برنامج الجامع للحديث النبوي.

٢٧- معرفة السنن و الآثار، برنامج الجامع للحديث النبوي.

ابن عبدالبر: يوسف بن عبدالله بن محمد: (ت: ٤٦٣)

٢٨- الإستيعاب في معرفة الأصحاب، تحقيق: علي محمد البجاوي، الطبعة الأولى، دار الجيل، (بيروت - ١٩٩٢).

ابن الأثير: أبوالحسن علي بن أبي الكرم محمد بن محمد الشيباني الجزري: (ت: ٦٣٠)

٢٩- أسد الغابة في معرفة الصحابة، دار الفكر، (بيروت - ١٩٨٩).

٣٠- الكامل في التأريخ، تحقيق: عمر عبدالسلام تدمري، الطبعة الأولى، دار الكتاب العربي (بيروت - ١٩٩٧).

النويري: أحمد بن عبدالوهاب بن محمد: (ت: ٧٣٣)

٣١- نهاية الإرب في فنون الأدب، الطبعة الأولى، دار الكتب و الوثائق القومية، (القاهرة — ١٤٢٣ هجرية).

الذهبي: محمد بن أحمد بن عثمان بن قايماز: (ت: ٧٤٨)

٣٢- تأريخ الإسلام، تحقيق: د. بشار عواد معروف، الطبعة الأولى، دار الغرب الإسلامي، سنة ٢٠٠٣.

٣٣- سير أعلام النبلاء، تحقيق: مجموعة من المحققين، الطبعة الثالثة، مؤسسة الرسالة، سنة ١٩٨٥.

ابن كثير: أبوالفداء إسماعيل بن عمر بن كثير القرشي: (ت: ٧٧٤)

٣٤- البداية والنهاية، تحقيق: علي شيري، الطبعة الاولى، دار إحياء التراث العربي، سنة ١٩٨٨.

٣٥- تفسير ابن كثير، تحقيق: سامي بن محمد سلامة، الطبعة الثانية، دار طيبة، سنة ١٩٩٩.

ابن قيم الجوزية: محمد بن أبي بكر بن أيوب: (ت: ٧٨١)

**٣٦-** زاد المعاد في هدي خير العباد، الطبعة السابعة والعشرون، مؤسسة الرسالة، (بيروت - ١٩٩٤).

ابن حجر العسقلاني: أحمد بن علي بن حجر: (ت: ٨٥٢)

**٣٧-** الإصابة في تمييز الصحابة، تحقيق: عادل أحمد و علي محمد معوض، الطبعة الاولى، دار الكتب العلمية، (بيروت — ١٤١٥ هجرية).

**٣٨-** فتح الباري شرح صحيح البخاري، دار المعرفة، (بيروت — ١٣٧٩ هجرية).

ابن النجار: محمد بن أحمد بن عبدالعزيز بن علي الفتوحي: (ت: ٩٧٢)

**٣٩-** الدرة الثمينة في أخبار المدينة، تحقيق: حسين محمد علي شكري، دار الأرقم بن أبي الأرقم.

## نـــاوەڕۆك